# دیوانی وەفایی



میرزا عەبدوڕڕەحیمی سابڵاخی

لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە و لە سەر نووسینی

موحەممەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)

| | |
|---|---|
| سرشناسه : | وفائي، عبدالرحيم، ۱۸۳۸؟ - ۱۸۹۹؟م. |
| عنوان و نام پدیدآور | دیوانی وفایی/ میرزا عەبدورڕەحیمی سابلاخی؛ کوکردنەوەی موحەممەدعەلی قەرەداغی؛ لیکولینەوە، لیکدانەوە و لەسەرنوویسی موحە ممەدسەعید نەجاری( ئاس) . |
| مشخصات نشر | سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۸۹. |
| مشخصات ظاهری | ٥٤٤ ص. |
| شابک | 9789649800974 |
| وضعیت فهرست نویسی: | فیپا |
| موضوع | شعر کردی -- قرن ۱۳ق. |
| موضوع | شعر فارسی -- قرن ۱۳ق. |
| شناسه افزوده | نجاری، محمدسعید، ۱۳۳۵ - |
| شناسه افزوده | قرەداغی، محمد علی، گردآورنده |
| رده بندی کنگره | PIR۳۲۵٦ /س۱۳۸۹۷٤۳ ۷و |
| رده بندی دیویی | ۸فا۹/۲۱ |
| شماره کتابشناسی ملی : | ۷٥۷۸۰۲۲ |

# دیوانی وەفایی

«میرزا عەبدورڕەحیمی سابڵاخی»

کۆکردنەوەی:

**موحەممەد عەلی قەرەداغی**

لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە و لەسەرنووسینی

**موحەممەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)**

پیاچوونەوە:

**عەتائوڵڵای حەواری نەسەب**

انتشارات کردستان

سنندج

انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنه ـ پاساژی عیززەتی ـ تەلەفوون ـ ٢٢٦٥٣٨٢

# دیوانی وەفایی


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | دیوانی وەفایی |
| ✓ کۆکردنەوە (جمع آوری): | موحەممەد عەلی قەرەداغی |
| ✓ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی (شرح و تحقیق): | موحەممەد سەعید نەجاری ئاسۆ |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ١٣٩٠ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ٣٠٠٠ دانە (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحە و قطع): | ٥٤٤ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی: ٨٥٠٠ تمەنە
شابک: ٤ ـ ٠٩٧ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨
ISBN: 978 -964 - 980 - 097 - 4

## وردەکاری شیعری وەفایی لەبەر تیشکی سێ ئەویندا

وەفـــایی! مـــن شـــەهێنـی قـۆڵی چـاوبازانـی شـاهان بـووم
ئەسیری دەستی گـوڵدەم، سـەرو بـاڵا، مـاه ڕوویـان بـووم
گەهێ بولبول، گەهێ تووتی، گەهێ مورغی غەزەلخوان بووم
بە ئوممێدی عەزیزێك ـ دوور لە چاوم ـ پیری کـەنعان بـووم
بە جارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چووا!

ئەگەر بمانەوێ شیعری شاعیرێك بخەینە ناو قۆپەنی هەڵسەنگاندن و ڕەخنەی ئەدەبییەوە، بێ ئینسافییە لە پێشدا هەل و مەرج و دەور و زەمان و زمانی سەردەمەکەی نەخەینە بەر عەینەکی تێڕوانینێکی بێلایەنەوە. بە قەولی «ئێدوارد براون»ی ئینگلیزی نووسەری مێژووی ئەدەبی فارسی، دەبێ لە کلاوڕۆژنەی شیعرەکانی خۆیەوە بڕوانینە ناو ماڵی شیعرەکانیەوە.

بۆ ئەم مەبەستە ئەگەڕێینەوە سەردەمی شاعیری وەفایی کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ناوەڕاستی سەدەی ١٣ی کۆچی مانگی، بەڵگە بۆ ئەم مێژووەش کارەساتەکەی شێخ عوبەیدیللای غەریبەکە لە نێوان نەوەدەکانی سەدەی ١٣ (١٢٩٩ ـ ١٢٩٠ ك.م) بوو. ئەو ساڵەی کە شێخیان بە دەس‌کیسی قەجەرییەکان و خەیانەتی عوسمانییەکان دوور خستەوە بۆ «تائیف و مەککە»، وەفایی شاعیرێکی تەواو عەییار و کامیلە کە ئاگری دەروونی بەم کارەساتە دێتە جۆش و ئەم غەزەلە بێوێنەیە دێنێتە بەرهەم کە یەکێ لە شاکارەکانی غەزەلی کوردییە:

**لە بـــاغان ئـاه و نـاڵیـن دێ، دەڵێن شـای نـێو گـوڵان ڕۆیـی**
**لە مـــەیخانان ســـەدای شـین دێ کـەوا پـیری مـوغان ڕۆیـی**
**دەڵێی دەوری قـــەمەر، ســـەیری فـــەلەك، مـــیزانـــی گـــۆڕاوە**
**کەواگوڵ زەرد بوو، سونبول تێك‌چوو، ڕەنگی ئەرغەوان ڕۆیی**
**سەحەر مـەستانە هـات بـولبول بـە شـادی بـۆ تـەوافـی گـوڵ**
**کە دی باغ بێ‌گوڵە، داغ بـوو، بـە سـەد نـاڵە و فـوغان ڕۆیـی**
**لەبـــەر چـــاوی جـــیهانبینم جـــیهان تـاریك بـوو نـەمزانـی**
**نە نووری چاوەکـانم چـوو، نـە خـورشیدی جـیهان ڕۆیـی؟**
**چ شـــینێکـــە؟ چ هـــاوارە لە نـــێو حـــەڵقـــەی مـــوریدانـدا؟**
**مەگەر خـواجـەی سـەمەرقەندی لە نـێو سـاحێب‌دڵان ڕۆیـی**
**خـرا بـوو خـانەقا بـێ شـێخ و شـەوقی تـالیبان سـەد حـەیف**
**چەمەن وێران بوو، نـەغمەی بـولبولان چـوو، بـاغەبان ڕۆیـی**
**بـــە نـاڵەی بـولبول و قـومری «وەفـایی» بـۆیـە هـەر دەگـریم**
**گـــوڵێکـــی ســـەرو بـــاڵام بـوو بـە تـاراجـی خـەزان ڕۆیـی**

ئەمە دیاردەی دووهەم تیشکی ئەوینی وەفاییە کە لەگەڵ خۆیدا نیمچە تیشکێکی نەتەواییەتیش بە دوایدا دێ و مەبەستی سەرەکی باسەکەی من ئەم ئەویننانەیە. لە پێشدا یەکەم تیشکی ئەوینی وەفایی، ئەوینی خاڵ و پەرچەمی شیرینێکی تەشی بە دەستە، کە بە تاڵی پەرچەمی وەك خەیاتە خاوی، تاڵ تاڵی هەودای خەیاڵی کاڵی وەفایی دەهۆنێتەوە و لە بۆتەی ئەوینێکی خودابیدا قاڵی دەکا، لە دێزەی خۆشەویستیدا شیعری دەکاتە ڕەببی ئەدەبێکی بێ‌خەوشی کوردی کە میسرەعێکی هەوێنی دیوانێ شیعر و لەسەر نووسینە. بە ئەوینی غەرامیدا دەبێتە بەردی بناغەیەکی پتەو بۆ سەبکی موکریان و دەبێتە یەکێ لەو سێ کوچکەی ئەدەبی، کە لەو سەردەمەدا پیرە «نالی» لە شارەزوور و قەڵەمە گراویەکەی و «مەولەوی» لە هەورامان و لەم موکریانەش ئەم «وەفایی»یە باوەفا بوو. شاعیرێکە ئەگەر "مەحبووب" هێندێ سایەی لەسەر دوور دەکەوێتەوە بە ناڵەیەکی شیعراوی هاوار دەکا:

**لەو ڕۆژە کە دوور بۆتەوە سایەت لەسەری من**
**سووتاوە لە تاوت هەموو جان و جگەری من**
**جەرگم هەموو لەتلەت بوو بە سێڵاوی سروشکم**
**چبکەم کە بە دەریا چووە لەعل و گوهەری من**

بەڵێ ئەوین، ئەم ئەلف و بێتکەی شیعری شەرق و غەرب، بە قەولی مەولانا: (این اسطرلاب اسرار خدایی) لە دڵی ناسکی ئەم شاعیرەی موکریان کوچکاورێ هەڵدەکاکە سۆز و گڕەکەی لە تەمەنی کامڵیدا، دەنگی خۆی دەگۆڕێ و جێی خۆی ئەدا بە مەعشووقێکی ئاسمانی بەرەو ئاسمانی بوون باڵ دەگرێتەوە و پڕ بە گەرووی شێوە غەزەلە داهێنراوەکەی مەولانا دەگۆڕێنێ:

**تا دڵ نەسووتێ دەم بەدەم، فانی نەبێ سەر تا قەدەم**
**پەروانە قەت ناگاتە شەم، «هذا طریق العاشقین»**
**تا چاو و دڵ خوێنبار نەکەی، قەتعی هەموو ئەغیار نەکەی**
**فیکری ویساڵی یار نەکەی، «هذا طریق العاشقین»**
**دیسا لەسەر عەهدی ئەلەست، جامێك لە جانان بگرە دەست**
**هەر تا ئەبەد مەخموور و مەست، «هذا طریق العاشقین»**
**چی وەك «وەفایی» بەندەیە؟ لەو باغی دڵ گوڵ خەندەیە؟**
**بەو جامە خزری زیندەیە؟ «هذا طریق العاشقین»**

ئالێرەوە ئیدی گڕ و تیشکی ئاسمانی، پەروانەکەی سابڵاخمان دەخاتە سەر باڵی هەڵپڕووزاوی شۆڵەی شەمی بێقەراری و مەجنونئاسا دەکەوێتە هەرد و سارای لەیلای ونبووی. تا لە پڕ لە داوێنی پڕ لە خۆشەویستی شێخی دنیا و دینی، شێخ عوبەیدیللای شەمزینی، خۆی دەبینێتەوە. تا بە خۆی دەزانێ سەرتا پاگڕێکە، کە شیعر بۆی بۆتە ئیمامی تەسبیحاتەکەی و هەر وشەیەك کە لە زاری دێتەدەر، بە سافی و پاکی و ڕەوانی دەڵێی گەوهەری فرمێسکی چاوی هەتیوە، کایە بە سەد گەوهەری حوققەی پاشاکان دەکا.

ئا ئەمەیە دووهەمین تیشکی ئەوینی عاسمانی و بیرێکی نوێ و زمانێکی شیعری تازە، کە وەفایی لەم گۆڕەپانەدا گرەوی خۆی دەباتەوە. لە نێو قاڵبە جۆراوجۆرەکانی سەردەم وەك مەسنەوی قەسیدە و موخەممەس و موستەزاد و... باری قورسی هەستەکەی دەخاتە سەر شانی بووکی شێوازی لە پێشتر و ئێستا واتە "غەزەل" بە فارسی و کوردی کە لە کوردییەکاندا دەگاتە ئەو هەوارە لە دوندی هونەردا کە مامۆستا هێمن گوتەنی: «کەم کەس هێندە هەڵکشاوە بۆ لووتکە».

ئەوەی لە پێشدا باسم کرد دەنگدانەوەی ئەوینێکی دیکەیە لە پاڵ ئەدەبی عیرفانییەکەیدا و ئەویش ئیمان و بڕواکەیەتی بە شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدیللا، کە وەکوو بوێژێ لە هەموو حاڵدا بە شیعری حاڵ لێهاتوو پێیدا هەڵدەڵێ و هیوای پێیەتی. بەڵام ئەم بەرەبەیانە هێندە ناخایەنێ کە بای خەزان دەکەوێتە شکۆفەی گوڵەڕەعناکەی، ئەو هەتاوەشی لێ دەگرێ و لەبەر مانگەشەوی پڕ لە تریفەی شەوگاری سابڵاخ پوولەکەی ئەستێرە ئەدووری بە سەر کاغەزی شینی ئاسمانی خەیاڵیدا و دەستەوداوێنی سروشت و جوانی وڵاتەکەی دەبێ تا سەرچاوەی پڕ لە ئاوی زولالی تەبعەکەی پێ ڕەوان کات. چ بکات دەستی بە کوێی دیکە دەگەیی تا پێیدا هەڵ بڵێ و لە شاعیری هەموو گەلێکیش دڵسۆزانەتر.

نازانم لێرەدا لە چییەوە بدوێم کە بتوانم باسی ئەو هەستە ناسکە بکەم کە لە کاتێکدا دەچێتە ناو گوڵزارێکی بەهاری لە بۆنی گوڵ و جریوەی بولبول مەست و بێهۆش دەکەوێ و بە چوار دەستان دەیهێننەوە بۆ ماڵ. ئاخر ئەو حاڵی دەبێ لە جریوەی بولبول و ناز و کریشمەی گوڵ، بۆیە هەرایان لێ دەکا:

**نەوید، ئەی عاشقانی دڵفگار، یار هاتە سەر خەندە**

**سەڵا، ئەی بولبولان دیسان، درەختی گوڵ بەری هێنا**

**مەگەر ڕێی کەوتە زولف و ڕووی حەبیبم بادی نەورۆزی؟**

**حەیاتێکی بە دونیا داوە بۆی گوڵعەنبەری هێنا**

ئێستا با بزانین ئەم عارفە خەیاڵ ناسکە لێزگەی شێوەکانی جۆراوجۆری خەیاڵی بە هەودای کام سیفات و وردەکاری شیعری هۆندووەتەوە کە دەڵێی بە شێوەی خۆڕسکی و زگماکی هەر ئاوا لەکلی دەروونی هاتوونەدەر. لێرەدا شایانی باسە ئەوەش بڵێم سڵسڵە و پلپلە و بەدیع و عەرووز و مەعان شتێکی جیاواز لە تەبعی ناسك و لەتیفە. کە ڕەنگە هی واهەبێ ئەمانە هەموو بزانێ بەڵام قەتی بۆ دەعەمەل نەیە. بەڵام بوێژی خەیاڵ ناسك بێ ئەوەی خۆی پێ ببەستێتەوە و بەو پەڕی تواناییدا لە کانی مێشکی زاخاودراویەوە سیفاتی شیعری لەگەڵ وشەکانی هەڵدەقوڵێن. ڕەنگە وەفایی خۆی قەتی بیر لەوە نەکردبێتەوە، کە لەم بەیتەدا ئەم چەند دەسکردە ئەدەبییە هەیە:

**خاڵی دەمتە یا مەگەسی حوققەیی شەککەر**

**یاخۆ حەبەشیزادە لە نێو ئابی بەقادا؟**

**ئەلف:** سنعەتی تەجاهولولعارف.

**ب:** تەشبیه ، واتە وێچواندنی خاڵ بە مەگەس وەجهە شەبەهی ڕەشی لەلایەك.

هەمیسان تەشبیهی خاڵ بە حەبەشیزادە، وەجهە شەبەهی ڕەشی، ئەمە لێرە خۆی دەبێتە تەشبیهی تەواو بە دوو وێنەوە.

**ج:** ئیستیعارە، حوققەی شەککەر ئیستیعارەی موسەڕڕەحەیە لە لێوەکانی یار.

**د:** تەلمیح، داستانی ئاوی بەقاکە هەم ئیستیعارەی موسەڕڕەحەیە لە دەمی یار هەم بە سیلەی چاوی دەڕوانێتە چیرۆکی ئەسکەندەر و ئاوی بەقا لە چاڵی تاریکستان.

١. وەفایی لەم شیعرەی خوارەوەشدا بە جوانی چوار سیفەتی شیعری دەگونجێنێ کە جگە لە ناسکی تەبع و ڕەوانی شیعرەکە هەر چواریان لەو تاقمە سیفاتە شیعرییانەن کە شاعیری بەدەسەڵاتی فارس و کورد و عەرەب زۆریان کەڵك لێ وەرگرتووە.

**هوا خود نافه میریزد، صبا مُشك خُتن بیزد**

**مەگەر دیسان بە دەم بادا حەبیبم پەرچەمی بادا**

**ئەلف:** سیفەتی "مولەممەع" یا دوو شێوە زمانی، بە دوو زمانی فارسی و کوردی.

**ب:** دەسکردی "حوسنی تەعلیل" یانی جوانی بەڵگە هێنانەوە. بۆیە سەبا بۆنی خۆشە و هەوا عەتراوییە ئەمە هی ئەوەیە یارکە وەختێ بای هاتووە زولفەکانی هۆندۆتەوە.

ج: جیناسی تەواو لە نێوان دوو وشەی بادا و بادا. بادای هەوەڵ یانی بە دەم باوە. بادای دووەم یانی هۆندیەوە، یان بای هەڵدا.

د: ئیستیعارە، پەرچەم ئیستیعارەی موسەڕڕەحەیە لە زولفی یار.

٢. چاوکەن لەم بەیتە جوانە کە دەسکردی "جیناسی شیبهە ئیشتیقاقی" تێدایە:

**بە خۆڕایی نییە سووتاوی ڕووتـە عـاشقی شـەیدا**

**لە ڕووتی دیوە جیلوەی ئاتەشی «سینا» لە سینەیدا**

کە بێجگە لە هەموو وردەکارییەکی وەك تـەلمیح و حـوسنی تـەلمیح، ئـەم شـیعرەی مەولەوی دەخاتە خەیاڵی ئینسانەوە:

**عشق جان طـور آمـد عـاشقا　　　　طور مست و خَرَّ موسیٰ صَعقا**

٣. لەم بەیتەشدا دەتوانم بڵێم یەکێ لە جوانترین "موراعاتی نەزیر"ی هـێنـاوەتەوە کـە بێ ترس دەڵێم لە شیعری کلاسیکی فارسیشدا وێنەی کەمە. پێویستە بڵێم موراعاتی نەزیر ئەو دەسکردەیە کە شاعیر چەن بابەتی وەك یەك لە مەبەستێکدا دێنێ. گوێ بگرن:

**لە مەیخانەی چەمەن بەزم و تەرەبیان گرت قەدەحنۆشان**

**شەقایق بادە، زەنـبەق شـیشە، نـێرگس سـاغەری هـێنـا**

٤. ڕەمز و ئیستیلاحاتی عـیرفانی کـە لە سـەبکی «عـەراقـی»دا بـاو بـوو و لە فـارسیدا «سەنایی» و «مەولەوی» و «عەراقی» و «حافز» هێنایانە ناو ئەدەبیاتەوە. واتە ئەو وشە و دەستەواژانە کە ڕاستەوخۆ نیشانەی دڵداری مەجازییە، کەچی شاعیر مەنزووری پێی پیر و مورادەکەیەتی. بڕوانە ئەم شیعرە:

**شەهیدی تیغی ئەبرۆتم بە جەزبەی خاڵەکەی چـاوت**

**مـەقامم قـابەقەوسەینە لە سـایەی پـیری مـەیخانە**

**هەموو عالەم بـە دیـدارێکـی تـۆ قـوربانی ئـەبرۆتـن**

**مەگەر تاقی برۆت، قوربان، هـیلالی عـیدی قـوربانە؟**

**عیبادەتخانە بەرهەم بوو بە نەشئەی قیبلەکەی ئەبرۆت**

**لە سایەی چاوەکانتماڵی کـەعبەش بـۆتـە مـەیخانە**

ئەگەر سەرسەری لەم شیعرە بڕوانی دەڵێی مەعشووق لێرەدا بە تەواوی مەجازی و عەرزییە و ئەم وشانەش: برۆ، خاڵ، پیری مەیخانە، قوربان، نەشئە، مەیخانە، بە تەواوی مەجازین کەچی دەگاتە ئەم بەیتە:

**ئەمن وا لێرەکە و ڕۆحم لە خاکی پاکی بەتحادا**

**حەیاتم بێنەوە، ڕابرە بەو باغ و گوڵستانە**

لێرەدا دەردەکەوێ کە ئەم دەردە هیجرانە، دەردی پیری موغانی عیرفانە، نە گۆشەی چاوی چاوجوانێکی مەجازی و پیاڵەی شەرابی مەیخانە.

٥. ئەگەر بمەوێ لە سەر وردەکارییەکانی وەفایی بکۆڵمەوە هەم قسەکان بەرەو درێژدادڕی دەکێشرێن و هەم لە دەستیشم نایە، ئەگەر لە خۆشم ڕابینم ئەم بەیتەی حافز وەخۆم دێنێتەوە:

**خیال حوصلەی بحر می‌پزد هیهات!**

**چەهاست در سر این قطرەی محال اندیش**

جاکەوا بوو بەم دوو بەیتە و بە تێبینییەك کۆتایی بە قسەکانم دێنم و لێکدانەوەی شەرح و وردەکارییەکانیشی دەخەمە ئەستۆی خوێنەرانی خۆشەویست:

**تاقی پەیوەستی برۆت وا بوو بە قیبلەی خاس و عام**

**کەعبە گەر بۆ خۆی بزانێ پشتی میحرابی شکا**

**کەس نییە لەو نوکتە حاڵیم کا «وەفایی!» دڵبەرم**

**خۆی دەمی هێنا، ئەمن گەستم، دڵی بابی شکا!**

**تێبینی:** دیوانی وەفایی (وەك ئەزانن) دوو بەشە: بەشی کوردی و بەشی فارسی، جا من هاتم ئەم دیوانەم وەك دیوانی گەورە شاعیرانی فارس‌زمان ڕێکخست و تەرتیبم بۆ دانا و ڕەوتەکەی جەنابی مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغیم نەگرتەبەر، کە تەرتیبەکەی من بەم شێوەیە:

دوای پێشەکییەکەم بەشی غەزەلەکوردییەکان (کە ١٢٢ غەزەلە) بە ژمارە لەسەر تەرتیبی ئەلفوبێ دێت. پاش تەواوبوونی غەزەلەکان سەرەی پێنج خشتەکییەکانە (کە ئەوانیش ٩ دانەن) و پاشان هەندێك شیعری‌تر هەن کە سەرجەم بەندێکم بە ناو «پرژ و بڵاو» بۆ دانان، دوا بە دوای ئەمانە و کورتە پاشبەندێك، ئەنجا سەرەی شیعرە فارسییەکانی وەفایین کە بە نێوی «شەهد و شەکەر» دەناسرێن و بریتین لە (٧٦) غەزەل و یەك مەسنەوی (کە ١٢٩ بەیتە) و (٦) قەسیدە و (٤) موخەمەس و دوو تەك بەتی، کە ئەوانیشم هەروەك کوردییەکان داچنیون و ڕێکم خستوون، بەو هیوایەی جێی ڕەزامەندی هەموولایەك بێت.

موحەممەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)

بۆکان، ١٣٨٨

[١][1]

گەردشی چاوت قەراری عاشقی میسکین دەبا
ساحیری چاوبەستە، ئاریّ، دڵ دەکێشیّ دین دەبا![2]

قیبلەکەم بەو زاری هەر وەك غونچە بۆیە پێکەنی
تا بڵێن خەندیّ لە گوڵ بیّ ئابڕووی پەروین دەبا[3]

من کوتم: گرتی حەبەش کەعبەی جەماڵت؟ ئەو دەڵیّ:
کاروانی میشکە بۆ شاریّ گوڵ و نەسرین دەبا[4]

گەر ببینیّ تاقی پەیوەستی بڕۆت فەرهادی چین
ڕۆحی شیرینی بە قوربانی، بە سەد ناڵین دەبا[5]

---

[١]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی، موسەممەنی مەحزووف.
ڕەدیف: دەبا. وشەی قافیە میسکین، دین، و...

(٢) ساحیر: جادووگەر. چاوبەست: فریودەر، مرۆڤ خەڵەتێن.
واتە: چاوەکانت کە هەڵدەسووڕێنی عاشقی فەقیر قەراری لەلا نامێنیّ، ئەو چاوانەت وەك سیحربازێکی مرۆڤ خەڵەتێنن دڵ و دین دەڕفێنن و دەکێشن.
تەشبیهی موزمەری چاو بە ساحیر و چاوبەست.

(٣) واتە: یارەکەم کە وەك قیبلەمە بۆیە دەمی وەك غونچەی پێکەنی تا خەڵك بڵێن پێکەنینی زاری وەك گوڵ ئابڕوو بە گوڵی نەسرینەوە نایەڵیّ.
ڕازە (ئارایە)ی حوسنی تەعلیل هەیە.

(٤) حەبەش: ڕەش‌پێس، ئیستیعارە لە زولفی یارە. کەعبەی جەماڵ: ئیزافەی تەشبیهییە واتە: ڕوخسار.
واتە: من دەڵێم کە زولفت هاتە سەر ڕوخسارت وەك ئەوە وایە لەشکری پاشای حەبەشە کابەی ڕوخسارتی داگیر گردبیّ، ئەو دەڵیّ: نا نا، ئەوە کاروانی میشك و عەنبەرە دەچیّ بۆ شار وگوڵ و نەسرین دەبا.
تەلمیحە بە داستانی نەجاشی (ئەبرەهە) و هێرشی بۆ سەرکابە لە «عام الفیل»دا.

(٥) واتە: ئەگەر فەرهادی چین تاقی ئەبرۆی تۆ ببینیّ، ڕۆحی شیرینی خۆی، یان یارەکەی

پێچ و تاوی زولفی خاو و ڕەمز و غەمزەی سیحری چاو
ئەو لە لایێ ڕۆح دەکێشێ ئەم لە لایێ دین دەبا(٦)
نەشتەری چاوی حەبیبم دێ بە سینەمدا دەچێ
مەرهەمی نازی تەبیبم بۆ دڵی خوێنین دەبا(٧)
من وەها مەستی گوڵەندامم کە نازانم ئەبەد
هۆشی من دوگمەی تەڵا، یا ساعیدی سیمین دەبا؟(٨)
تا «وەفایی» لەو دەرە بێت و بچێ مەنعی مەکە
سورمەیی خاکی دەرت بۆ چاوی پڕ ئەسرین دەبا(٩)

---

☞

فیدای برۆت دەکا بە سەدناڵەوە.

ڕازە (ئارایە)ی «ئیهام» لە وشەی «شیرین»دا هەیە. وە لە نێوان تاق و فەرهاد و شیریندا تەناسوب و تەلمیح هەیە.

(٦) واتە: پێچ و تاوی زولفت ڕۆح جەزب دەکا و دەیکێشێ، و ڕەمزی سیحری چاوت دین دەبا بۆ خۆی.

لەف و نەشری مورەتتەبی تێدایە.

(٧) واتە: کاتێ کە مژۆڵی یارم وەك نەشتەر بە دڵمدا ڕۆ دەچێ، ئەو نەشتەرە وەك مەرهەمی نازی حەکیمە دەرمان بۆ دڵی زامدارم دەبا.

(٨) گوڵەندام: ئەندام وەك گوڵ، دەشکرێ ناوی مەعشووقی وەفایی بێ کە لە زۆر جێدا ناوی دەبا. ساعید: قۆڵ.

واتە: من وەها مەستی ئەو یارەم کە نازانم دوگمەی زێڕینی یارە هۆشم دەیبا، یان قۆڵە زیوینەکەی!.

(٩) واتە: ئەگەر وەفایی لەبەردەرگاتدا بێت و بچێ مەنعی مەکە ئەوە دەیەوێ لەبەر دەرکەکەت خاك و خۆڵ بۆ سورمە کۆکاتەوە تا چاوی پڕ فرمێسکی پێبرێژێ.

### [٢] [1]

سـەری کـوڵمت لە نـێو زولفـی سـیادا ئـیشارێکـە لە نـووری شـەوچرادا[2]
سجوودی بردە ئەبرۆت ڕۆژ لە سەر ڕوو شەوی دوێنـێ کـە تـۆ زولفت وەلادا[3]
ئەمن چاوم لە ڕۆژ وا پڕ لە خـوێن بـوو کە ئاوێنەی جەمالی خـۆی جـەلا دا[4]
شەو و ڕۆژ هەر لە فیکری زاری تـۆ دام بە هیچێ عـومری شـیرینم بـە بـا دا[5]
ئەرێ ڕۆحم بـە لێوی پـڕ لە خـەندەت ئەرێ هۆشم بە چـاوی سـورمەسا دا[6]

---

[٢]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن فعولن» بەحری ڕەمەلی موسەددەسی مەحزووف.
ڕەدیف: دا. وشەی قافیە: سیا، چرا، هوما و...
(٢) ئیشارە: دیاردە، عەلامەت.
واتە: کوڵمت هێندە ڕوونە لە نێو زوڵفتدا کە ڕەشە دەڵێی دیاردەیەکی نوورە لە چرای شەوگارەوە بریقەی دێ.
(٣) سجوود: سوژدە، کرنووش.
واتە: دوێشەو کە تۆ زوڵفت لادا ڕۆژ سوجدەی بردە بەر تاقی ئەبرۆت.
تەشبیهی تەفزیلی تێدایە، واتە: برۆت لە ڕۆژ جوانترە.
(٤) جەلا: سەیقەل، ساف کردن.
واتە: کاتێ ئەو، ڕوخساری وەك ئاوێنەی خۆی لووس و ساف دەکرد، دەتگوت چاوم لە ڕۆژ کردووە وا سوور و پڕ خوێن بووە.
تەشبیهی ڕوخساری یارە بە ڕۆژ.
(٥) زار: دەم. هیچ: کینایەیە لە دەمی یار واتە بچووکە.
واتە: شەو و ڕۆژ لە فیکری ئەو دەمە بچکۆلەی تۆدام کە لەبەر ئەو هیچە چکۆلە، عومری خۆمم سەرف کرد بە خۆڕایی.
وەفایی لەم ئیستیعارەیە ـواتە: «هیچ» بە مانای دەمی چکۆلەی یار ـزۆر کەڵکی وەرگرتووە.
(٦) ئەرێ: ئامرازی پرسین و پرسیارە واتە: ئایا؟.
واتە: ئەرێ ئایا من ڕۆحم داوە بە لێوی پڕ لە خەندەت یان هۆشم داوە بە چاوت کە سورمەی تێ ساویوە. دەشکرێ وشەی «ئەرێ» بە مانا «بەڵێ، ڕاستە»بێ و مانای بەیتەکە بەمجۆرە بێت:

لەبــەر تــاقی بــرۆت بــمرم چ نــابێ      کــە مــن شــابم لە بــن بــاڵی هــومادا[٧]
مــورادی ڕۆحـــمە بـــۆیــە «وەفــایی»!      بە دڵ ماچێ لە غـونچەی لێوی نـادا[٨]

[٣][١]

تابی سەری کوڵمت بوو کەوا زولفی بـە بـادا
یا ڕۆژی ویسالت شەوی هیجرانی وەلا دا؟[٢]
خاڵی دەمتە یا مەگەسی حوققەیی شـەککـەر
یـاخۆ حـەبەشیزادە لە نـێو ئـابی بـەقادا؟[٣]

---

بەڵێ من ڕۆحم داوە بە لێوی پڕ خەندەت، بەڵێ هۆشم داوە بە چاوی سورمەکێشراوت. واتە نە ڕۆحم ماوە و نە هۆشم.

(٧) هوما: باڵندەیەکی خەیاڵییە، دەڵێن سێبەری لە هەرکەس بکەوێ دەبێتە پادشا.

واتە: ئەگەر من لە تاقی برۆکانی تۆدا بمرم، یان لەبەری تاقی ئەبرۆت بـمرم هـیچ نـاقەومێ، چونکە ئەوکاتە وا بزانە من شاهێکم لە ژێر باڵی هومادا دەژیم.

(٨) موراد: مەبەست، قەسد و نییەت.

واتە: ئەی وەفایی! یار بۆیە ماچێکی بە قیمەتی دڵم لە لێوی خۆی ناداتێ. مەبەست و قەسدی ئەوەی هەیە کە ڕۆحمی لە قیمەتدا بدەمێ.

[٣]

(١) کێشی شیعر: «مفعولن مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەحزووفی مەکفووف. ڕەدیف: دا. واژەی قافیە: دا، لا، بەقا و...

(٢) واتە: ئەرێ ئەوە گەرما و تاوی سـەری کـوڵمت بـوو کـە زولفـی بـە بـا دای، یـان ڕۆژی پێکگەیشتن بوو کە شەوی دووری لابرد؟

ڕۆژی ویسال: ئیستیعارە لە ڕووی یـارە. شـەوی هـیجران: ئـیستیعارەیە لە زولفـی یـار. ڕازە (ئارایە)ی «تەجاهولولعاریف» هەیە.

(٣) حوققە: قوتوو، جەعبە. حەبەشیزادە: ڕەشپێست، ئیستیعارەیە لە خاڵی یار. ئابی بـەقا: ئاوی حەیات. ئیستیعارە لە دەمی یارە.

خوێنین جگەرن تالیبی ئـەو زارە دوو عـالەم
ئەو جەوهەرە بۆ هیچە بە دوو عالەمی نادا(٤)
هەر تارە کەوا مـەسکەنی بـاری دڵ و ڕۆحـە
سەد ڕۆحی بە با دا کە بە داو پەرچەمی بادا(٥)
بـازاڕی شکـا وەك دڵی زارم گـوڵ و نـافە
تا تای سەری زولفی کە بەسەر عاریزیدا دا(٦)
ئەو زارە کەوا هەر بە تەبەسسوم هـەیە حـاڵی
پـیرێکـە دەڵێ گـا لە بـەقا گـا لە فـەنادا(٧)

---

☞

واتە: ئەرێ ئەو خاڵەی لێوت مێشە بە دەوری قەندانی شەکرەوە، یان ڕەش‌پێستێکە لە نێوکانی ئاوی حەیاتێدایە؟.

(٤) هیچ: مەبەست دەمی یارە. جەوهەر: مادە، چکۆلەترین بەشی مادە کە دابەشکردن و تەجزییە هەڵناگرێ (جزء لا یتجزئ).

واتە: هەموو خواستارانی دوو دونیا جگەریان لە حەیبەت دەمی تۆ بـۆتـە خـوێن، زارت کـە جەوهەری فەردە، ڕاستە هیچ و نادیارە بەڵام هیچ و بێ‌قیمەت نییە! ئەوە نییە تۆ بە قیمەتی دوو جیهانی نادەی.

(٥) تار: تاڵی زولفی یار.

واتە: هەر تارێ لە زولفی یار جێگەی چەند دڵ و ڕۆحە، سەد ڕۆح بە با دەدا کاتێ پەرچەمی بهۆنێتەوە.

لە نێوان «با دا» و «بادا» جیناسی تام هەیە.

(٦) نافە: مادەیەکی بۆنخۆشە لە ناوکی ئاسکی چینی پەیدا دەبێ.

واتە: هەرکات یارم زولفی بە سەر ڕوخساریدا بدا ئەوەندە وڵات بۆنخۆش دەبێ بازاڕی نافە و عەترفرۆشی دەشکی وەك دڵی من و کەس لێیان ناپرسی.

(٧) پیر: عارف، خواناس، شێخ. بەقا و فەنا: مقاماتی عیرفانین.

واتە: دەمی یار کە هەر بەحاڵ پێدەکەنێ و دێتە جەزبە و حاڵەوە وەك عارفێ وایە جـارێ لە مەقامی فەنادایە و جارێ لە مەقامی بەقادایە.

لە نێوان پیر و حاڵ و فەنا و بەقادا تەناسوب هەیە.

حەیرەت‌زەدەیی نێرگس و ئەبرۆتە «وەفـایی»

کافر نییە وا مەست و لە میحرابی دوعـادا[٨]

•••••••━━●━━•••••••

[ ٤ ][١]

«بـــیا ای جـــان مـــن ســـاقی فـــدای ســـاغرت بـــادا»

ئەمان سـووتام ئـەمن جـامێ لە نـۆبـەی دەورە بـەملادا[٢]

«هـــوا خـــود نـــافه مـــی‌ریزد صـــبا مشك خـــتن بـــیزد»

مـەگـەر دیسـا بـە دەم بـادا حـەبیبم پـەرچـەمی بـادا[٣]؟

«گـــدا و بـــزم شـــاهان؟ مـــا و وصـــل دوســـتان، هـــیهات!»

لەبەر وەی ئارەقی کوڵمـی لە بـاتی مـەی بـە مـەی نـادا[٤]

---

(٨) واتە: وەفایی لەبەر چاو و برۆی تۆ سەرگەردانە، هیچ کافرێك هێندە لە میحرابی دوعادا ناگاتە وەفایی.

یان: وەفایی کافر نییە کە وا بە مەستی لە میحرابی دوعادایە، بەڵکوو چاوی مـەست و تـاقی ئەبرۆی وەك میحرابی تۆیە واگێژ و حەیرانی کردووە.

میحراب: تەشبیهە لە برۆی یار. نێرگس: ئیستیعارە لە چاوی یارە.

[ ٤ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.

ڕەدیف: دا. واژەی قافیە: لا، با، دا، مینا، و...

**تێبینی**: ئەم پارچە شیعرە «مولەممەع»ە واتە: بە دوو زمانی فارسی و کوردی وتراوە.

(٢) ساغر: پیاڵەی شەراب. لە نۆرەی دەورە بەملا: خاریج لە نۆبە، لە نۆرە بەدەر.

واتە: ئەی ساقی وەرە گیانی من فیدای پیاڵەی شەرابەکەت بێ، وەرە ئـامان لە نـۆرە بـەدەر پیاڵەیەك بۆ من تێکە ئاورم گرت.

(٣) واتە: ئەوە یاری خۆشەویستی منە زولفی بە با داوە و هۆنیوەیەتەوە وا هەوا بۆنی خۆشە و بای سەبا موشکی بۆنخۆشی خوتەنی لەبەرچاو کەوتووە.

(٤) گدا و وصل شاهان: لە فارسیدا بەم «و» دەڵێن واوی ئیستیبعاد، یانی پێش و پاشی ئـەو

«پــریشان کــرد چــون بــر چــهره دو زلف عــنبرین گــفتی:»

بــەهارێك ســونبولی تــاتای بــە بــاریٚ یــاسەمەندا دا(٥)

«عــرق بــر گــردن ، خــط بــر عــذار و خــنده در لعــلش»

دەڵێی شەککەر لەمەڕ عــەنبەر لەگــەڵ ئــارەق لە مــینادا(٦)

«بــە چشــم اشکــبارم عکس روی و مــوی جــانان بــین»

شەو و ڕۆژ ڕۆژ و شەو هەردوو لە نێو عەقدی سورەییادا(٧)

«بــهای بــوسەی نــاکــرده جــان بــاشد بــە چشــم اما»

دەمت وا بێنە ـ چاوم ـ قــەد بــووە گــەوهەر لە دەریــادا؟!(٨)

---

☞

واوە دوو شتی لەیەك دوورن، واتە: دوورە کە سواڵکەر بە وەسڵی شاهی بگات. هیهات: ئامرازی سەرسوڕمانە واتە: شتیوا هەر نابێ.

واتە: یار ئارەقی کوڵمی لە باتی شەراب بە ئێمە نادا؛ چونکە وەك دووری نێوان سواڵکەر و شاه و ئێمە و وەسڵی یار وایە.

جیناسی تام لە نێوان «مەی» بە مانا شەراب و «مەی» بە مانا ئێمە هەیە.

(٥) واتە: کاتێ یار زولفی وەك عەنبەری بە ڕوخساریدا پەرێشان کرد، کۆشێ سونبول و یاسەمەنی بە ڕوخساریدا دا.

(٦) واتە: ئارەقی سەر ملی یار و خەتی ڕوخسار و پێکەنینی کوڵمی، دەڵێی شەکرە لەگەڵ عەنبەر و ئارەق و شەرابە لە شووشەدا.

(٧) عەقدی سورەییا: کۆمەڵە کۆ و تەرازوو، ریزە ئەستێرەی سورەییا کە وەك ملوانکە وان، مەبەست ریزی فرمێسکە.

واتە: لە چاوی پڕ فرمێسکم وێنەی ڕوخسار و ڕووی یار شەو و ڕۆژ ببینە، کە ڕۆژ و شەو (زلف و ڕوو) لە نێو فرمێسکەکانمدا کە وەك کۆمەڵە ئەستێرەی کۆ و تەرازوون، دیارن.

(٨) واتە: قیمەتی ماچێکی نەکراوت ڕۆحە، بەچاوان؛ بەڵام دەمت بێنە گەوهەر لە دەریادا حەیفە بمێنێتەوە. یان: کوا گەوهەر لە نێو دەریادا سەوداکراوە؟ پەندێکی کوردییە، واتە: با من دەمت ماچ بکەم ئەوسا ڕۆحت دەدەمێ.

«فــــغان و گـــــریەی دل از غـــــم روی تــــو در زلفت»
دەڵێی بۆ گوڵ دەنـاڵێ شـەو لە نـێو بـولبول لە سـەحرادا[٩]
««وفــایی»! تــا مــنم گــریان و ســوزان در پــی یـارم»
تــەمەننام هــەر لە یــارە گــەر بـە ئـاو و ئـاورمدا دا[١٠]

[٥][١]

هەرچی لە سەر تۆ گەڕا شاد بوو بە دەوڵەتـی ڕووت
زولفــی شکســتە بـۆیـێ دەسـتی لە دامـەنت دا[٢]
سەد ڕۆح ئەگەر فیدا کەم ناگـەمە بـەخەتی خـاڵت
من نائومێد و مـەحرووم هـیندوو لە گـوڵشـەنتدا[٣]

---

(٩) واتە: گریانی دڵ لە غەمی تۆ و ڕوخسار و زولفت دەڵێی بولبولە لە دەشت و سەحرا بۆ گوڵ دەناڵێ.
تەشبیهی مورەککەبی تێدایە.
(١٠) واتە: ئـەی وەفـایی تـا مـن هـەم هـەر بـە دوای یـارەوەم هـەرچـەند بشـمسووتێنـێ و بشمگریێنێ، ئارەزووم هەر گەیشتن بە یارە با بە ئاو و ئاگریشمدا بدات.

**[٥]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن» بەحری موزاریعی موسەممەنی ئەخرەب ڕەدیف: دا. واژەی قافیە: دامەنت، گوڵشەنت، کوشتنت و...
**تێبینی**: دەبێ ئەم شیعرە ناتەواو بێ؛ چونکە غەزەل بێ مەتلەع نابێ، قەتعەیش نییە.
(٢) واتە: هەرکەس خۆی بە قوربانی تۆ کرد بە دەوڵەتی ڕوخساری تۆ شـاد بـوو، ئـەوەنییە زولفی شکاوت ئاوێزانی کەمەرت بووە.
(٣) واتە: ئەگەر سەد جار ڕۆحم فیدات کەم بە قەد خاڵت شانسم نییە، من بێبەشم و کـافر (خاڵ) لە گوڵشەنت دا جێگیرە.

**زولفت لە پێ کەوت و خەت هات بە تەمای قەتلی دڵ**
**ئاخر بە دەستخەتی خۆت گرتت بە کـوشتنت دا**[٤]
**ئەی نەوبەهاری خووبی ڕوحمێ بە حـاڵی بـولبول**
**نەوەك سەرمای هەناسەی لە گوڵ و یاسەمەنت دا**[٥]
**ئەی خەت بە زولفی دولبەر تـۆ بـوویە فـیتنەیی دڵ**
**دڵ بێغـەم و خـەیاڵ بـوو هـاتی بـە گـرتنت دا**[٦]
**وا تـێمـەگـە عـەزیزم کـوشتمت و نـائومێد بـووم**
**دەستم ئەگەر نەگـەیێ خـوێنـم لە گـەردەنت دا**[٧]
**بــە قسـەم بکـە «وەفـایی» بـمرە هـەتاکـوو مـاوی**
**وەســڵی بــەقا بــە ئــایات ئــەوا لە مـردنت دا**[٨]

---

(٤) خەت: ڕوخساری یار. دەس‌خەت: نووشتە، سەنەد، بەڵگە.
واتە: زولفت هیلاك بوو بەڵام خەتی ڕوخسارت هات بۆکوشتنی دڵی من، عاقیبەت بە بەڵگە و سەنەدی دەست‌خەتی خۆت دڵت بە کوشتن دام.
(٥) واتە: ئەی تازە بەهاری چاکی، ڕەحمێ بە حاڵی بولبول، مەبادا ئاهی ساردی هەناسەی بولبول گوڵ و یاسەمەنت هەڵپرووزکێنێ.
(٦) خەت: لە شیعری وەفاییدا ئەم واژە یەکجار زۆر هاتووە بە شکڵ و شێوە و ڕوخساری یار دەڵێ.
واتە: ئەی ڕوخساری یار تۆ بە هاوکاری زوڵفی یار هۆی فیتنەی دڵی، دڵم هیچ بیر و خەیاڵێکی نەبوو تۆ هاتی و بە کوشتنت دا.
(٧) واتە: ئازیزم وا تێنەگەی بە کوشتنم ناهومێد بووم. ئەگەر دەستم پێت نەگا خوێنم لە داوێنتدا دەمێنێتەوە.
(٨) واتە: وەفایی ئەگەر بە قسەی من دەکەی بمرە تا ماوی، چونکە بە نیشانە و تەجرەبە ئایاتی قورئان، وەسڵی هەمیشەیی لە مەرگ دایە.
ئەم شیعرە عیرفانییە و لە عیرفاندا وەسڵ لە مەرگدایە، کە هەمان «لقاءاللّٰه»یە.

[ ٦ ][(١)]

لەو شــاره خــەدەنگی ســەنەمێکــم لە جگــەر دا
شــۆخــێکــە غــەمی ئـاییـنەداری بـە قـەمەر دا[(٢)]
خـەملّیـوە وەکـوو گـوڵ بـەسەر و بـەرگی بـەهاری
خۆی گوڵ، دەمی گوڵ، چەبکەنی گوڵناری لەبەردا[(٣)]
بـۆ زەوقـی تـەکـەللوم کـە دەمـی هـاتە تـەبەسسوم
خەندەی لە دەمی غونچە و تەعنەی لە شەکەر دا[(٤)]
شــەڕیــانە لەســەر مـوڵکـی دڵم غـەمزە و نـازی
بۆیێکی بە جووت دێن وەکوو نەشتەر لەجگەردا[(٥)]

---

[ ٦ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیف: دا. واژەی قافیە: جگەر، قەمەر، لەبەر و...

(٢) سەنەم: بوت، ئیستیعارەیە لە یار. ئایینەدار: کەسێك لە شاییدا ئاوێنە بۆ بووك ڕادەگرێ، لە شیعردا بە خزمەتگوزاری جوانان دەڵێن.

واتە: لەم شارەدا تیری یارێکی جوانم لە جگەردایە ئەو شۆخە هێندە جوانە مانگ لە حەسرەتی ئەوەدایە کە ئاوێنەی بۆ ڕابگرێ، بەڵام ئەم شۆخە ئەو غەمە لە دڵی مانگدا دەهێڵێتەوە.

(٣) خەملّیوە: جوان بووە، ڕازاوەتەوە. چەبکەن: جۆرێ لیباسە کە لە چەپەوە دائەکەنرێ.

واتە: یار وەکوو گوڵ لە بەهاردا جوان بووە، خۆی وەك گوڵ جوان و ڕازاوەیە، دەمی وەك گوڵ پشکووتوو و کراوەیە و لیباسێکی گوڵناری سووریشی لەبەردایە.

(٤) واتە: کاتێ بۆ قسەکردن بزەی هاتە سەر لێوی، تانەی لە دەمی تەنگی غونچە و لە شیرینی شەکر دا.

(٥) واتە: غەمزە و نازی یار لەسەر موڵکی دڵم بەشەڕ هاتوون بۆیە هەردوکیان وەکوو نەشتەر بە جگەرمدا ڕۆدەچن.

گـەنجینە تـەلیسمی هـەیە بـەو چـاوە لەسـەر هـیچ
وەجــهی چـییە ئـاشوفتەیە زولفت لە کـەمەردا؟(٦)
تــیرت کــە قــەراری جگـەرم بـوو وە دڵم کـەوت
تا ڕۆژی حــەشر داغــیِ خـەدەنگت لە جگـەردا(٧)
ماڵێکـە هـەموو وەقـفە لە شـەوقی سـەری کـوڵمت
عومرێکـە هـەموو سـەرفە لە نـاڵیـنی سـەحەردا(٨)
هەر لەحـزە «وەفـایی» وەکـوو بـولبول کـە دەنـاڵێ
کەس مەنعی نەکا عەشقی (گوڵەندام)ی لەسەردا(٩)

---

(٦) گەنجینە: خەزێنە. تەلیسم: نەقشەی گەنج و خەزێنە، لە ئەفسانەی کۆندا بەو مارە ئـەڵێن کە بەسەر خەزێنە و دەفینەوە پەپکە ئەخوا. هیچ: کینایەیە لە دەمی یار.
واتە: یار ڕوخساری و دەمی وەك گەنجینەیەك وایە، چـاوی نـەقشەی ئـەو گـەنجەیە لەسـەر دەمی؛ کەچی لەبەرچی زولفی یار بە قـەدیدا تـێك ئـاڵاوە؟. دەشکـرێ بـەم شـێوەش مـانای لێبدرێتەوە: کاتێك خەزێنەی دەمی، تەلیسمی چاوی جادووی ئاگاداریی لێ ئەکـات، ئـەی بۆچی زولفی وەك ڕەشماری، خۆی ورووژاندووە بە قەدو باڵایدا؟!
(٧) واتە: داخی ئەو تیرەی کە دەبوو لە جگـەرم بکـەوێ و لە دڵم درا، تـا مـەحشـەر وەکـوو چقڵێ لە جەرگمدا دەمێنێ.
(٨) واتە: سەروەت و ماڵم هەمووی وەقف و بەخششی سەری کوڵمت بووە، عومرم هەموو لە ناڵەی سەحەردا سەرف بووە.
ڕازە (ئارایە)ی موازەنەی هەیە.
(٩) واتە: ئەگەر وەفایی هەمیشە دەناڵێ مەنعی مەکەن چونکە ئەوینی گوڵەندامی لەسەردایە.
گوڵەندام: لە شیعری وەفاییدا زۆر هاتووە پێدەچێ نێوی موستەعاری یارەکەی بووبێ، یان بەڕاستی عاشقی گوڵەندام ناوێك بووبێت.

**[ ٧ ]** (١)

**مەششاتە کە شانەی لەسەری زولفی سەنەم دا**
**ئاشفتەگیی حالی وەفایی لە قەڵەم دا (٢)**
**قوربان وەرە سەیرێکی دڵ و عالەمی دڵ کە**
**هەر زەوقە بە دڵ، شەوقە لەسەر، ئاهە لە دەمدا (٣)**
**ئاوێنەیی دڵ وا لە جەلادا بە تەجەللا**
**دێوانەیی ڕووت "کەی"لە هەوای شەوکەتی جەمدا؟ (٤)**
**بۆ خاتری خەندێکی بە ڕەنگی گوڵ و باران**
**عاشق ئەوەتا هەر کوڵی گریانی لە دەمدا (٥)**

---

**[ ٧ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن»، بەحری موزاریعی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیف: دا. واژەی قافیە: سەنەم، قەڵەم، دەم، و...

(٢) مەششاتە: ئارایشگەر. لە قەڵەمدان: نووسین و بەیانکردن. سەنەم: بوت، ئیستیعارەیە لە یار.

واتە: ئەو کاتە کە ئارایشگەر شانەی لەسەری زولفی یار دا ئاشوفتەگی و پەرێشانی وەفایی بەیانکرد.

(٣) واتە: بە قوربان وەرە سەیری عالەمی دڵ کە، هێندە عاشقە دڵی پڕ لە زەوق و سەری پڕ لە شەوق و دەمی پڕ لە ئاهە.

(٤) تەجەللا: خۆپیشاندان. جەلا: ساف و سەیقەل کردن. لە وشەی «کەی»دا ئیهامی تەناسوب هەیە. جەم: جەمشیدی پادشای ئێران.

واتە: دڵم وەك ئاوێنەیە بە پیشاندانی یار سەفا دراوە، عاشقی دێوانەی یار قەت ئاوات و بیری لە لای شەوکەت و گەورەیی جەمشید و جامەکەی نییە.

(٥) دەم: نەفەس، هەناسە.

واتە: لەبەر ئەوەی یار پێکەنینێکی وەك گوڵ و بارانی بە زاردابێ، عاشق هەمیشە هەناسەی پڕ کوڵی گریانە و دەگری.

خــەندەی گــوڵی زارت کــە نــەبوو بــاعیسی مــەستیم
بــۆچــی دڵی مــن دەســتی لە گــوڵزاری ئـیرەم دا؟(٦)
ئاخر سەگی خــاکــی دەری تــۆ بــووم بــە جــودایــی
مروەت نەبوو تیغت لە سەری سـەیدی حـەرەم دا(٧)
ڕۆحــم بــە نــیساری قــەدەمت! بـۆچـی دەرەنـجێی؟
ڕۆحم کە بە من بــایە، وەکــوو دڵ، چــییە؟ دەمـدا!(٨)
وا عــــاشقی زار و کــــەمەری تــۆیــە «وەفــایی»
لەو نــێوە وجــوودێکــە لە بـەینی دوو عـەدەمدا(٩)

(٦) واتە: ئەگەر پێکەنینی دەمی تۆ نابێتە باعیسی مەستی من، بۆچی دڵی من گوڵزاری ئیرەم و باغی بەهەشتی دەمتی کردە نیشانە و شەیدای بوو؟!. بە بۆچوونی من ئەگەر لە باتی وشەی «دەستی» وشەی «مەستە» دابنرێت ماناکەی جوانتر و ڕاستتر دەبێت.
(٧) سەیدی حەرەم: نەچیرێ لە ماڵی کەعبە ڕاوکرێ، نمادی بێ گوناحی و مەزڵوومییە.
واتە: من وەك سەگی دەرکەی تۆ بە خۆڕایی و بەلاش خزمەتم دەکرد، بێ مروەتی بـوو مـن وەکوو نەچیری حەرەم بێ گوناح بووم تیغت لە سەرم دا و کوشتمت.
(٨) واتە: ئەی ڕۆحی من زێڕەوشانی هەنگاوت بێ بۆچی لە من دەرەنجێی؟ هەروەك دڵم بە تۆ داوە ئەگەر ڕۆحیشم بە من بایە هەر دەمدایە، چونکە لە عاستی تۆدا ڕۆح هیچ نییە.
(٩) وجوود: هەبوون، عەدەم: نەبوون. دوو عەدەم: مەبەست لە دەم و کـەمەری یـارە، یـانێ هێندە بچووکن وەك ئەوە وایە هەر نەبن.
واتە: وەفایی هێندە عاشقی دەم و کەمەری تۆیە دەڵێی ئەو وجـوودێکـە لە نێوان دوو شـتی عەدەمدا، واتە دەم و کەمەری یار.
حاجی قادر لەسەر ئەم مەبەستە دەڵێ:

تا دەستی نەدا خەنجەر و نەی فەرموو دەسا دەی — حاجی بکوژن خێرە ئەدی مـەیدەن ئـەمانی
ئیمکانی لەکن ئەو عولەمای موو دەقەڵیشن — عــەنقا و وەفـا بــووچ مــیانی چ دەهــانی

[ ٨ ][١]

کــاکــۆڵی بــەدەم بــاوە کــە بــادا بــە بــەدەندا
بــازاڕی شکــا نــافە بــەسەر چــین و خــوتەندا[٢]
تــورکانە گــوڵم پــەرچــەمی کــەوتۆتــە عــوزاری
وەك ســونبولی ئــاشفتە لەبــەر بــەرگی ســەمەندا[٣]
تا هەوری بەهاری نە بزووت غــونچە نــە پشکــووت
بــۆیــە دەگــریێ خــەندە بــەسەر گــریەیی مــندا[٤]
گــۆیــا وەکــوو مــن بــەو قــەدە ســەودایــییە زولفت
ســەرگەشتەیە وا تــا بــەری پــێت چــین و شکــەندا[٥]

---

[ ٨ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری موزاریعی موسەممەنی مەحزووفی مەکفووف. ڕەدیف: دا. واژەی قافیە: بەدەن، خوتەن، و...

(٢) نافە: مادەیەکی بۆنخۆشە کە لە چین و خوتەن بە عەمەل دێ و لە ناوکی ئاسکی دەگرن.
کاکۆڵ: پرچ، زوڵف.
واتە: کاتێ یار زولفی لوول کرد بە سەر ئەندامیدا نافە لە چین و خوتەن بازاڕی نەما.
لە نێوان نافە و چین و خوتەندا تەناسوب هەیە.

(٣) تورکانە: سیفەتی نیسبییە واتە: وەك تورك جوانڕوو.
واتە: یارم وەك کچە تورکی جوانڕوو، زولفی کەوتووەتە سەر ڕوخساری هەروەکوو گوڵی سونبوڵ بە سیسی و پەرێشانی لەسەر گەڵای گوڵی سەمەن کەوێ.
ئارایەی تەشبیهی مورەککەب (ڕازەی وێچواندنی لێکدراو) هەیە لەم بەیتەدا.

(٤) دەگریێ خەندە: پێدەکەنێ، ئەم تەرکیبە فارسییە، فارسەکان دەڵێن: خندەاش می‌گیرد.
واتە: تا هەوری بەهاری نەگری و نەگرمێنێ، غونچەی گوڵ ناپشکوێ هەر بۆیە یاریشم تا من نەگریم دەمی وەك غونچە ناکاتەوە و پێناکەنێ.
تەشبیهی موزمەری دەمی یارە بە غونچە.

(٥) گۆیا: وەك دەڵێن. سەودایی: شێت و دێوانە بوو.
واتە: وەك دەڵێن زولفت وەکوو من شێتی قەدت بووە هەر بۆیە بە قەد و باڵاتدا بە چین و شکەن (خوار و خێچ) هاتۆتە خوارێ بە سەرگەردانی.

مــن كــوشتە ئــەتۆ بـەو دەمـە شـیرینە «مـەسیح»ی
مــن تــەشنە ئــەتۆ ئــابی حــەیاتت لە زەقـەندا(٦)
هـێشــتا دڵەكـەم سـەرخـۆشـە نـایێتـەوە سـەرخـۆ
ساقی بە كەرەم دوێنـێ كـە جـامێكـی بـە مـەن دا(٧)
ماچێكـی دەمت خـوێنـی شـەهیدی سـەری زولفـە
سائەو دەمـە وا بـێنـە ئـە مـن خـۆم لە ڕەسـەن دا(٨)
زولف و ڕوخ و لەب، عاریز و خـەت، زایـقەبەخشن
وەك زوهرە لە شەو، مەی لە قەدەح، گوڵ لە چەمەندا(٩)
كـــەی بـــەستەیی زەڕڕێكـە دوسـەد بـەرقی لوئـالی
ئەو خەندە مەگـەر مـوعجیزە وادێ بـە دەهـەندا(١٠)

---

(٦) زەقەن: چەناكە.

واتە: من كوژراوم و تۆ حەزرەتی مەسیحی بە نەفەسی شیرینت مردوو زیندوو دەكەیەوە، من تینووم و ئەتۆ ئاوی حەیاتت لە چەناكەدایە بمدەرێ با نەمرم.

ڕازە (ئارایە)ی موازەنە هەیە.

(٧) واتە: لە دوێنێوە كە ساقی لە ڕووی مەرحەمەتەوە جامێكی داومێ دڵم هێشتا مـەستە و هۆشیار نەبۆتەوە.

(٨) خوێن: دییە، خوێنبایی. خۆم لە ڕەسەن دا: خۆم بە تەنافەوە هەڵواسی، خـۆكـوژی بـە خۆهەڵواسین.

واتە: ئەگەر كەسێ شەهیدی خنكانی زولفـی تـۆ بـێ دیـیە و خـوێنـبایی مـاچێكـی دەمـتە، دەماچێكم دەیە ئەوا من بە زوڵفی تۆوە خۆم هەڵواسی و خۆم خنكاند.

(٩) واتـە: زولف و ڕوخسـار و لێوت، سـەر و چـاو و خـەت و خـاڵی لێوت مـەزەیان هـەیە هەروەك ئەستێرەی زوهرە لە شەودا، مەی لە نێو پیاڵەدا، گوڵ لە نێو چەمەندا.

ئـارایـەی تـەشبیهی مـورەككـەب (ڕازەی وێچـوانـدنی لێكـدراو) هـەیە و لەف و نـەشری مورەتتەبیشی تێدایە.

(١٠) زەڕڕێك: تۆزێك، ئیستیعارەیە لە دەمی یـار. بـەرقی لوئـالی: بـریسكانەوەی گـەوهەر، ئیستیعارەیە لە سپییەتی ددانی یار.

بـــۆ ڕۆژی نـــیساری قـــەدەمت ئـــەشکی «وەفـایی»
مـــرواریـــیە، پـــەروەردە لە نـــێو کـانی یـەمەندا[11]

[٩][1]

لێوەکـــەی ئـــاڵت دەڵێن عـــاشق لە ســـووتان بـــەردەدا
زەڕڕەیـــەك نـــوورە بـەڵێ ئـاگـر لە ئـینسان بـەردەدا[2]
من لە سیرڕی حیکمەتی چاوت عەجەب ماوم، عەجەب!
ئەو نەخۆشە خوێنی قـەلبی مـن بـە مـوژگان بـەردەدا[3]

---

☞

واتە: دەمی تۆ بەو بچووکییە کەوا ئەو هـەمووە بـریسکانەوەی گـەوهەری ددانـەکـانتی تـێدا مومکین دەبێ مەگەر پێکەنینی تۆ موعجیزەبێ دەنا هەرجێی باوەڕ نییە. یەعنی: پێکەنینی تۆ وەك موعجیزەیە، چونکە پێکەنینت ئەو هەموو بـریسکەی یـاقووتە لەو دەمـە زۆر بـچووکە دەردەخات.

(١١) واتە: فرمێسکی وەفایی بۆ پایەندازی هاتنی تۆ وەك مرواریـدە کـە لە کـانگەی شـاری یەمەندا پەروەردە بووبێ هەر بەکاری ئەوەدێ بکرێ بە شاباشی ڕێگەت.

[٩]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف: بەرئەدا. واژەی قافیە: سووتان، ئینسان، موژگان و...

(٢) واتە: وەك بیستوومە لێوی سووری تۆ ئاگر لە عاشق بەردەدا، بەقەد زەڕڕەیەك لە تیشك دەبێ کەچی ئینسان دەسووتێنێ.

(٣) «چشم بیمار» واتە چاوی نەخۆش لە فارسیدا زۆر باوە، بۆیە وەفایی بە چاوی یار دەڵێ نەخۆشە.

واتە: من تاجوب دەمێنم لە ڕازی چاوی تۆ عەجایەب حیکمەتێکە بۆ خۆی نەخۆشە کەچی بە مژۆڵەکانی خوێنی قەلبی من جاری دەکا.

**ئـەژدەهای زولفت تـەلیسمێکـە لە سـیحری بـابلی**
**میهری ئاگر شـوعلە دەگـرێ، مـاهی تـابان بـەردەدا**(٤)
**هـیندوویی خـاڵت وەنـێو بـاغی جـەماڵت کـەوتووە**
**بـاغەبان خـانەخەرابـێ! بـۆچ گـوڵستان بـەردەدا؟**(٥)
**لێوی یـاقووتت ئـەگـەر قـووتی ڕەوانـی عـاشقە**
**پـێم بـڵێ وەجـهی چـییە ئـاگـر لە ئـینسان بـەردەدا**(٦)
**زاری تـۆ گـوڵزارە خـۆ، بـۆچ ئـابی حـەیوانـی هـەیە؟**
**سەروی تۆ ئازادە، بـۆچ نـارنج و ڕومـمان بـەردەدا؟**(٧)

---

(٤) ئەژدەهای زولف: ئیزافەی تەشبیهی ویچواندنی زولف بە ئـەژدەها. تـەلیسم: سـیحر و داوی جادووگەران. بابل: وڵاتێکە زەمانێ ساحیری زۆربووە و ئەو دوو فریشتەیە (هاڕووت و مارووت) کە خەڵکیان فێری جادووکردووە لە وێدا بوون. میهری ئاگر شـوعلە: خـۆرێ کـە بڵێسەکانی وەك ئاگرە، ئیستیعارەیە لەکوڵم و ڕوخساری یار.
واتە: زوڵفی تۆ وەك تەلیسم و سیحرێکی سیحربازانی بابلییە کە ڕۆژ تەسخیر دەکا و مـانگ وەدەر دەخا. یان مانگ ئیستیعارە لە بناگوێی یار بێ کە دەردەکەوێ کاتێ زولفی ڕوخساری دەگرێ بناگوێی دەردەکەوێ.
(٥) واتە: خاڵت وەك قولەڕەشێ کەوتووە نێو باخی جوانیت؛ باخەوان ماڵی بەقوڕگیرێ بـۆ ئاگاداری لە باخ ناکا، ئەو قولەڕەشە وێرانی ئەکا.
هیندووی خاڵ: ئیزافەی تەشبیهییە.
(٦) واتە: ئەگەر لێوی سووری یاقووتیت خۆراکی ڕۆحی عاشقە بڵێ بزانم بە چ هۆیەك ئاور لە ئینسان بەرئەدا؟.
(٧) زار: دەم. سەرو: داری سەوڵ، کە بەرز و بێبەرە، ئیستیعارە لە باڵای یارە. نارنج: پرتەقاڵ و لیمۆ، ئیستیعارە لە مەمکی یارە. ڕوممان: هەنار.
واتە: دەمت وەك گوڵزار وایە ئەو ئاوی حەیاتەی لە کوێ بوو؟ قەدت وەك سەوڵی ئازادەیە ئەم هەنار و نارنجەی چۆن دەرکردووە؟
ڕازە (ئارایە)ی ئیستیعارە و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

لێوی ئـــاڵت چـــاوی کـاڵت بـوونە فـیتنەی دیـن و دڵ

حەقیەتی ـ باللّه ـ «وەفایی» دەست لە ئـیمان بـەردەدا![٨]

[ ١٠ ][١]

«مـــــا رأيتُ اللـــــيلَ إن مـــــن لحـــــظة صـــــار الغـــدا

فـــــي الذوايب وجـــهك أم فـــي الدجـــى شـــمس بـــدا؟»[٢]

قـــــەت نـــەهاتە دەست و جـــارێ نـــەبووە ئـــارامـــی دڵم

تـــــا قـــیامەت داغـــی زولفـــانت لە جـــەرگی ئـــێمـــەدا[٣]

بمکوژی، سەد جار دەرم کـەی، ڕووی مـن و خـاکـی دەرت

«کـــــيف يُـــــحْرَم سـائلٌ مِـــن بـــابِك حـــاز النـــدیٰ؟»[٤]

---

(٨) واتە: لێوی ئاڵ و چاوی کاڵی تۆیە باعیسی نەمانی دین و دڵ، بە خودا وەفایی حەقیەتی ئیمانی لە دەست بدات.

[ ١٠ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: غَدا، بَدا، ئێمەدا و...

(٢) واتە: لەو کاتەوە ڕۆژ بۆتەوە (واتە: ڕووت دەرخستووە) من قەتم شەو نەدیوە. ئەرێ ئەوە ڕوخساری تۆیە دەرکەوتووە یان هەتاوە و لە تاریکیدا دەدرەوشێ؟

ڕازە (ئارایە)ی «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

(٣) نەهاتە دەست: هیچی نەکرد.

واتە: زولفت قەت بە کەڵکی ئێمە نەهات و ئارامشی بە دڵم نەدا. تا قیامەت داغی زولفانت لە دڵی ئێمەدا هەر هەیە.

(٤) ڕووی من و خاکی دەرت: ئەو واوە واوی مەعییەتە.

واتە: ڕووی من هەمیشە لە دەرکی تۆیە ئەگەر بشمکوژی و دەریشمکەی مـن هـەر ڕووم لە خاکی دەرکی تۆدایە، سواڵکەر لە دەرکی تۆ چۆن ناهومێد دەبێ کە بەخششی دەس کەوێ.

ئەم بەیتە مولەممەعە، سیفەتێکی زۆر گرانە کە شاعیر بە دوو زمانی جیاواز شیعر دابنێ.

ئـاگـری عـیشقت لە ڕۆحـم بـەربووە سـەر تـا قـەدەم
وەك نەیستان هـەر دەسـووتێم مـات و خـامۆش بـێ‌سـەدا[٥]
دڵ بـە مـەحزی ڕوئیەتی زولفت بـە ڕوودا کـەوت و مـرد
مـرد و نـەمزانـی: نـە گـەنج خسـتی نـە مـاری پێوەدا؟[٦]
چەند بە ناز دێی و دەچێ سەرخۆش و شۆخ و شەنگ و مەست
ئـەی گـوڵی نـازدار، ئـیلاهی، بـای خـەزانت لێ نـەدا[٧]
بـاغ دەبـێ هـەر گـوڵفرۆش بـێ، یـار کـە دێتە پێکـەنین
"بـا" دەبـێ عـەنبەر بـە بـا دا، ئـەو کـە زولفـان بـا دەدا[٨]
دیـن و دڵ سـەبر و قـەرارم چـۆتـە ڕێگـای یـەك نـەزەر
تـۆ بـڵێی ئـەو شـۆخـە وا سـەرمەستە قـەت بێتـە ڕەدا؟[٩]

---

(٥) ئەوینت وەك ئاگر سەر تا پای منی داگرتووە بۆیە هەروەك قامیشەڵان بێ‌دەنگ و سەدا هەروام لە سووتاندا.

(٦) گەنج: خەزێنە. مار: دەڵێن هەمیشە لەسەر خەزێنەیە، ئیستیعارەیە لە زولفی یار لەسەر ڕوخساری.

واتە: دڵم بە مەحزی ئەوەی ڕوخساری وەك خەزێنەی تۆی بینی کەوت و نەما، ئیدی نازانم ڕوخساری وەك گەنجی تۆی بینی و لە خۆشیانا دیقی کرد و مرد، یان ماری زولفی تۆ کە لەسەر گەنجی ڕوخسارت بوو پێوەی دا؟.

(٧) واتە: هەتاکەی بە ناز و شۆخ و شەنگی و مەستی هاتوچۆ دەکەی ئەی گوڵی جوانی بۆ خاتری خودا قەت پاییزی پیری نەبینی، یان بە بای پاییز نەخۆش نەکەوی.

(٨) واتە: یار کاتێ کە پێدەکەنێ، باغ دەبێ گەوهەر بفرۆشێ واتە لە پێکـەنینیدا ددانـی وەك گەوهەر دەردەکەوێ، وە ئەگەر یارم زولفی شانەکا «با» دەبێ عەنبەر بفرۆشێ لە بۆنی خۆشی زولفی یار.

ڕازە (ئارایە)ی موازەنەی تێدایە.

(٩) بێتە ڕەدا: ڕازی بێ، بەڵێنم پێ‌بدا.

واتە: دین و دڵ و سەبر و قەرارم لە ڕێگای تەماشایەکی یاردا لە دەست چوو، تۆ بڵێی ئەو یارە بەم قیمەتی دین و دڵە ڕازی ببێ و قەولم بداتێ؟.

**بــۆچ بـرۆم لێ تـێکـدەنێی ڕووت وەردەگـێڕی چـاوەکـەم؟**
**کــابە کــەچ بــوو؟ قــیبلە گـۆڕا؟ مـاچێکـم لەو لێوە دا!**(١٠)
**دەست و دامــان زولفــەکـەت کـەوتۆتـە بـەر پـێت و دەڵێ:**
**تــۆ غــەنی مــن بــێنــەوا، تــۆ پــادشاھ و مـن گـەدا**(١١)
**خــەندە بــەم شــیرینییە، دەم بــەم نــموونەی حــیکمەتە**
**قەت «وەفایی» نەبووە وا خۆش بـێ، خـەبەر بـێمـوبتەدا!**(١٢)

••••••▬▬●▬▬••••••

### [ ١١ ](١)

**بــە خــۆڕایــی نــییە ســـووتاوی ڕووتــە عــاشقی شـەیدا**
**لە ڕووتــی دیــوە جــیلوەی ئـاتەشی «سـینا» لە سـینەیدا**(٢)

---

(١٠) برۆ لێکنان: تووڕە بوون.

واتە: یارەکەم بۆچ لێم تووڕە دەبێ، ماچێکم لەو لێوە کردووە ئیدی خۆ کابە کەج نەبووە.

(١١) واتە: زولفت دەست و دامانت بووە و کەوتووەتە بەر پێت، یانی درێژە، لەبەر دەپاڕێتەوە و دەڵێ تۆ پادشای و من گەدام و تۆ دەوڵەمەندی و من فەقیر.

لە نێوان شاو گەدادا تەزاد هەیە.

(١٢) واتە: پێکەنیت ئەوەندە شیرینە و دەمت نموونەی حیکمەت و چکۆلەیی، وەفایی شتی وا سەیری هەر نەبووە، موبتەدا لە نەحودا قەت بێخەبەر نابێ کەچی یار دەمی هەر هێنـدە چووکە دیار نییە کەچی پێدەکەنێ.

خەبەر: پێکەنین. موبتەدا: دەم، زاری یار. نیوە بەیتی یەکەم ئاماژەیە بە حـەدیسی «اَلْحِکْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ» واتە: حیکمەت، ون بووی هەر موسڵمانە. وەفاییش دەمـی یـاری لەبـەر زۆر چکۆلەیی بە نموونەی حیکمەت ناو بردووە چونکە ئەمیش ون و نادیارە.

[ ١١ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: شەیدا، سینەیدا خەندەی دا و...

(٢) ئاتەشی سینا: تەلمیحە بە داستانی حەزرەتی مووسا و جیلوەی حەق تەعالا و سووتانی ☞

**کوتم: عەقدی سورەییا ماهی مـن تـونگی شـەکـەرنەی بـوو**

**کـەچی بـۆ ڕاسـتی ئـیعجازی خـۆی یـارم لە خـەندەی دا**[۳]

**عەسای فەتحی مووسا کول بـوو بـە مـوعجیزە شکـافی کـرد**

**کە فیرعەونی خەتی هات و ئیحاتەی تـووری کـوڵمـەی دا**[٤]

**درۆت فەرموو حەزم بـێ نـایەڵم، گـەر ڕاست دەڵێی سـادەی!**

**فەرەنگی قەومی دەججال ـ ئەی مەسیحا ـ دەوری کەعبەی دا**[٥]

---

☞

کێوی توور.

واتە: عاشقی شەیدا لە خۆڕایی نییە بە دیتنی ڕووی تۆ دەسووتێ، لە سنگیدا ئاوری سینا بەربووە تا جیلوەی ڕووی تۆ دەبینێ.

لە نێوان سینا و سینە جیناسی ناقیس هەیە.

(۳) عەقدی سورەییا: ئەستێرەی کۆ، لێرەدا مەبەست دەم و ددانی یارە. تونگی شەکەرنەی: سوراحیی شەکری قامیش، یانی شەکری زۆر، ئیستیعارە لە دەمی یارە.

واتە: گوتم: زاری یارم وەك ئەستێرەی کۆیە و تونگی نەیشەکەرە، کەچی دیار نەبووە لەبەر بچووکی دەمی، وە یارم بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ هەیەتی دەستی کردە پێکەنین.

(٤) واتە: ئەو کاتەی خەت و خاڵی یار وەك لەشکری فیرعەون هات و دەوری کوڵمی یاری دا کە وەك تەپۆڵکەی توور وابوو عەساکەی مووسا کە شتی جیا ئەکردەوە کول بوو و هیچی پێ نەکرا و کوڵمی یار تەنیا موعجیزە (وەك شەقولقەمەر) توانی بیکا بە دوو کەرتەوە.

تەلمیحە بە داستانی مووسا. لە نێوان «مووسا» و «کول»دا تەناسوب هەیە چونکە «مووسا» بە مانا تیغیش هاتووە.

(٥) ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتەکەی سەرەوەدا پەیوەندی هەیە.

واتە: ئەی یار درۆت کرد گوتت نایەڵم فیرعەونی خەتت کوڵمم بگرێ ئەوە نییە قەومی دەجاڵ دەوری ڕوخساری داوی؟ وایە زولفت ڕوخساری داگیر کردووی. لەوانەشە ئەم بەیتە ئیشارەتێکی ناسکی تێدابێ بە دەسدرێژی دەوڵەتی ئینگلیز لەسەر عەرەبستان و وڵاتە ئیسلامییەکانی تر لەو سەردەمەدا.

**لە سـینەمدا چ شـیرین دڵ دەنـاڵێنـێ بـە مـەحزوونی**
**وەرن لەو شـیوە گـوێ بگـرن بـە شـین و شـیوەنی نـەیدا[٦]**
**مـەکـەن مـەنعی «وەفـایی» چـونکە سـەرگەردانـی جـانانە**
**لە سـەر دیـنی کـە شـێخـی خـانەقا بـردی کـە تـۆبـەی دا[٧]**

## [ ١٢ ][١]

**هەر کـە دی جـەننەت بـە ڕوودا زولفـی پـڕ تـابی شکـا**
**تاری سونبول، حورمەتی گوڵ، بەرگی سیرابـی شکـا[٢]**
**مـاهی شـەوئارام بـە خـەندە هـات نـیقابی کـردەوە**
**ئـاسمان نـەزمی سـورەییا، شـەوقی مـەهتابی شکـا[٣]**

---

(٦) واتە: دڵم لە سینەمدا چەندە جوان بە ناڕەحەتی و پەرێشانییەوە دەناڵێ، وەرن لە شیوی دڵمدا گوێ گرن وەك نەی شیوەن دەکا.
واجەئارایی لە نێوان پیتی «ش»دا هـەیە و دووپـات کـردنەوەی واژەی شـین شـیو و شـیوەن مۆسیقای بەیتەکەی دەوڵەمەند کردووە.
(٧) واتە: مەنعی وەفایی قەت مەکەن کە لەسەر خاڵی جانان شێت و سەرگەردانە، شـێخـی خانەقا بردی تۆبەی پێ بکا، چونکە لە حەیبەت یار شێت ببوو و دینی لە دەست چووبوو.

**[ ١٢ ]**

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف: شکا. واژەی قافیە: پڕ تابی، سیرابی، مەهتابی و...
(٢) واتە: زولفی یار تا ڕوخساری یاری دی کە وەك بەهەشت وابوو لە حەیبەتا هەڵقـرچـا و لوولی خوارد، لقی سونبول ئیحتیرامی گەڵاگەش و ئاودارەکانی نەما.
(٣) واتە: یارم کە دەڵێی مانگی شەورازێنەرەیە بە پێکەنین هات و پـەچەکـەی لادا، ئـاسمان ڕێك و پێکی ئەستێرەی کۆ و شەوقی مانگەشەوەکەی لەدەست دا.

**کارگا خاکی بە سەر، وەستا بە ڕوو و سینە و بڕۆت!**
**نرخی قاقوم قەدری خەز، بازاڕی سنجابی شکا(٤)**
**دەوری تووری کوڵمی دا فیرعەونی خەت چارەی نەهات**
**ئەی دریغا! سەد کەرەت مووسا بە بێ تابی شکا(٥)**
**تاقی پەیوەستی برۆت وا بوو بە قیبلەی خاس و عام**
**کەعبە گەر بۆ خۆی بزانێ پشتی میحرابی شکا(٦)**
**کەس نییە لەو نوکتە حاڵیم کا «وەفایی!» دڵبەرم**
**خۆی دەمی هێنا، ئەمن گەستم، دڵی بابی شکا!(٧)**

---

(٤) کارگا: کارگەی قوماش سازی. قاقوم: پێستێکی سپی و گەرمە لەبەر دەکرا. خەز: حەریر، ئاوریشم. سنجابی: پێستی سموورە، قوماشێکە وەك مەخمەڵ نەرم و تووکدار.
واتە: کاتێ کارگەی قوماش پارچەی ڕوو و سینە و برۆی تۆیان دی ناهومێد بوون و ڕاوەستان، چونکە ڕووت پارچەی قاقومی شکاند و سینەت نرخی پارچەی خەزی شکاند و برۆت نرخی پێستی سنجابی شکاند.
لەف و نەشری مورەتتەبی تێدایە.
(٥) واتە: خەت و خاڵت وەك فیرعەونێ دەور تووری کوڵمی داوی و بە داخەوە مووسا لەو کێشەدا شکستی هێنا.
لە نێوان فیرعەونێ و مووسادا «موراعاتونەزیر» و تەزاد هەیە.
(٦) واتە: تاقی برۆی تۆ کە دەڵێی میحرابە بووە بە قیبلەی خاس و عام. کەعبە ئەگەر بە خۆی بزانێ پشتی میحرابەکەی لە عاستی تۆدا شکاوە. یەعنی بڕۆی تۆ بووە بە قیبلەگای هەموو کەس و چی دی کەس ڕوو لە کەعبە ناکات.
ئەم بەیتە دەکرێ لە بنەوە مەعنای تەبعیدی شێخ «عبیداللە»ش بگەیەنێ، واتە: بە شکستی تۆ و چوونی تۆ بۆ تائیف پشتی مزگەوتنشینان شکاوە.
(٧) واتە: کەس نییە لەم قسە زەریفە حاڵیم بکات کە ئەی وەفایی بۆ چی قەوماوە یار خۆی دەمی هێنا ئەمن ماچم کرد بابی لەم مەوزووعە دڵی ئێشا.

[ ١٣ ](١)

غەمزەدەی زولفم بە غەمزەی چاوی حەیرانم دەکا
بەستەیی داوم خەدەنگی تیرەبارانم دەکا(٢)
عاشقی زارم لەسەر هیچ ئەو نیگارە دەمکوژێ
تیفلی نادانم لەسەر ماچێ لە گریانم دەکا(٣)
داعیەی ئاوێنە دینی کوفرە نەك ڕوحمێکی بێ
حەقیەتی بەو چاوە کاڵانە کە تاڵانم دەکا(٤)
یاری من هەرگیز لە قەتلی عاشقی پەروای نییە
چونکە ڕوومەت شەمعە بۆیە حەز بە سووتانم دەکا(٥)

---

[ ١٣ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف: دەکا. واژەی قافیە: حەیرانم، بارانم، گریانم و...

(٢) حەیران: شێواو و سەرگەردان. داو: تۆڕ، تەپکە، ئیستیعارەیە لە زولفی یار. خەدەنگ: تیر، ئیستیعارەیە لە مژۆڵ.

واتە: من غەمی زولفی لە دڵمدایە کەچی بە چاوی سەرم لێدەشێوێنێ و بە زولفی بەسراومەتەوە و بە مژۆڵی تیرە بارانم دەکا.

(٣) هیچ: ئیستیعارەیە لە دەمی یار.

واتە: عاشقی دەمیم و ئەو لەسەر دەمی چووکی دەمکوژێ، من منداڵێکی نەزانم و ئەو لەسەر ماچێ وەگریانم دەخا.

دەشکرێ مەعنای هەوەڵی بەیتەکە بەم شێوە بکرێتەوە: من عاشقێکی زار و غەمناکم و ئەو لەسەر هیچ و بەخۆڕایی دەمکوژێ.

(٤) ئەم بەیتە بە قەتعی غەڵەت خوێندراوەتەوە، چونکە من دەستخەتەکەم نییە، مەجبوورم وەك نووسراوەکە مەعنای لێبدەمەوە.

داعیە: ئیددیعا، ئەو شتەی دەیڵێ. دینی: دیتنی. کوفر: داپۆشین، ئیستیعارەیە لە زولفی یار.

واتە: ئاوێنە ئیددیعای ئەوەیە زولفی یاری پیشانداوە کەچی ئەوە کوفرە چونکا زولفی یار بێڕەحمە و یار حەقیەتی بەو چاوە کاڵانەی تاڵانم بکا و دینم لێ بستێنێ.

(٥) واتە: یاری من قەت بۆ قەتڵی عاشقانی ترسی نییە چونکە ڕوومەتی وەك شەم وایە بۆیە حەزدەکا بمانسووتێنێ.

**ئــاو لە چــاوانــم لەبــەر زولف و عــیزارت دێنــە خــوار**

**دووکــەڵی ئــەو مــەجمەرە هــەر دەم لە گــریانم دەکــا[٦]**

**من دەڵێم: یاقووت و ڕەیحان خەتتی کامیان خــۆشــترە؟**

**ئەو بــە عــەیاری ئــیشارەی لەعــلی خــەندانــم دەکــا[٧]**

**قامەتی تــۆ نــەخلی تــوورە تــەلعەتی تــۆ نــووری تــوور**

**دەم بەدەم وا وەجهی جیلوەت مەست و حەیرانم دەکا[٨]**

**فیکری زولفت عــیللەتە، وەســفی دەمت نــاکــەم بــە دڵ**

**نــیکتە گــۆیــی پــیشەمە هــەودای پــەرێشــانم دەکــا[٩]**

---

(٦) مەجمەر: ئاگردان، ئیستیعارەیە لە زولفی یار.

واتە: چاوم لەبەر ئەو زولف و ڕوخسارەت ئاوی لێدەتکێ ئەوەش چونکە زولفت وەك ئاگردانە و دووکەڵی هەیە بۆیە چاوم ئاوی لێدێ.

ڕازە (ئارایە)ی حوسنی تەعلیلی تێدایە.

(٧) یاقووت: ناوی خەتخۆشێکی گەورەی کۆنی ئێرانییە کە سەعدی شیرازی لە بارەیەوە ئەڵێ: «کسی بالاتر از یاقوت ننوشت، تو از یاقوت بالاتر نوشتی». ڕەیحان: هەم ناوی خەتتاتێکە و هەم نەوعێ خەتی نووسینە.

واتە: من دەڵێم لە یاقووت و لە ڕەیحان یا لە لێو و لە زولفت خەتی کامیان خۆشتر و جوانترن ئەو بە زرینگی ئیشارە بە لێوی خەندانی خۆی دەکا.

لە یاقووت و ڕەیحاندا ئیهام هەیە، لەلایەکەوە ئاماژەیە بەو جوانووسانە و لەلایەکیترەوە ئیستیعارە لە لێو و زولفی یارە.

(٨) دەم بەدەم: قەیدی زەمانە یانی هەرکات، هەمیشە.

واتە: باڵات داری خورمای کێوی توورە و ڕوخسارت نووری کێوی توورە و دیداری ڕوخسارت هەمیشە مەست و حەیرانم دەکا.

(٩) واتە: من ئەگەر وەسفی دەمت باش ناکەم خەتای هەودای باریکی زولفتە خۆ منیش نوکتەی باریکی وەك مووت دەزانم بڵێم بەڵام هەودای پەرێشانی زولفت خەیاڵم ئاڵۆز دەکا.

زۆر لە شاعیران خەیاڵی شاعیرانەیان بە هەودای مووی زولف وێچواندووە. شاعیرێکی فارس ئەڵێ: «هزار نکتەی باریك‌تر از مو این‌جاست».

ڕوو لە ئەبرۆی تۆم دەکـا چـاوت بـە مـوژگانی کـەچی
قـیبلە نـیشانم دەدا، کـافر مـوسوڵمـانم دەکـا!(١٠)
پـێم دەڵێ: بگـری «وەفـایی» گـەر ئـەسیری لێومی
یەعنی مرواریم دەوێ، چی نرخی مەرجانم دەکـا؟!(١١)

•••••••▬▬●▬▬•••••••

[ ١٤ ](١)

نـەسیمی بـادی نـەورۆزی شـەمیمی عـەبهەری هـێنـا
بـەریدی عـاشقان دیسـان پـەیامی دڵبـەری هـێنـا(٢)
نـەوید، ئـەی عـاشقانی دڵفگـار! یـار هـاتە سـەر خـەندە
سەڵا، ئەی بولبولان! دیسان درەخـتی گـوڵ بـەری هـێنـا(٣)

---

(١٠) واتە: چاوت بە مژۆڵت برۆتم پیشان ئەداکە برۆت وەك قیبلە وایە،کەچی مژۆڵت کە وەك کافر وایە (هێندە ڕەشە) بە دیتنی کەعبەی ڕوخسارت و قیبلە برۆت موسوڵمانم دەکا.
(١١) مەرجان: ئیستیعارەیە لە لێوی یار. مرواری: ئیستیعارەیە لە فرمێسکی وەفایی.
واتە: پێم دەڵێ وەفایی ئەگەر تۆ ئەسیری لێوی منی دەبگری چونکە لێوی من وەك مەرجانە و فرمێسکی تۆش وەك مرواری وایە هەر ئەو قیمەت و نرخی مەرجانە.

[ ١٤ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیف: هێنا. واژەی قافیە: عەبهەری، دڵبەری، بەری و...
تێبینی: ئەم قەسیدەیە یەکێك لە شاکارەکانی وەفاییە. وەفایی قەسیدەکانی زۆرتر سروشتی و لە بارەی بەهارەوەن، هەوڵ ویستم قەسیدەکانی بە جیا لە غەزەلەکان شەرحیان کەم، بەڵام دیتم وا چاك نییە؛ چون ئەلفبێی غەزەلەکان بە پیتی ئەلفبای ئاخرە. وتم تازە هەر قەسیدەیەك لەگەڵ غەزەلەکانی هاوپیت بێ دەیهێنم، بەڵام پێنج‌خشتەکییەکان جیا دەکەمەوە و دوای قەسیدە و غەزەلەکان دەینووسمەوە و هەر بەم شێوەشم کردووە.
(٢) شەمیم: بۆن. عەبهەر: نێرگس. بەرید: نامەبەر.
واتە: بای نەورۆز بۆنی خۆشی هێنا و نامەبەری عاشقان پەیامی یاری هێنا.
(٣) نەوید: مزگێنی. سەڵا: هاوار، فریاد. دڵفگار: دڵ بریندار.

مەگەر ڕێی کەوتە زولف و ڕووی حەبیبم بادی نـەورۆزی؟
حــەیاتێکــی بــە دنـیا داو و بـۆی گـوڵعـەنبەری هـێنـا[٤]
بە فەتحی دڵ دەڵێی یار زولف و سـینە و ڕووی وەدەرنـاوە
لە نەسرین و گوڵ و سونبوڵ بەهار هات لەشکەری هـێنـا[٥]
دەڵێی چــاوی مــنە هـەوری بـەهاری دەم بـەدەم دەگـری
دەڵێی ئــاهی مــنە بــەرقی درەخشــان ئــاوری هـێنـا[٦]
هــەوا چـوو پـڕ بـە دامـانی دەر و دەشـتان، گـوڵی کـێشـا
سەبا هات پـڕ بـە جـەیبی کـۆهسـاران، عـەنبەری هـێنـا[٧]
لە نــێو بــەزمی وەنـەوشە و جـۆ کـەناران، لالە پـەیدا بـوو
بە تاریکی خزر بۆ چـەشمە شـای ئـەسکەندەری هـێنـا[٨]

---

☞

واتە: ئەی عاشقانی دڵبریندار مزگێنیم بەنێ یار هاتە سەر پێکەنین، هاوار ئەی بولبولان دیسان دارەگوڵ هاتە سەمەر.

(٤) واتە: ئەرێ ئەوە بای نەورۆزییە ڕێی کەوتۆتە نێو زولفی خۆشەویستی من وا ئەو هەموو ژیانەی بەخشیوە بە دونیا و بۆنی گوڵ و عەنبەر لە وڵات بەربووە؟.

(٥) بە فەتحی دڵ: بە ئیشتیای خۆ.

واتە: دەڵەی یار بە ئیشتیای خۆی ڕوخسار و سینەی وەدەرخستووە و بەهار بە گوڵەکانی وەك نەسرین و سونبوڵ لەشکری هێناوە.

(٦) واتە: هەوری بەهاری وەك چاوی من وایە هەمیشە دەگری هەورەبریسکەش لە ئاهی من دەچێ هەر ئاگرە.

ڕازە (ئارایە)ی تەشبیهی چاو بە هەور و سینە بە هەورەتریشقەی تێدایە.

(٧) جەیب: گەریبان، یەخە و دامەن.

واتە: هەوا پڕ بە داوێنی دەر و دەشت گوڵی هێنا و سەبایش پڕ بە ئێخەو بەرۆکی کۆساران گوڵی بۆنخۆشی عەنبەری هێنا.

(٨) واتە: گوڵی لالە لە نێو مەجلیسی وەنەوشە و قەراغی جۆگـەدا سـەری هـەڵدا و دەڵێی

☜

**کـــە ئـــیسلامی بـــەهار فـــتوای جـــیهادی کـــافری دەی دا**
**سنەوبەر نێزە، گوڵبون گورز و سۆسەن خـەنجەری هـێنـا[٩]**
**نـــیسار ئـــەفشان بـــە پـــایەندازی سـوڵتـانی بـەهار هـاتن**
**سەمەن دیبا، شەقایق ئەتڵەس و گـوڵ مـەخمەری هـێنـا[١٠]**
**لە شـــایی دارە، گـــوڵ مـەسنەدنشین بـوو هـاتە پشکـووتن**
**چەمەن تەختی زومورڕود، گوڵ لە یاقووت ئەفسەری هێنا[١١]**
**لە بـەزمی نـێرگس و نـەسرین بـە دەفـعی چـاوەزاری گـوڵ**
**وەنەوشە دەستە دەستە عـوود و، لالە مـەجمەری هـێنـا[١٢]**

---

☞

حەزرەتی خزرە لە تاریکستان و زوڵمەتدا ئاوی حەیاتی بۆ ئەسکەندەر هێناوە.
تەلمیحە بە داستانی خزر و ئاوی حەیات.
(٩) دەی: مانگی بەفرانبار. گوڵبون: بنجی گوڵ.
واتە: بەهار وەك لەشکری ئیسلام فتوای جەنگی لەگەڵ لەشکری کوفری زستان و مـانگی بەفرانبار دا، لەشکرێ سازبوو کە داری سنەوبەر نێزەی هێنا و بنجی گوڵ گورزی هێنا و گوڵی سۆسەن خەنجەری هێنا.
(١٠) نیسار ئەفشان: زێڕەوشان کردن.
واتە: بەهار وەك پاشایەك هات و بۆ پایەنداز و زێڕەوشانی ئەو، مێلاقە پارچەی ئەتڵەسی هێنا، گوڵی یاسەمەن حەریری هێنا و گوڵ مەخمەری هێنا.
ڕازە (ئارایە)ی تەشبیهـ و «موراعاتونەزیر» هەیە.
(١١) ئەفسەر: تاج. مەسنەدنشین: تەختنشین.
واتە: شایی دارە و گوڵ لە سەر تەخت دانیشتووە و پشکـووتووە. دەشت و دەر بـە فـەرشی زومرڕوتی خەمڵیوە و گوڵەسوورە تاجێك لە یاقووتی هێناوە.
(١٢) چاوەزار: دوعا بۆ بە چاوەوە نەبوون، ئایەتی «و إن یکاد الذین».
واتە: لە مەجلیسی گوڵی نەسرین و نەرگسدا بۆ چاوەزار وەنەوشە دەستك دەستك عـوودی هێناوە و لالەش ئاگردانی هێناوە تێیدا بسووتێنن تا ئەم هەموو گوڵە جوانە بە چاوەوە نەبن.

له مەیخانەی چەمەن بەزم و تەرەبیان گرت قەدەحنۆشان
شەقایق بادە، زەنبەق شیشە، نیرگس ساغەری هێنا(١٣)
له چەهچەی ساز و نەغمەی عەندەلیبان سووت هەموو دونیا
سەدایی تارزەن، ئاوازی خۆشخوان، ئاوری هێنا(١٤)
حیکایاتی غەریبی پێیە بولبول جوملە خۆکردی
دەڵێی چاپاری ئێران ڕۆژنامەی ئەختەری هێنا(١٥)
بە شەوقی ڕوویی لالە و گوڵ لە باغان وا چراغانە
دەڵێی باغی جینان ئەمساڵ بەری حۆر و پەری هێنا(١٦)
له گوڵشەندا ڕەیاحین مەست و شادابی هەوای خۆشن
دەڵێی ڕیزوانە بۆ ئەهلی بەهەشتی کەوسەری هێنا(١٧)

---

(١٣) بەزم و تەرەب: مەجلیسی کەیف و شادی. قەدەح نۆشان: مەی نۆشان، بادە بەدەستان.
واتە: لە نێو چەمەندا کە وەك مەیخانە وایە، بادەخۆرەکان مەجلیسی شادییان گرت و گوڵی مێلاقە شەرابی هێنا و گوڵی گەزیزە شووشەی هێنا و نەرگسیش پیاڵەی هێنا.
لەم بەیتەدا تەشبیهی گوڵەکان کراوە بە شەراب و شووشە و پیاڵەوە و هەروەها موراعاتی نەزیریش لە نێوانیاندا هەیە.
(١٤) عەندەلیب: بولبول. خۆشخوان: دەنگخۆش.
واتە: لە دەنگی بولبول و سازی مۆسیقا دونیا هەموو ئاگری تێبەربوو و دەنگی تارزەن و ژەنیار و نەغمەی خۆشی گۆرانیبێژ ئاوریان هێنا.
(١٥) غەریب: بێوێنە و نائاشنا. جوملە: هەموو. خۆکردی: ساختەی دەستی خۆی. چاپار: پۆستەچی. ڕۆژنامەی ئەختەر: یەکێکە لە قەدیمترین ڕۆژنامەکانی ئێران کە لە تاران دەردەچوو.
واتە: بولبول زۆر داستانی نەبیسراوی پێیە کە هەمووی خۆی سازی کردووە دەڵەی پۆستەچی ئێرانە و ڕۆژنامەی ئەختەری هێناوە کە خەبەرەکانی هەموو تازە و نەبیسراون.
(١٦) واتە: لە باغان لالە و گوڵ وا شەوق ئەدەنەوە و چراغانیان کردووە دەڵێی بەهەشت ئەمساڵ حۆری و پەری بەری باغەکەی بووە.
(١٧) ڕەیاحین: گیاکان. ڕیزوان: دەرکەوانی بەهەشت.

**شکۆفە و گوڵ بە خـەندە و عـیشوە ئـارامـی دەروونـیان دا**
**بەهار بۆ خەستەکانی خۆی چ شیر و شەککەری هێنـا؟[١٨]**
**بە زەرد و سـوورەوە خـەملیـوە بـۆ دامـادی بـولبول هـات**
**وەرەق میعجەر، ئەرز گوڵگوونە، شەونم زێوەری هـێنـا[١٩]**
**هەموو کەس چاوەڕوونی لێکدەکەن وەك سـورمەیان دیـبێ**
**مـەگـەر بـادی سـەبا خـاکـی گـوزاری دڵبـەری هـێنـا[٢٠]**
**چ دڵبـــەر؟ ئـــافتابی مـــاهڕوویـــان و شـــەکـــەر لێوان!**
**بە خەندێکی لە سەحرا گوڵ لە دەریـا گـەوهەری هـێنـا[٢١]**

---

☞

واتە: لەگوڵزاردا گیاکان هەموویان مەست و سەرخۆشن وەك ئەوە وایە گیاکان بەهەشتی بن و دەرکەوانی بەهەشت ئاوی کەوسەری بۆ هێنابێتن.

(١٨) واتە: غونچە و گوڵ بە پێکەنین و نازەوە ئارام و تەسکینی دڵن و بەهار بۆ بـریندارانـی خۆی عەجەب شیر و شەکەرێکی هێناوە.

پێکەنینی غونچە: پشکوتن. ڕازە (ئارایە)ی تەشخیس لە زۆربەی بەیتەکاندا هەیە.

(١٩) وەرەق: گەڵا. دامادی: زاوایی. میعجەر: ڕووسەری، لەچکە. گوڵگوون: سووراو و سپیاو کە ژنان ئەیکەن.

واتە: باخ بە ڕەنگی زەرد و سوورەوە جوان بووە و بولبول بووەتە زاوا و گەڵا ڕووسەری هێناوە و عەرز سووراو و سپیاوی بووکی دەدا و شەونم زێڕ و زیوی هێناوە.

ڕازە (ئارایە)ی موراعاتی نەزیری تێدایە.

(٢٠) چاوەڕوونی: موبارکبادی. سورمە: کل.

واتە: هەموو کەس لەم فەسڵەدا دەڵێی سورمەیان دیوە وا چاوەڕوونی بە یەکتر دەڵێن. ڕەنگە بای بەهاری خـۆڵی بـەرپێی یـاری هـێنـابێ کـە وەك کـل وایـە چـاوی ئـەو عـالەمەی ڕوون کردووەتەوە.

(٢١) ئافتاب: هەتاو، ڕۆژ.

واتە: تاوی بەهاری چ یارێکی دڵڕفێنە هەرکە پێکەنی هەتاو لە دەریا بارانی هێنا وەك گەوهەر لە سەحرادا گوڵی پشکوتان.

بە بێ شاباشی سەر، بە قسەی «وەفایی» گوڵچرا نابێ
کە بولبول هەر زمانی هەن، وەهە پەروانەش سەری هێنا(٢٢)

[ ١٥ ](١)

بۆ لەبی جانان ـ بە چاوت ـ من ئەوا بوومە کەباب
«دوستان ساقی کجا تا دردهد جام شراب؟»(٢)
شەو بە ڕۆژ ئالاوە یا سونبول لە دەوری بەرگی گوڵ؟
«یا پریشان گشته بر روی تو زلف پر ز تاب؟»(٣)
تا بزانن ڕۆژ و شەو هەردوو لەلایەك دێنەدەر
«زلف و روی خود عیان کن بر فکن بند نقاب»(٤)

---

(٢٢) شاباش: پارەیەك کە بدرێ بە بەزمگێڕی شایی. شاباشی سەر: لە جێی پارە سەربدەی بە شاباش.
واتە: گوڵ لە خۆڕا نابێتە چرا دەبێ سەری بە جێی شاباش پێشکەش بکا. بولبول هەر زمانی هەیە زۆر عاشقی ڕاستی نییە، پەروانە عاشقی ڕاستییە سەری بۆ شاباش پێشکەشی چرای گوڵ کردووە.

[ ١٥ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف.
ڕەدیفی نیە. واژەی قافیە: کەباب، شەراب، تاب، و...
تێبینی: ئەم غەزەلەش مولەممەعە، واتە: تێهەڵکێشێکە لە دوو زمانی کوردی و فارسی.
(٢) واتە: بۆ لێوی یار من بوومەتە کەباب و برژاوم، ئەی یاران! ساقی لە کوێیە تاجامێ شەراب تێکا چونکە من مەزەم.
(٣) واتە: ئەرێ ئەوە شەوە دەوری ڕۆژی داوە یان سونبوڵە دەوری باخی داوە؟ یاخۆ یارم زولفی بە ڕووی ڕوخساریدا پەرێشان کردووە؟
ئیستیعارە، تەشبیە و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.
(٤) واتە: بۆ ئەوەی خەڵکی بزانن شەو و ڕۆژ دەکرێ پێکەوە هەڵبێن، زولفەکەت و

**زەوقی خەندە و شەوقی جیلوەی تۆیە حەیرانم دەکەن**
**«شــــهد و شکــــر بــین کــه ریــزد از تکــلم آفــتاب»**(٥)
**ماچی لێوت ئەو دەمەی خۆشـە کـە بـێیـە پـێکـەنین**
**«خـوش بـود گـل بشکـفد بـلبل شـود زو کـامیاب»**(٦)
**مەوجی گریانم گـەیشتە ڕووی و چـاوی لێ نـەکـرد**
**«سیل بـر گـلشن زد و نـرگس نـمی‌خیزد ز خـواب»**(٧)
**لەو دەرە مەمکوژە چونکە شێتی زولف و ڕوویی تۆم**
**«عـاشقم صـید حـرم، سـودایـی و مست و خـراب»**(٨)

---

☞

ڕوخسـارەکەت پیشـان دە و پەچەکەت لادە، زولفەکەت دەبێتە شەو و ڕوخسارت دەبێتە ڕۆژ و پێکەوەشن.

(٥) زەوق: شادی. شەوق: نوور و شادی.

واتە: پێکەنین و نووری خۆپیشاندانی تۆ مەست و حەیرانم دەکەن، چاوکەن لە قسـەکـردنی هەتاوکە شەهد و شیرینی لێ دەتکێ.

آفتاب: ئیستیعارە لە دەمی یارە.

(٦) واتە: کاتێ پێدەکەنی ماچی دەمت خۆشە، دیارە کاتێ گوڵ دەپشکوێ بولبول بـەهرەی لێ وەردەگرێ.

تەشبیهی پێکەنینی یارە بە پشکووتنی گوڵ.

(٧) واتە: گریانی من وەك سێڵاو شەپۆلەکەی گەیشتە یار و تەماشای نەکرد و گوێی نەداێ، سێڵاو گوڵزاری خراب کرد کەچی گوڵی نەرگس هەڵناسێ لە خەوێ. یانی یارم چاو لە گریانی من ناکا.

«سَیْل»: ئیستیعارەیە لە فرمێسکی عاشق. «گلشن»: ئیستیعارە لە ڕوخساری یـارە. «نـرگس»: ئیستیعارە لە چاوی یارە.

(٨) «صید حرم»: نچیری دەوری ماڵی خوا، بێ گوناح.

واتە: لە دەرکەت مەمکوژە چونکە شێتی زولف و ڕوخسارتم، عاشق و مەست و خەرابم وەك نچیری حەرەم وام، گوناحە کوشتنم.

قــەت بــە مـفتی دامـەنێ ئـیدی «وەفـایی» فـرسەتە
«گــوشەی گــلزار و، جـام بـادە و، بـانگ ریـاب»[٩]

[ ١٦ ][١]

ئــەلئەمان ســەر تــا قـەدەم سـووتام و جـانانم نـەهات
چاو لە سورمەی خاکی ڕێ بووم، ڕاحەتی جانم نەهات[٢]
خاڵ و خەت گوڵزار و ڕەنگی شـۆخـی بـێباکـم نـەدی
زولف و ڕوو هیندوو فەڕەنگی شاهی خووبانم نـەهات[٣]
ئەی عەجەب گـریام وەکـوو هـەوری بـەهاران و کـەچی
پـێکـەنینی ئـەو گـوڵەی کـاکـۆڵ پـەرێشـانم نـەهات[٤]

---

(٩) بە مفتی دامەنێ: لە خۆڕایی مەیدۆڕێنە.
واتە: وەفایی عومرەکەت بە خۆڕایی مەدۆڕێنە ئیدی لەمەولا بچۆ گۆشەیەکی گوڵزار و جامی بادە هەڵدە و گوێ لە دەنگی مۆسیقا و ئامێری ڕوباب بگرە.

[ ١٦ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف.
ڕەدیف: نەهات. واژەی قافیە: جانانم، جانم خووبانم، و...
(٢) ئەلئەمان: هاوار، فریاد. جانان: یار، مەعشووق.
واتە: ئەی هاوار سەراپام سووتا و یار نەهات، چاوەڕێی خاکی سورمەئاسای بەرپێی یار بووم، هۆی ئیسراحەتی گیانم نەهات.
(٣) واتە: چاوەڕێی خەت و خاڵی ڕوخساری یاری نەترس بووم کەچی نەمدی و ئەو یارە کە پاشای جوانان و زولف و ڕووی وەك هیندوو و فەڕەنگی بوو نەهات.
لە نێوان زولف و ڕووی هیندوو و فەڕەنگیدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە.
(٤) واتە: عەجایەب ئەوەیە من وەکـوو هـەوری بـەهاری گـریام کـەچی ئـەو یـاری کـاکـۆڵ پەرێشانەی دەم بەپێکەنینەم نەهات.
لە نێوان پێکەنین و گریاندا تەزاد هەیە.

چاوی خوێنین غەرقی پەروین بوو لە بێ‌میهری گوڵم
مات و حەیرانم لەسەرچی ماهی تابانم نەهات؟[٥]
حەڵقەیی زوننارى زولفی بوو بە میحرابی دوعام
تورکی کافرکێش و یاری ناموسوڵمانم نەهات[٦]
تەشنە لەب دێوانە بووم، سەرگەشتەیی زوڵماتی غەم
دڵبەری بالا بڵندم، ئابی حەیوانم نەهات[٧]
کەعبەیی ڕۆحم، حەبیبی من، عەجەب پەیدا نەبوو
قیبلەکەی دینم، تەبیبی دەردی پەنهانم نەهات[٨]
نەی سیفەت نالینمە، بولبول تەریقەت شینمە
شای شەکەر لێوان گوڵ و ئەگریجە لەرزانم نەهات[٩]

---

(٥) پەروین: نێوی ئەستێرەیەکە. ئیستیعارە لە فرمێسکە.
واتە: چاوی سوورم لە فرمێسکی وەك ئەستێرەی پەروین ڕووندا غەرق بووکەچی ئەو یارە کە وەك ماهی تابانە هەڵنەهات.
(٦) زوننار: پشتوێن یا ملبەندێ کە خاجی مەسیحی پێوە بەسراوە لە عیرفاندا نماد و ڕەمزی کوفر و دڵڕەقییە.
واتە: میحرابی دوعای من ئەڵقەی زولفی ئەو بووکەچی ئەو تورکە کافر ئەخلاقەی ناموسوڵمانە هەر نەهات.
لە نێوان کافر و زوننار‌دا تەناسوب هەیە.
(٧) واتە: یارم کە بالا بەرزە و وەك ئاوی حەیات گیانبەخشە من بە تینوویی لە تاریکستانی غەمدا چاوەڕێ بووم نەهات.
لە نێوان تەشنە و ئاوی حەیات و زوڵماتدا تەناسوب هەیە.
(٨) واتە: یارم کە وەك قیبلەی ڕۆحمە نەهات، ڕووگەی دینمە و حەکیمی دەردی پەنهانیم دیار نییە.
(٩) شای شەکەر لێوان: ناوی ڕەمزی یاری وەفاییە کە زۆرجار بەم تەرکیبە ناوی دەبات. ئەگریجە لەرزان: زوڵفی هەر دەلەرێتەوە.

**بوو بە خوێن غونچەی دڵم، نەمدی هەوای خەندەی گوڵم**
**سووت دەر و ژوورم، سەدای بەرقی بەهارانم نـەهات[١٠]**
**چەند بە چەند گریام هەوای عیشقم لەسەر خـاڵی نـەبوو**
**غەرقی تۆفان بووم کەچی تەسکینی سووتانم نەهات![١١]**
**وەك «وەفـایی» تـا بـەکـەی بگـریم بـناڵێنـم بـڵێم:**
**ئەلئەمان سـەر تـا قـەدەم سـووتام و جـانانم نـەهات[١٢]**

••••••• ━━●━━ •••••••

**[ ١٧ ][١]**

**نـیگارا ئـەی بـە غـەمزە ئـافەتی دڵ، چـاوی بـیمارت**
**ئەمان سەر تا قەدەم سووتام لە دووری نووری دیدارت[٢]**

---

☞

واتە: وەك نەی دەناڵم و وەك بولبول شین و گریان دەکەم کەچی ئەو یارەم کە شای لێو شیرینانە نەهات.

(١٠) واتە: دڵم کە وەك غونچەیەك بوو، بەجێی پشکووتن بوو بە خوێن و نـەمدی شـەماڵی گوڵخەندەی یارم؛ من دەر و ژوورم سووتا کەچی هەورەگرمە و بارانی ڕەحمەتی یار هەرنەهات.
لە نێوان غونچە و پێکەنین و بەرقی بەهاراندا تەناسوب هەیە.

(١١) چەند بە چەند: زۆر، قەیدی میقدارە.
واتە: زۆر گریام هەوای عەشق لە سەرمدا خاڵی نەبوو، غەرقی تۆفانی فرمێـسك بووم کەچی گریانەکەم تەسکینی نەدام، یان یارکە هۆی تەسکینمە هەر دیار نەبوو.

(١٢) واتە: تاکەی وەك وەفایی هەر بەگریان و ناڵەوە بڵێم ئەی هاوار لە سەر تا پام سووتا و یار نەهات.
لە ئاخرین بەیتی تەخەللوسدا وەفایی «رد المطلع» یان «رد العجز إلى الصدر»ی کردووە.

**[ ١٨ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: بیمارت، دیدارت، گوڵزارت، و...

(٢) واتە: ئەی یاری جوان! چاوی نەخۆشت بـە غـەمزە ئـافەتی دڵە و تـەواوی ئـەندامـم لە دووری نووری دیدارت سووتاوە.

دەســـا ڕوحـــمێ وەفــادارم! بـــە حــاڵی داد و هــاوارم
کــە وەك بــولبول دڵی زارم دەنــاڵێ بــۆ گــوڵی زارت[٣]
سەرم ناوێ ئەگەر نەیخەم بە حەڵقەی پەرچەم و چاوت
دڵم ناوێ ئەگەر نەیکەم بە فیدیەی چاوی عـەییارت[٤]
ئەسیری زولفی خاوی تۆم، شەهیدی ڕەمزی چاوی تۆم
ئەمن گیراوی داوی تۆم، لە سەد جــێ دڵ بـریندارت[٥]
شــەهیدی نــازی تــۆم و داغـداری بـاغەبان ئـەی گـوڵ
لە دووری تۆ بـناڵم؟ یـا لەســەر بـێدادی ئـەغیارت؟[٦]
ئەمن نـەمدیوە هـیندوو بـاغەبانی بـاغی جـەننەت بـێ
بە شـیرینی چ دڵکـێشـە؟ بـنازم خــاڵی ڕوخســارت[٧]

---

(٣) واتە: ئەی یاری وەفادارم ڕەحمێ بە داد و هاوارم بکە و دڵی غەمناکم بۆ گوڵی دەمی تۆ وەك بولبول دەناڵێ.
لە نێوان زار و زاردا جیناسی تەواو هەیە.
(٤) واتە: ئەگەر سەر نەبێتە پەرژین و سپەری بەڵای پەرچەم و چاوت نامەوێ هەر وەك چۆن دڵیش ئەگەر نەبێتە فیدیە چاوی نەخۆشت نامەوێ.
لەم بەیتەدا ڕازە (ئارایە)ی موازەنە هەیە.
(٥) واتە: ئەمن ئەسیری زولفی خاوی تۆم و بە غەمزەی چـاوت شـەهید کـراوم و بـە داوی زولفت گیراوم و لە سەد لاوە دڵمت بریندار کردووە.
(٦) بێداد: زوڵم. ئەغیار: بێگانە.
واتە: بە نازی تۆ شەهیدم و داخی باخەوانەکەت لە دڵمدایە نازانم لە دووری تۆ بـناڵم یـا لە زوڵمی بێگانەکانت.
(٧) هیندوو: ڕەشپێست، ئیستیعارە لە خاڵی یار.
واتە: ئەمن نەمدیوە ڕەشپێست باخەوانی باخی بەهەشت بێ، واتە: ڕوخساری یار شەرەف و شانازی بە خاڵی تۆوە ئەکاکە چەندە شیرین و دڵڕفێنە.

لەلایـــێ شـــەککــەرستانە، لەلایـــێ ئـــابی حـــەیوانـە
ئەگەر گوڵ بێ ئەگەر غونچە، لەب و زاری شەکەربارت[٨]
«وەفایی»، دوور لە وەسڵی تـۆوە پـابەندی تـەلیسمێکـە
لەسەر گەنجی جەماڵت کەوتە داوی زولفی ڕەشمارت[٩]

## [ ١٨ ][١]

دیســان بــە هــەوری نــیسانی دونــیا ڕەنگــی ژەنگــاری گــرت
گوڵ زەرد و سوور هاتە دەرێ دەشت و سەحرا و کۆهساری گرت[٢]

---

(٨) واتە: لێوی دەمی شەکرینت لە لایێ شەکەرستانە و لە لایێ ئاوی حەیاتە.
لەف و نەشری تێدایە.

(٩) گەنج: خەزێنە. تەلیسم: نەقشە و خەریتەی گەنج. ڕەشمار: دەڵێن مـار هـەمیشە لە سـەر گەنج خەوتووە، ئیستیعارە لە زولفی یارە.
واتە: وەفایی دوور بێ لە تۆ ئەسیری نەخشەی گەنجێکە ئەویش جوانی تـۆیـە و بـە دەست ڕەشماری زولفتەوە ئەسیر بووە.
لە نێوان گەنج و تەلیسم و ڕەشماردا تەناسوب هەیە.

[ ١٨ ]

(١) کێشی شیعر: ئەم کێشە زۆر خۆماڵی و کوردییە، بە عەرووز دەبێتە: «مفعولاتن مفعولاتن مفعولاتن مفعولاتن» بەحرێکی نایابە تایبەتی گۆرانییە. ڕەدیف: گرت. واژەی قافیە: ژەنگاری، گوڵناری، تاری، و...

(٢) نیسان: هەوەڵ مانگی بەهار، ١٢ی خاکەلێوە تا ١٠ی گوڵان. ژەنگـار: ڕەنگـی سـەوزی مەیلەو شین، کە بە فارسی پێی دەڵێن: شنگرف.
واتە: هەمدیسان سەحرا بە هەوری بەهاری دونیای سەوز و ڕەنگامە هەڵگەڕان و گوڵی زەرد و سوور هاتنە دەر و کۆسار و سەحرایان داگیر کرد.

**دیســـان بـه نـەغمەی زیـر و بـەم، بـولبول دەڵێ بـه دەرد و غــەم**
**لە تاوی غونچەی گوڵ بەدەم، ساز و سـەمتوور و تـاری گـرت(٣)**
**بــەو خـــاترەی گــوڵ دەرکـەوێ، بـە خـەندە هـەستێ لە خـەوێ**
**هـەوری بـەهاری نـاسرەوێ، شـێوەی عـاشق و دڵداری گـرت(٤)**
**گوڵ لە باغاندا جـۆشـاوە، ڕەنگ ڕەنگ سـەف سـەفیان کـێشـاوە**
**لالە دەڵێی دڵ ئـــێشـــــاوە، کــــەناری جــۆیــباری گـــرت(٥)**
**ســەدای ســێ تــا لەو خــوارە دێ، ئـاهەنگی تــارە دیـارە دێ**
**یا سەوتی قومری و سارە دێ؟، بەزمیان ڕووی گـوڵزاری گـرت(٦)**
**بــولبول هـــاتبوە حـــاڵی مــردن، بــەرگی غــونچەی وەلا بـردن**
**تـــا تـێر دەبـێ لە مـاچ کـردن، خـار گـەردەن و بـازاڕی گـرت(٧)**
**لالە ســـەرتاپێی خـــوێنـــاوە، جـەرگی بـە چـەند جـێ سـووتاوە**
**دڵی هەروەك مـن شـێواوە، داغـی زولف و ڕووی یـاری گـرت(٨)**

---

(٣) زیر و بەم: دەنگی زیك و بۆڕ.
واتە: بولبول دیسان بە نەغمەی بەرز و نەویدا کەوتە ئاواز خوێنـی لە حـەسرەت و عـەشقی غونچەی گوڵ بە دەم و ساز و سەمتوور و تاری گرت بە دەستەوە بووبە مۆسیقا ژەن.
لە نێوان زیر و بەم و ساز و سەمتوور و تاردا تەناسوب هەیە.
(٤) واتە: لەبەر ئەوەی گـوڵ دەرکـەوێ و بـە خـەندەوە لە خـەو هـەستێ، هـەوری بـەهاری ناسرەوێ و عاشق و دڵدار هەر لە چالاکیدایە.
ڕازە (ئارایە)ی تەشخیسی تێدایە.
(٥) واتە: گوڵ لە باخدا خرۆشاون و بە ڕیز ڕاوەستاون. گوڵی لالەش وەك زیزبوو و دڵئێشاو بە تەنیا لە قەراخی جۆگە جێگیربوو.
(٦) دەنگی ئامرازی مۆسیقای سـێ تـایی و تـار دێ، یـان دەنگـی قـومری و بـولبولە لە نـاو گوڵزاردا مەجلیسیان گرت بۆ شادی و بادە نۆشی و ئاواز خوێنی.
(٧) واتە: زەمانی زستان بوو دەورەی دڕك بوو بازاڕ و وڵاتی گرتبوو و بولبول لە حاڵی مردندا بوو، ئەوا چارشێوی گوڵی لادا تێر تێر یاری ماچ دەکا.
(٨) داغ: ڕەشایی نێو گوڵی هەڵاڵە و مێلاقە.

**هـەتا نـەگـریم نـەڕوا سـەبرم، دامـانی یـار کـەنگێ بگـرم**
**لەبـەر عـەمری قـومری بـمرم، سـەروی لە نـێو کـەناری گـرت(٩)**
**یـاران نـەکـەن بـازی نـەزەر، بـەردەنە سـەیدی بـازیکەر**
**زۆرم دی بـازی بـێ‌خـەبەر، شـابازی دەوڵەت یـاری گـرت(١٠)**
**ڕۆژێکـی پـیری مـەیکەدە، فـەرمووی: دڵت بـە هـیچ مـەدە**
**ئـەو دڵە پـڕ لە مـەفسەدە، عـەکسێکـی ڕووی دڵداری گـرت(١١)**
**غـافڵ بـووم جـارێ لە نـەکـاو، ڕەنگـی غـەیرێکـم کـەوتە چـاو**
**قـەلبی سـەلیمی نـاتەواو، نـەخۆش بـوو لێم ئـازاری گـرت(١٢)**

---

☞
واتە: گوڵی لالە جگەری سووتاوە و داغ بووە و سەراپا غەرقی خوێن بووە، دەڵێی ئەویش وەك من شێواوە و لە حەسرەت زولف و ڕووی یار داغدارە.
(٩) لە نێو کەنار گرتن: لە ئامێز گرتن، لەباوەش گرتن.
واتە: هەتا نەگریم و بێ‌سەبری نەکەم کوا دەستم بە داوێنی یار دەگا، خۆزگەم بە حاڵی قومری کە باوەشی بە داری سەوڵدا کردووە و بە ویسال گەیشتووە بە هۆی گریانە.
(١٠) بازی نەزەر: تیژ ڕوانین، تەماشا کردن وێچواوە بە باڵندەی باز، لە عیرفاندا نەزەربازی هەیە وەك حافیز دەڵێ: «در نظر بازی ما بی‌خبران حیرانند». سەید: نەچیر. بازیکەر: یاریکەر، تەقلەباز، دەمدەمی و بێ‌مەرام.
واتە: ئەی یاران ئەمان مەعشووقی دەمدەمی و نەفام مەگرن و چاو لە شتی نەزان مەکەن زۆرم دیوە ڕاوچی نائاگاهـعاشقی شابازی دەوڵەت و بەخت بووە و بووەتە یاری. واتە دنیا لەگەڵ نەفامانە.
(١١) پیری مەیکەدە: شێخ، مورشید.
واتە: ڕۆژێکی مورشیدم دەیگوت: دڵت هێندە وابەستەی مادیات مەکە، ئەو دڵە پڕ لە خەتای منە بەو نەسیحەتی مورشیدەیە وێنەی یاری لە نێودا زاهیر بوو.
(١٢) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی تەواوکەری بەیتی پێشوون، واتە: دوای ئەو نەسیحەتە، لە دەورانی غەفڵەتدا جارێك غەیری مەحبووب کەسێکی‌ترم کەوتە بەرچاو، دڵم کە لە پێشـدا سالم بەڵام کامڵ و پوختە نەبوو نەخۆش کەوت و ئازاری دام. یانی دەبێ سالیك تەنها دڵ بە یەك مورشیدی بدات.
ئەم چەند بەیتە سەراپا عیرفانییە مانای هیرمۆنۆتیکی هەیە دەبێ تەئویل بکرێ.

**کــاری دڵم چـــل ڕۆژە بــوو، نـــەك بــێکـــاری و دەرۆزە بـــوو**
**مەقسوودی مـن پـیرۆزە بـوو، ئـەو ڕۆیـی بـووتیماری گـرت(١٣)**
**ئـــەو نـەفسی بـێ‌هـەوایـی مـن، سـەرکەش بـوو بـێ‌ڕەزایـی مـن**
**جـــامی جـــیهاننومایی مـن، سـەرزەدە بـوو غـوباری گـرت(١٤)**
**لەســـەر تـــاقی بـــرۆی جـــانانە، شـــەیدای زولفـــی پـــەرێشـانە**
**سـەوداسـەر ئـەو دڵ دێوانـە، قـیبلەی بـەردا زونـناری گـرت(١٥)**
**پـیری مـن و دۆسـتی خـودای، ڕۆحـم فـیدای شـەرت و وەفـای**
**دیسان لەبـەر نـووری زیـای، هـەردوو دونـیا ئـەنواری گـرت(١٦)**

---

(١٣) پیرۆزە: باڵدارێکی چیرۆکییە دەڵێن بەسەر هەرکەسدا سێبەر بکا دەبێتە پادشا، هـوما. بووتیمار: باڵندەیەکە هەمیشە تینووە و نـمادی حـەسوودی و بـەخیلییە. چـل ڕۆژە: چـلە کێشان، ڕیازەت کێشان. دەرۆزە: دەریۆزە، وشەیەکی فارسییە واتە: سواڵکردن.
واتە: دڵی من دەبوا چلەکێشی بکا تا پاك بێتـەوە نـەك خـەریکی سـواڵکـەری و تـەنبەڵی و بێ‌کارەگی بێ، قەسد و هەدەفی من باڵندەی هوما بووکەچی ئەو عاشقی باڵندەیەکی خەسیس و نەزان بووە، واتە دنیایی «حب الدنیا».
(١٤) بێ‌هەوا: سەرکێش. جامی جیهاننوما: نومادی دڵە، دڵی عاشق.
واتە: ئەو نەفسە سەرکەشەی من بە بێ‌ڕەزا بوونی من کەوتە نافەرمانی بۆیە دڵیشـم کـە وەك ئاوێنەی جیهانبینی جەمشیدی جەم هەموو شتی دەدی، غوبار و تۆزی گوناه گرتی. حافیز بۆ ئەو تەشبیهی جامی جیهانبینە کە دڵە دەفەرمێ:
«سال‌ها دل طـلب جـام جـم ازمـا مـی‌کرد    و آن‌چه خود داشت ز بیگانه تمنا می‌کرد».
(١٥) جانانە: مەعشووقی ئەسڵی، خودا. زولفی پەرێشان: گیروگرفتی دنیایی. زوننار: پشتوێن یا ملوانکەی مەسیحییان.
واتە: ئەو دڵە بێ‌عەقڵەی من بەسەر تاقی برۆی یاری ئەسڵیدا چوو عاشقی زولفی پەرێشان بوو، شێت و سەودا سەرە دڵم کە قیبلەی وێڵ کردووە عاشقی پەتی مەسیحییان بووە.
برۆ بە قیبلە شوبهاوە و زولفی یار بە زوننار.
(١٦) لەم بەیتەدا ئیدی مەعلووم دەبێ قەسیدە بەهارییەکە وەردەگەڕێ بە عیرفانی، وەفایی ڕوو دەکاتە شێخەکەی و دەڵێ:

لەو ســـــەهبایە ڕۆحـــــی دڵە، ئـــــارەقی ڕووی بـــەرگی گـــوڵە
زانـــــی دڵم بــــێ حـــاسڵە، دەســـتی دڵی بـیماری گـــرت(١٧)

لەســـــایەی ڕۆژی هـــیممەتی، «وەفـــایی» بـــوو بــــە جــــەننەتی
نەخلی سنەوبەر سـوورەتی، بـار بـار بـەری گـوڵنـاری گـرت(١٨)

•••••••——⬤——•••••••

[ ١٩ ](١)

گـــوڵەنـــدام ئــەی تـــەنافی گـەردەنم زولفـی پـەرێشـانت
عیلاجێ! چارەیێ! ڕوحمێ! ئـەمان دەسـتم بـە دامـانت(٢)

---

☞

تۆ پیرو مورشیدی منی و دۆستی خوداشی یارەببی بە قوربانی شەرت و وەفاداریت بم لەبەر نوور و ڕووناکی تۆ هەر دوو دنیا نووری تێ کەوتووە.

(١٧) سەهبا: جامی شەراب، لە عیرفاندا بە قسەی مورشید دەڵێن.

واتە: ئەی پیری ڕێنومای من! لەو قسانەی تۆ کە وەك عارەقی بەرگی گوڵ پیاو مەست دەکەن، بەشت داوم دەزانم دڵم هیچ دەستمایە و مەحسولێکی نییە، دەستت گرت و لە نـەخۆشـی چاکت کردەوە.

(١٨) واتە: لە سایەی هیممەتی وەك ڕۆژ ڕووناکی ئەو مورشیدە (شێخ عوبەیدیللا)، وەفایی بوو بە ئەهلی بەهەشت، داری خورمای قەدی کە وەك سنەوبەر بوو کۆڵ بە کۆڵ سەمەری گوڵ و هەناری گرت و بە ئاکام گەیشت.

ئاخری ئەم قەسیدەیە بە ڕاستی عـیرفانی بـوو، ئـەمانە تـەئویلی مـن بـوو لە ڕووی ئـەدەبی عیرفانی فارسییەوە کە وەفایی زۆری بەهرە لێ وەرگرتن، هەرچەند مانای دیکەش هەڵدەگرن من هەر ئەوەندەی تێ گەیشتووم.

[ ١٩ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: پەرێشانت، دامانت، موژگانت، و...

(٢) واتە: ئەی یاری گوڵئەندام زولفی پەرێشانی تۆ وەك تەنافی خنکاندنی ملی منە، دەستم بە دامانت عیلاجێ ڕوحمێکم پێ بکە.

**غەریبی تۆم، نەخۆشی تۆم، بـە گـۆشـەی چـاوی بـیمارت**
**ئەسیری تۆم، شەهیدی تۆم، بە نـووکی تـیری مـوژگانت[٣]**
**ئـــیشارەت ئـــافەتی ڕۆحـــم، کـــەلامت غـــارەتی دیـــنم**
**تەبەسسوم سیحری لێوانت، تەکەللوم ڕەمـزی چـاوانت[٤]**
**مەگەر سەر تـا قـەدەم زولفت وەکـوو مـن خـاو و شـێواوە**
**کە سەرگەردان و سەودایـە لە سـەر چـاکـی گـەریبانت؟[٥]**
**دەڵێی شــەککـەر فـرۆشـی شـاری مـیسرە وا بـە شـیرینی**
**بنازم! خـاڵی وەك هـیندوو لە گـۆشـەی لێوی خەندانت[٦]**
**ئەگەر دڵ بوو ئەگەر دین دام بە سورمەی چاوەکان، ئـیدی**
**بەسم سەودازەدە و ڕیسواکـە، تـۆبـی و دیـن و ئـیمانت[٧]**
**تــەلیسمی بــابلە، ســیحری حــەڵاڵە، ڕەنگــی ڕێحــانە**
**شکەنج و بەندە، یـاخۆ جـێ‌دڵانـە زولفـی سـەرشانت؟[٨]**

---

(٣) واتە: بە گـۆشـەی چـاوی بـیمارت غـەریب و نـەخۆشت خـستووم و بـە نـووکی تـیری موژگانت ئەسیر و شەهیدت کردووم. دەشکرێ بڵێین: بە چاو و بە موژگانت قەسەم غەریب و شەهیدی تۆم، کە ئەو زۆر مەعانییە هونەری شاعیرە.

(٤) کە ئیشارەم لێ‌دەکەی ئافەتی ڕۆحمە و کە قسەم لەگەڵ دەکەی دینم بـە تـاڵان دەبـەی، بزەت ڕەمزی لێوتە و قسەکردنیشت بە ئیشارەی چاوانتە.

(٥) واتە: مەگەر تەواوی ئەندامی زولفت وەك من شێواوە کـە لەسـەر درزی یـەخەی تـۆوە سەرگەردان و بڵاو بۆتەوە.

(٦) بنازم: ئافەرین، بارەکەڵڵا.
واتە: ئافەرین بۆ خاڵی سەر لێوت کە دەڵێی شەکەر فرۆشی شاری میسرە و شـیرینی لێوت دەفرۆشێ.
لە کۆنەوە شەکەری شاری میسر ناودار بووە.

(٧) واتە: تۆبی و دین و ئیمانت کەمم شێت کە، دین و دونیام ئەگەر هـەبوو هـەردووکم بـۆ سورمەی چاوی تۆ دا.

(٨) واتە: ئەرێ ئەو زولفەی سەرشانت تەلیسمی بابلە یان سیحرێکی حەڵاڵە و خـودایـیە،

بە ئازادی لە کن خۆی شوهرەیە، من مات و حەیرانم
گوڵ و نارنجی بەر هێناوە خۆ سەروی خەرامانت(٩)
لەبەر چاوت بگریێم، یا لە دەست تۆ داد و هاوار کەم؟
لەبەر نەیرەنگی مەستان؟ یا لە سیحری ڕەنگی دەستانت؟(١٠)
دڵم سەودازەدەی باڵاتە، خۆم دڵدادەیی ئەبرۆت
بە باڵا دڵ بەلا گێڕت، بە ئەبرۆ خۆم بە قوربانت
لە دادی من بپرسە جارێ ئەی سوڵتانی عیشوە و ناز
بە ناحەق بۆچی بمکوژێ ئیشارەی چاوی فەتتانت؟(١١)
«وەفایی» کەوتە حەڵقەی زولفت، ئیدی مەیدە بەر موژگان
کە من کوشتەی تەنافت بووم، چ لازم تیرە بارانت؟(١٢)

---

☞

یان ڕەنگی ڕێحانەیە؟ یان بەند و ئەشکەنجەیە؟ یان نە، جێی دڵی عاشقانتە؟
ڕازە (ئارایە)ی «تەجاهولولعاریف» و تەشبیهی زولفی یار بە تەلیسم و شیعر و ڕێحانەی تێدایە. سیحری حەڵاڵ لە فارسیدا بە شیعر دەڵێن.
(٩) واتە: داری سەوڵ لای خۆی بە ئازادی مەشهوورە کەچی من پێم سەیرە بەژنی وەکوو سەوڵی تۆ بۆچی نارنج و لیمۆی گرتووە؟
گوڵ و نارنج: ئیستیعارەیە لە کوڵم و مەمکی یار.
(١٠) مەستان: ئیستیعارەیە لە چاوی یار. دەستان: حیلە و حوققە و فێڵبازی.
واتە: نازانم لەبەر مەکری چاوی مەستت دەست بە گریان کەم؟ یان لە دەست فێڵ و جادووت دەستکەم بە ناڵە و هاوار؟
دەستان و نیرەنگی هاومانان. ڕەنگی دەستان: بە خەنەی دەستیش مانا دەدا. نیرەنگ و ڕەنگ جیناسە. وە ئیهامی مانایی لە دەستاندا هەیە.
(١١) واتە: ئەی پادشای عیشوە و ناز لە شکایەتی من بپرسە ئەو چاوەت بۆ خۆڕایی من بکوژێ.
(١٢) واتە: وەفایی کە ئەسیری ئەڵقەی زولفتە ئیدی بە تیری مژۆڵەکانت مەیکوژە، من کە بە پەتی سێدارەی زولفتەوە هەڵواسراوم ئیدی تیرەباران کردنم کوا پێویستە؟

[٢٠][١]

یــار هــاتە تــەبەسسوم بــە هــەناسەی مـنی مـەبهووت
گوڵ گوڵ بە نەسیمی سـەحەری غـونچە دەپشکـووت[٢]
وا زولفـــی لەســەر گــەردەنی لاچــوو بــە هــەناسەم
شەو فەجری بەیان بوو کە نەسیمی سـەحەر ئـەنگووت[٣]
هــارووتــی دڵم هــات و لە چــاهی زەنــەخت کــەوت
سەرگەشتە لە دووی غەمزە بە دوو نـێرگسـی جـادووت[٤]
ئـــەبرۆت مـــەدەدی زولفــە بــە کــێشــانی دڵانــدا
بــۆیــێکــی وەهــا خــەم بــووە شـاهێن و تـەرازووت[٥]

---

[٢٠]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیلن فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. رەدیفی نییە. قافیە: مەبهووت، دەپشکووت، ئەنگووت، و...

(٢) مەبهووت: سەرلێ‌شێواو، داچڵەکاو.

واتە: یار بە هەناسە و ئاهی منی داچڵەکاو و خۆلێ‌ونبوو، هاتە بزە و پێکەنین، وەك بە نەسیمی سەحەری کۆمەڵ کۆمەڵ و یەکەیەکە غونچە دەپشکوێ، ئاوا دەم و لێوی کرایەوە.

تەشبیهی موزمەری پێکـەنینی یـار بـە پشکـووتنی غـونچە و هـەناسەی خـۆی بـە نـەسیمی سەحەری، بەیتەکەی بەقەوەت کردووە.

(٣) واتە: بە هەناسەی من زولفـی لەسـەر مـلی وەلادا هـەر دەتگـوت شـەوگار تـەواو بـوو، نەسیمی سەحەری و بای بەرەبەیان هات و شەو ڕووناك بوو.

تەشبیهی مورەککەب لەنێوان لاچوونی زولف لە سەر مل و هەناسە و هاتنی بەیانی و ڕوون بوونەوەی شەودا هەیە.

(٤) هارووت: وا مـەشووره دەڵێن هـارووت و مـارووت دوو فـریشتەن کـە لە چـاڵی بـابلدا هەڵواسـراون، کـەوتنە سـیحر و جـادووی ئافرەتێ بـە نـاوی نـاهید کـە ئـەو نـاهیدە بـوویە ئەستێرەیەك لە ئاسمان، تەلمیحە بەو مەسئەلەیە.

واتە: دڵم وەك فریشتەی هارووت هات و لە حەیبەت دوو چاوی جادووگەرت سـەرگەردان بوو و کەوتە نێو چاڵی چەنەت.

(٥) شاهێن و تەرازوو: بە دوو دەندووکی تەرازوو دەڵێن، هـەر چـاوی یـار و بـرۆکـەی وەك

☜

**سەف بەستە هەموو مونتەزیری ئەمرو نیگاهن:**
**قوللابی موژەت، زولفی ڕەشت، گۆشەیی ئەبرووت**(٦)
**هەریێکی لەلایێ بە تەمای قەتلی «وەفایی»ن:**
**تابووری حەبەش، لەشکری چین، عەسکەری هیندووت**(٧)

•••••••—●—•••••••

**[ ٢١ ]**(١)

**بەس بێ جیلوەی زولف و خاڵان! عاشقی ڕوخساری خۆت**
**ئاڵ و واڵای خولدی ناوێ تالیبی دیداری خۆت**(٢)

---

☞

لایەکی تەرازووکە ڕێك نەبێ دیارە میزان نییە.

واتە: برۆت هات لە جەزبی دڵاندا کۆمەکی زولفت بکا بۆیە چاوەکانت وەك تەرازوو لەبەرانبەری یەکدا نەماون.

برۆ تێکچوون: کینایەیە لە تووڕە بوون.

(٦) سەف بەستە: ئامادەی هێرش. ئەمر: فەرمان. نیگاه: چاو لێکردن.

واتە: تۆ وەك فەرماندەیەکی نیزامیت، گۆشەی چاوت و برۆت و مژۆڵت وەك قولاب حازرن، ئەتۆ فەرمان دەرکەی و ئەوان خەڵکی بکوژن.

(٧) تابوور = «طابور»: چالاکی سەربازی، ڕژەی نیزامی. لەشکری چین: ئیستیعارەیە لە برۆ و مژۆڵی یار. عەسکەری هیندوو: ئیستیعارە لە خاڵی یارە.

واتە: بۆ کوشتنی وەفایی هەرکام لەلایەکەوە خەیاڵیان هەیە: تابووری حەبەش (واتە زولفەکانت) لەشکری چین (واتە مژۆڵ و برۆت) عەسکەری هیندووت (واتە ڕیزە خاڵانت). لە نێوان تابوور، لەشکەر، عەسکەر، چین، هیندوو و حەبەشدا موراعاتی نەزیر هەیە.

**[ ٢١ ]**

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف: خۆت. واژەی قافیە: دیداری، ئەنواری، بازاڕی، و...

(٢) واتە: ئەوەندە زولف و خاڵانت دەرمەخە و خۆت مەنوێنە کەسێ عاشقی تۆ بێ سەیری زولف و خەت و خاڵ ناکا. وەك چۆن دینداری واقیعی بۆ ئاڵ و واڵا و زرق و برقی بەهەشت خوداپەرستی ناکا.

**نــامەوێ عــەیشی جــیهان حــاشا لە فــیردەوسی بــەرین**
**تۆی مورادی دین و دونیام، ناری خۆت، ئەنواری خـۆت(٣)**
**گاھ بە یـاری، گـاھ بـە دیـدار، دڵ دەکـێشـی، دیـن دەبـەی**
**هەر دەمەی نـەوعێ ڕەواجـی پـێ دەدەی بـازاڕی خـۆت(٤)**
**گـاهێ مـوتریب گـاهێ سـاقی، مـن فـیدای زولف و ڕوخت**
**کوفر و ئیمان لێکدەدەی سەرخۆش بە نەغمە و تاری خۆت(٥)**

---

(٣) واتە: من عەیش و خۆشی دونیام ناوێ بە هەشتیشم ناوێ هەدەفی دیـن و دونـیای مـن تۆی، هەم نوورمی هەم نارمی.

لێرەدا بەحسێکی قووڵ هەیە لەبەینی جیهانبینی عیرفانی و ئیسلامی، شیکردنەوەی دەوێ، هەندێ لە عارفان دەڵێن ئەوەی لە ترسی جەهەننەم و عەزاب خوداپەرستە، ترسنۆکە و ئەوەی بە ئومێدی بەهەشت و حۆری خوداپەرستە تەمەعکارە، وە ئەوەی هیچیانی ناوێ و عاشقی خودایە عارفە. مەلایکە لە نوورن و جنۆکە لە نارن، عارفی واقیعی نە بە هیوای نوورە و نە لە ناریش ئەترسێ بۆ ئەوان مورادی ئەسڵی ئەڵڵایە، جا لێرەدا وەفایی ئەم بابەتە عـیرفانییە بـە سەبکی حافیز و سەعدی ئاوا بەیان دەکا. سەعدی دەڵێ:

مـی بـهشت نـنوشم ز جـام سـاقی رضـوان　　مرا به باره چه حاجت که مست بوی تو باشم
حـدیث روضـه نگـویم گـل بـهشت نـبویم　　جمال حور نجویم دوان به سوی تـو بـاشم

(٤) یاری: شۆخی، کایە، کۆمەك، هاوەڵی.

واتە: جاری وایە بە یاری و شۆخی و هـاوەڵی دیـن و دڵ غـارەت دەکـەی جـاری وایـە بـە خۆپیشاندانت دڵی عاشق دەڕفێنی، هەر دەمەی جۆرێ بازاڕی مشتەرییەکانی خـۆت گـەرم دەکەی.

(٥) واتە: جارێ موتریبی و جارێ ساقیت، من بە فیدای زولف و ڕوخسارتبم کوفر و ئیمان پێکەوە تێکەڵ ئەکەی، بەو نەغمە و ئاوازەی خۆت.

زولف = کوفر. ئیمان = ڕوخسار. من پێمواپە ئەم بەیتە عیرفانییە، چونکە وەفایی هاوعەسری هاتف بووە و لەو سەردەمەدا ئەم شیعرە زۆر مەشهوور بووە:

هــاتف اربـاب مـعرفت کـه گـهی　　مست خوانندشان و گـه هـوشیار
از مـی و جـام و مـطرب و سـاقی　　وز مـغ و دیـر و شـاهد و زنـار

☜

**زولفەکـان دێنـی و دەبـەی بـێ‌غـەم لە کـوشتەی چـاوەکـان**
**شەو دەچێ ڕۆژ دێ دەمێکی نـایێ سـەر بـیماری خـۆت**(٦)
**هــەر ڕەگــێکــم دەنگ و ئـاوازێکـی لێ دێ پـڕ خـورۆش**
**ئــاورت بــەرداوەتــە عــالەم بــە مــۆسـیقاری خـۆت**(٧)
**بــا بــەجارێك تـێكنـەچێ کـاری دڵ و دیـن، ڕۆحـەکـەم،**
**وا پــەرێشــانی مــەفەرموو زولفـی عـەنبەرباری خـۆت**(٨)
**پـایبەندی زولفـی تـۆم، مـەحروومی ڕووی خـۆتـم مـەکـە**
**بــا بــە داغــی تـۆوە نـەمرێ بـولبولی گـوڵزاری خـۆت**(٩)
**دڵ بە تـیغ، جـان بـەندەفرمان، لەشکـری نـاز بـۆچـی بـێ؟**
**پــادشاهم! بــێ‌خــەتا وێران مـەفەرموو شـاری خـۆت**(١٠)

---

☞

| | |
|---|---|
| قصد ایشان نهفته اسراری است | کـه بـه ایما کنندگان گـاه اظـهار |
| پس بـری گـر بـه رازشـان دانـی | کـه هـمین است سـر آن اسـرار |
| که یکی هست و هیچ نیست جز او | وحـــده لا شـــریك إلا هـــو |

(٦) واتە: زولفەکانت دێنی و دەبەی و غافڵی لەو کـەسانەی کـوشتەی چـاوتن، شـەو و ڕۆژ سپەری دەبێ و لە نەخۆشی خۆت ناپرسی.
(٧) مۆسیقار: ئاواز خوێنی، مۆسیقازان.
واتە: وات عاشقی دەنگ و ئاوازی خۆت کـردووم مـنیش هـەر ڕەگـێکـم وەك سـیمی تـار، دەنگێکی لێ دێ باعیسی ئەو هەمووە ئاوازە تۆی.
(٨) واتە: بۆ ئەوەی کاری دڵ و دین بە یەکجاری نەشێوێ پیاوەتی بکـە هـێنـدە ئـەو زولفـە بۆنخۆشەت پەرێشان مەکە.
(٩) واتە: من کە پابەند و ئەسیری زولفی تۆم لە دیداری خۆت بێبەشم مەکە من بولبولی داغ لە دڵی گوڵی ڕوخساری تۆم با بە داخی تۆوە نەمرم.
(١٠) دڵ بۆ تیغی تۆ و گیانم بەندەی گوێڕایەڵی فەرمانتە، پێویست بە هێنانی لەشکری ناز نییە، ئەی پادشای موڵکی ئەندامەکانی من! شاری خۆت وێران مەکە تەواوی گیانی من هی خۆتە.

**دەســـتی خـۆم دا زولفـەکـەت مـەمکوژە خـۆ کـافر نـەبووم**
**قیبلەکەم هەر تۆی بە دڵ، بمبەخشە بەو زوننارى خـۆت(١١)**
**دەم بـــە دەم نـاڵەی «وەفـایی» دێ لە حـەلقەی زولفـەکـەت**
**جــارێکـــی نـابێ بـپرسی حـاڵی شـەوبێداری خـۆت؟!(١٢)**

........ ● ........

## [ ٢٢ ](١)

**ئـــــارەق ڕووی داگـــرتی لەبـــەر پـــێکـــەنینت**
**شەبنم لە گـوڵ بـاری ڕۆژی گـرت پـەروینت(٢)**

---

☞

پێم وایە «دڵ بە تیغ» هەڵەی نـووسیار بـێت و ڕاسـتەکـەی «دڵ مـوتیع»بـێت، کـەلەڵ «جـان بەندەفەرمان»یشدا جوانترە.

بەیتی دووەم تەلمیحە بە ئایەتی: ﴿إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا﴾ واتـە: هـەرکات پادشاکان چوونە ناو شارێکەوە خراپ و وێرانی ئەکەن.

(١١) زولفی تۆ وەك زوننارى مەسیحیانە، من کە دەستم پێوە کرد کافر نەبووم ئەگەر کافریشم بەو زولفەی خۆتم ببەخشە من هەر تۆ قیبلەمی قیبلەم نەگۆڕاوە.

(١٢) دایمە ناڵەی وەفایی دێ کە لە حەڵقەی زولفی تۆدا بەند کراوە، بێ قەزابی نابێ جارێکی نە حاڵی ئەو عاشقە شەو نەخەوەی خۆت بپرسی.

**[ ٢٢ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعولن مفعولن مفعولن مفعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی «اخرم».
ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: پێکەنینت، پەروینت، پەرژینت، و...

**تێبینی:** وەفایی ئەم شیعرەی تایبەتی گۆرانی داناوە و وەزنەکەشی هەر چەند عەرووزییە بەڵام یەکجار نایابە، بە گۆرانی نەکوترێ هەست بە کێشەکەی ناکرێ. ئەوەش بڵێین کە غەزەلێکی بەقەوەت نییە.

(٢) واتە: لەبەر پێکەنینت عارەق ڕوخساری گرتی عارەقەکەت وەك شەونم لەکوڵمت باری و وەك کۆمەڵە ئەستێرەی پەروین ڕۆژی داگرتی.

☜

تـوخودا زولفت لابـە تـا تـێر کـوڵمت مـاچکەم
رێی بـولبول بـا نـەگـرێ لەو بـاغە پـەرژینت[٣]
زولفت خـەتاکـار بـوو چـاوت بـرۆی داخست
با بچین ماچکەین دەستی شای چین و ماچینت[٤]
چـاوبازەی چـاو مـەستە، لەو بـادەی ئـەلەستە
دەستم بگـرە هـەستە، تـۆ و دیـن و ئـایینت[٥]
کەوتوومە نـێو زولفت بـۆ خـۆت بگـرە دەستم
کافر بووم بـێئـیمان، تـا بـێمـە سـەر دیـنت[٦]
شەو تا سـەحەر وەك گـوڵ دڵ پـڕ لە خـوێنـاوم
یا خودا شەماڵ بـێنـێ، بـێنـی عـەرەقچینت[٧]

☞

[وەفایی لەم بەیتەدا ئارەقی کوڵمی یاری بـە شـەونم شـوبهاندووە و ڕووی ئـەوی بـە گـوڵ؛ لەلایەکیترەوە ئارەقی بە پەروین شوبهاندووە و ڕووی یارەکەی بە ڕۆژ، جاکەوابوو دەڵێ: ئەو دڵۆپە ئارەقە کە لەکاتی پێکەنینتدا وەکوو شەونم ڕووی داگرتووی، لە ئەستێرەی پەروین دەکا کە کەوتبێتە سەر ڕۆژ. (ع.ح.ن)]

(٣) واتە: من کە وەك بولبولی باغی جوانـی تـۆم، بـا زولفت وەك پـەرژین و بـەربەندێ ڕێی جوانی تۆ نەگرێ، زولفت لابە تا تێر تێر کوڵمت ماچ کەم.

(٤) واتە: زولفت تاوانبارە چاوت برۆی تێكنا بابچین دەستی پادشای چین و ماچینت مـاچ بکەین.

پادشای چین و ماچین ئیستیعارە لە زولف و کوڵمی یارە.

(٥) ئەلەست: ڕۆژی ئەزەل، ڕۆژی پەیمان.

واتە: ئەی چاو بازی چاو مەست، لەو شەرابی ئەلەستە بەشم دە و دەستم بگرە بۆ خاتری دین و ئایینت.

(٦) واتە: کەوتوومەتە حەلقەی زولفت، ئەمن کافرم دەستم بگرە؛ بێمە سەر دینی تۆ.

(٧) عەرەقچین: نەوعێ کڵاوی کۆنە، بنکراس.

واتە: شەو هەتا ڕۆژ وەك گوڵ دڵم بۆت خوێناوە یاخوا شەماڵ بۆنی ئارەقی بنکراسەکەت بۆ من بێنێ.

قوربانی ئەو ڕەنگەم دونیای ڕەنگاند ڕەنگ ڕەنگ
بەو ڕەنگە بێ‌ڕەنگەی ڕوخسارەی ڕەنگینت(٨)
زولفت ڕووی داپۆشی، ئەبرۆت عەرەقناکە
ڕۆژیان لێ کردمە شەو بەو ماه و پەروینت(٩)
ڕوحمت پێمدا نەهات ـ شیرین ـ خوداگیر بی
ڕۆحی بۆ تۆ دانا فەرهادی میسکینت(١٠)
بۆچ هەر «وەفایی» بوو شێت بوو وەکێوان کەوت؟
سەد خوسرەو فەرهادە بۆ لێوی شیرینت(١١)

## [ ٢٣ ](١)

لە ژێر زولفی سیا ڕووی خستەدەر چاوی لە دونیا کرد
شەوی دی، سوبحدەم گۆیا، دەری مەیخانەیان واکرد(٢)

---

(٨) واتە: بە قوربانی ئەو ڕەنگە بم کە بە ڕوخساری بێ‌وێنەی تۆ دونیای ڕەنگاند.
جیناس و تیکرار لە نێوان ڕەنگدا هەیە.
(٩) واتە: زولفت ڕوخساری داپۆشیت برۆت ئارەقاوییە و بە چاوی وەك ئەستێرە و ڕووی وەك مانگت ڕۆژت لێ کردوومە شەو.
(١٠) واتە: ئەی شیرین خوداگیربی، ڕەحمت پێمدا نایە فەرهادی فەقیر ڕۆحی لەسەر تۆ دانا.
(١١) واتە: بۆ هەر وەفایی شێتی تۆ بوو کەوتە کێوان؟ سەدی وەك خوسرەوی پەرویز عاشقی لێوی شیرینت بوو وەك فەرهاد.
خوسرەو، فەرهاد و شیرین تەلمیح و تەناسوبی تێدایە. هەروەها لە شیریندا ئیهام هەیە.

**[ ٢٣ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیف: کرد. واژەی قافیە: دونیا، وا، ئاسا، و...
(٢) شەوی دی: دوێنێشەو. واکرد: کردیانەوە.
واتە: یارکە دوێشەو لە ژێر زولفی ڕەش ڕوخساری دەرخست و چاوی لە دنیا کرد، وەك بڵێی بەیانی بوویێتەوە و دەرکەی مەیخانەیان کردبێتەوە وابوو.

**بە ئاب و ڕەنگ و ڕوو حۆری، بـە زولف و کـاکـوڵی غـیلمان**
**گـــوڵاویـــان دا لە مـــەیخانە، غـوباریان عـەنبەر ئـاساکـرد(٣)**
**بـە ڕەنگـی چـاوی خـۆی سـاقی لەبـالەب جـامی مـەی گـێڕا**
**بە تەرزی زولفی خۆی موتریب دەمادەم چەنگ و نەی چاکرد(٤)**
**خەرامان شاهی خـوبان هـات، هـیلاکـی دیـن و ئـیمان هـات**
**بە زولف و ڕوویی تابان هات، کە کوفر و دینی یـەغما کـرد(٥)**
**لە جیلوەی قامەتی بەرزی، لە عـیشوەی زولفـی سـەد تـەرزی**
**زەمـــین و ئـــاسمان لەرزی، ســـوجوودی ڕووی دڵارا کـرد(٦)**

---

(٣) حۆری: ژنانی بەهەشتی، چاوڕەش. غیلمان: کوڕانی بەهەشت. کاکۆڵ: فۆکـلە، پـرچـی پیاوانە کە لە پێشەوە دەیهێڵنەوە.

واتە: بە ئاو و ڕەنگ و ڕوخسار حۆری بوو، بەکاکۆڵیدا غیلمان بوو، دەستووری دا مەیخانەیان بەگوڵاو شۆردەوە و تۆز و خۆڵیان لێپاك کردەوە و وەکوو عەنبەر بۆنخۆش کرا.

تێبینی: دەکرێ سەراپا عیرفانی بێ، بۆ مەجلیسێکی خەتمی عارفان ئەم شیعرەی هۆنیبێتەوە. مەیخانە: خانەقا. یار «شێخ عوبەیدیللا». من بە هەر حاڵ وەك مەجازی مـەعنای دەکـەمەوە مەعنا حەقیقییەکەی وەباڵ بە ئەستۆی وەفایی.

(٤) واتە: ساقی بە ڕەنگی چاوی خۆی جامی پڕ پڕی دا بە مەیخۆران، موتریبیش وەك زولفی خۆی ساز و نەی و چەنگی کۆك کرد و دەستی کرد بە مەجلیس ئارایی.

ڕازە (ئارایە)ی موازەنەی تێدایە.

(٥) واتە: شاهی خـەرامـان کـە هـۆی هـیلاکـی و نـەمانی دیـن و ئـیمانە هـات بـە زولف و ڕوخساری خۆی هەم کوفر و هەم ئیمانی تاڵان کرد.

مەولەوی ڕۆمی لەم بابەتەدا دەڵێ:

ســـاقی آتش پـرست آتش دست ــ ریـــخت در ســاغر آتشِ ســوزان

چو کشیدم نه عقل ماند و نه هوش ــ سوخت هـم کـفر از آن هـم ایـمان

(٦) واتە: لە جوانی قەد و باڵای یار و زولفی سەد شێوەی، زەوی و ئاسمان کەوتە لەرزین و سوجدەیان برد بۆ ڕووی ئەو یارە خۆشەویست و لەبەر دڵانە.

**شـــەکــەر خــەندەی گــوڵی زاری، دڵی هـێنـامە هـۆشـیاری**
**مـەگـەر گـوڵقـەندی لێ بـاری، کـەوا بـیماری ئـیحیا کـرد**(٧)
**هەزار تا زولفی وەك سـازێك، بـە نـاز بـوو نـەغمە پـەروازێك**
**کە هەر سازە بە ئـاوازێك، دوو دونـیای پـڕ لە غـەوغا کـرد**(٨)
**لە عەکسی شۆخ و شەنگێکە، جیهان گوڵ گـوڵ بـە چـەنگێکـە**
**هەر ئـەوراقـی لە ڕەنگـێکـە، بـەیانی حـوسنی یـەکـتا کـرد**(٩)
**وەنەوشە و گوڵ لە بـاغان بـوو، لە بـاغان شـەو چـراغـان بـوو**
**مەگەر داررووی نە ساغان بوو، بـە ڕوودا زولفـی تـاتاکـرد**(١٠)
**لە تـــاتا زولفـــی شـــەوکاری، درەخشـــا نـــووری ڕوخســاری**
**لە هەر حەڵقێکی سەد تاری، هەزار خورشیدی بـەرپا کـرد**(١١)

---

(٧) گوڵقەندە: گوڵاوی گوڵپەڕی گوڵەباخ و شەکر کە وەکوو دەرمانیش بۆ هەندێ نەخۆشی کەڵکی لێ وەرگیراوە.
واتە: بە پێکەنینی لێوی شەکەرینی دڵی منی هـۆشـیار کـردەوە، مـەگـەر بـزەی گـوڵقـەندی لێ دەباری کە نەخۆشی دووبارە زیندوو کردەوە.
(٨) هەزار تا: هەزارلا، بڵاو و پەرێشان.
واتە: زولفی وەك سازێکی هـەزارتـا کـردبوو؛ هـەر تـاڵێکـی زولفـی ئـاوازێکـی لێدەهـات، دەنگخۆشە نەغمە پەردازەکەش بە هەوای ئەو سازە هەر دوو دونیای لە غەوغا و شادی پڕ کردبوو.
(٩) واتە: لە جوانی یارێکی شۆخ و شەنگە ئاوا جیهان پربووە لە دەنگ و هـەر گـەڵایـێ بـە دەنگێکە و بەیانگەری جوانی خودایە.
مەولەوی فارس لەم مەقوولەدا ئاوا دەفەرموێ:
خاك سیه بر سر او کز نفست تازه نشد یا همگی رنگ شود یا همه آوازه شود.
(١٠) واتە: کاتێ یار زولفی بە دوویدا تا تا کرد وەنەوشە و گوڵ باخیان بەجێ هێشت، یان وەك گوڵی وەنەوشە دەچوو، ئەدی ئەو زولفە داررووی نەخۆشان بوو وا شەو باخی چراغان کرد و نەخۆشی چاکردەوە؟.
(١١) واتە: زولفی کە وەك شەو وا بوو ڕوخساری وەك نوور ئەدرەوشایەوە، هەر هەڵقەیەکی زوڵفی لە من سەد نووری درەخشانی وەك هەتاو دروست کرد.

**غورووری حوسنی خۆی وا بوو، دەمی پڕ خەندە کرد و چـوو**
**کە بۆ خۆی ڕازی خۆی فەرموو، «وەفایی» بۆچی ڕیسوا کرد؟[١٢]**
**هـەوا بـۆنـێکـی چـینی پـەرچـەمی کـرد و وەکـێوان کـەوت**
**سەبا عەترێکی غونچەی زاری هێنا و ڕووی لە سەحرا کرد[١٣]**
**نـیشانێکـی لە ئـەنواری جـەماڵی خـۆی بـە شـەم بـەخشی**
**سەراسەر جانی پەروانەی «پُـر از» سـووتان و سـەودا کـرد[١٤]**
**نـەسیمێکـی لە بـاغی حـوسنی خـۆی هـێنـا بـە گـوڵدا دا**
**سـەراپـا بـولبولی زاری «پُـر از» نـاڵە و تـەمەننا کـرد[١٥]**
**کەمان ئەبرۆیی پـەیوەستی، بـە غـەمزەی چـاوەکـەی مـەستی**
**کە دای تیرێکی سەردەستی، لە جیسم و جـانی ئـاوا کـرد[١٦]**

---

(١٢) واتە: هێندە بە جوانیی خۆی مەغرور بوو دەمی پڕکرد لە پێکەنین و ڕۆیی کە بەو کارەی ڕازی خۆی ئاشکرا کرد ئەدی بۆچی بووە باعیسی ڕیسوا بوونی وەفایی؟
لێرەدا گومان نامێنێ کە ئەم شیعرە عیرفانییە و مەعشووق لێرەدا «شێخ عوبەیدیللا»یە.
(١٣) چین: شکەن، مەوج و قەفی قژ.
واتە: هەوا کە بۆنی چینی پرچی یاری کرد شێت بوو، بای سەباش کە بۆنی عەتری دەمی یاری هێنا ڕووی کردە سەحرا.
وەکێو کەوتن و ڕوو لە سارا کردن کینایەیە لە شێت بوون، دێوانەیی حاسڵە لە عەشق.
(١٤) سەراسەر: هەموو. «پر از» پورِ ئەز: فارسییە واتە پڕ لە.
واتە: یار نیشانەیەکی جوانی خۆی داوە بە شەم و تەواوی پەروانە کە عاشقی شەمن گیانیان پڕە لە سووتان.
(١٥) واتە: لە باغی جوانی یار نەسیمێك هات و بە گوڵ درا بۆیە بولبول تەواوی گیانی پڕە لە ناڵە و تەمەننا.
لە ئەدەبی عیرفانیدا پەروانە و بولبول نمادی عاشق و گوڵ و شەم نمادی مەعشووقن.
(١٦) واتە: یار کە بە ئەبرۆی وەك کەوانی تیرێکی لە عاشقی دا لە جیسم و جاندا بەشداری کرد، واتە بە پێکانێ ڕۆحی وەبەرا هات.

**مەگەر موژگانی نەشتەر بوو، حەکیمی چاوی دڵبەر بوو**
**کە خوێنی دڵمی پێدەربوو، نەخۆشی خۆی موداوا کرد(١٧)**
**کوتم: ئەی شۆخی چاو مەستم، خەراب و عاشق و مەستم**
**بە ڕەحمەت بگرە ها دەستم، خوماری ئاشکارا کرد(١٨)**
**دڵی دا دڵ شکستی خۆی، هەڵستا هات بە دەستی خۆی**
**بە جامێکی ئەلەستی خۆی، «وەفایی» شێت و شەیدا کرد(١٩)**

---

(١٧) واتە: مەگەر مژۆڵی یار خەنجەر بوو کە دڵی منی دەرکرد و خوێنەکەی تکا و دڵ نەخۆش بوو چاکی کردەوە؟.
یان: برژانگی خنجەر بوو و چاوی تەبیبی دەردان، بە برژانگ دڵی بڕیم و بە چاوانی موداوای کردم.
(١٨) خومار: حاڵەتێکی سەرئێشەیە کە لە دوای مەستی حاسڵ دەبێ.
واتە: گوتم: ئەی یاری چاومەست من عاشق و مەستی تۆم ڕەحمێ بکە دەستی من بگرە، ئەو ئاشکرا منی خومار کرد، یا خوماری خۆی ئاشکرا کرد.
(١٩) ئەلەست: لە شێوەزاری عیرفانیدا بەو ڕۆژە ئەڵێن کە خودا ئەرواحی حازر کرد و لێی پرسین: «ألست بربكم»؟ واتە: من خوای ئێوە نیم؟ «قالوا بلىٰ» گوتیان: بەڵێ تۆ خودای ئێمەی. جا بەو ڕۆژە دەڵێن ڕۆژی ئەلەست و پەیمان لەگەڵ مەعشووق.
واتە: یار دڵی بە دڵ شکستەی خۆی دا و هەستا بە دەستی خۆی لەو جامی ئەلەستە پیاڵەیەکی دا بە وەفایی و شێت و شەیدای کرد.

**[ ٢٤ ](١)**

**دیســـــان نــەسیمی بــەهار، نــەرم نــەرم هــاتە خــوار**
**دونـــیای زیـــندوو کــردەوە بــە ئــەمری پـەروەردگار(٢)**
**بــە ئــاه و گــریان دیســـان، هــاتەوە هــەوری نــیسان**
**جگــەر پــڕ ئــاو و ئــاور، وەك عــاشقی بــێقــەرار(٣)**
**هــەوا لە بــەرگی گــوڵان، تــەبەق تــەبەق عــەتری ســوو**
**ســەبا لە بــۆی یــاسەمەن، چـەمەن مـوشکبار(٤)**

---

**[ ٢٤ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفتعلن فاعلن مفتعلن فاعلن». ڕەدیفی نییە. قافیە: خوار، پەروەردگار، بێقەرار، و...

**تێبینی:** ئەم قەسیدەبەهارییەیە لە ئاخردا بە عیرفانی کۆتایی دێ.

[جوانە ئاماژەیەکیش بەوە بکرێ کە ئەم غەزەلە لە ژێر کارتێکردنی غەزەلی ژمارە ٢٩٦ی سەعدی شیرازیدا وتراوە، وەزن و قافیەیشیان هەر یەکە، کە غەزەلەکەی سەعدی وا دەست پێدەکات:

دولت جان پرور است صحبت آمیزگار　　　خلوت بی‌مدعی سفره‌ی بی‌انتظار

ع.ح.ن]

(٢) واتە: شنەی نەسیمی بەهاری دووبارە نەرم نەرم هاتەخوارەوە و بە ئەمری خودا دونیای زیندوو کردەوە.

(٣) نیسان: هەوەڵ مانگی بەهار.

واتە: هەوری بەهاری بە گریان و ئاه کێشان (بارین و بریسکە) هاتەوە وەك عاشقی بێقەرار جگەر بە ئاو و ئاگرە و هەر دەگری و دەناڵێنێ.

دیارە ئەم شیعرە بەهارییە تەشخیسی تێدایە.

(٤) سوو: تێی ساوی.

واتە: هەوا تەبەق تەبەق عەتری لە بەرگی گوڵان هەڵساوی و بۆنخۆشی کردن، بای سەباش لە بۆنی گوڵانی وەك یاسەمەن دەشت و چەمەنی بۆنخۆش کردووە.

سیفەتی موازەنەی تێدایە.

هـــاتەوە بـــادی وەزان، بـــوو بـــە بـــەزمی نـــێو ڕەزان
کـــانی بـــە تـــاو هـــاتنە ژان، وەنـــەغمە کـــەوت ئـــابشار(٥)

نـــــەمەك فـــــرۆشـــی داغـــان، کـــردیانە شـــەوچراغـــان
ســـوورە گـــوڵی ڕەز و بـــاغان وەنـــەوشەیی جـــۆیـبار(٦)

ســـەمەن عـــەتری بـــە بـــا دا لە نـــێو چـــەمەن گـــوڵ گـــوڵاو
عـــەبیر عـــەنبەری هـــێنـــا وەنـــەوشە مـــیشکی تـــەتار(٧)

فـــریبی دیـــــن و دڵان لە پـــــەردە بـــــووکی گـــــوڵان
ســـەبر ســـەبر هـــاتەدەر بـــە نـــاز و مـــەست و خـــومار(٨)

دێن و دەچـــــن وەحش و ســـــڵ دەست بـــەندیانە بـــە دڵ
نـــارەوەن و ســـەرو و گـــوڵ لە شـــایی بـــووکی بـــەهار(٩)

---

(٥) ڕەز: داری ترێ. بەزم: مەجلیسی بادە و گۆرانی. ژان: ئێشی منداڵ بوون و زایین. ئابشار: ئاوهەڵدێر، تاڤگە.

واتە: بای بەهار هاتەوە بۆ بەزمی نێو باغە ترێ و کانی ژانی پێداهات و ئاوی تێ‌زا و ئاوهەڵدێر دەستی کرد بە ئاوازە خوێنی.

(٦) داغان: کێوەکان. نمەكفرۆش: خوێن شیرین و بە نمەك.

واتە: سوورە گوڵی نێو ڕەز و باغ و وەنەوشەی قەراغی جۆگەی ئاو، خوێن شیرینکەری کەژ و کێون دونیایان کردە شەوچراغان.

(٧) واتە: لە نێو چەمەندا وەنەوشە عەبیری هێنا و سەمەن عەتری بـڵاوکـردەوە و وەنـەوشە میشکی تاتاری هێنا.

واتە: ئەو گوڵانە هەرکام کارێکیان کرد، ئارایەی «موراعاتی نەزیر»ی تێدایە.

(٨) واتە: گوڵ وەکوو بووکێ بە سەبر و ناز و بە مەستی و خوماری لە پەردە هاتەدەر و دڵ و دینی فریو داین.

(٩) دەستبەندی: دەست پێکەوە گرتن بۆ هەڵپەڕیین.

واتە: نارەوەن و سەوڵ و گوڵ دەستیان گرتووە وگا بە توندی وگا سرك و ئارام دێن دەچن و بە دڵ هەڵدەپەڕن لە شایی بووکی بەهاردا. ڕازە (ئارایە)ی تەشخیس هەیە.

لە نێو بەزمی گوڵستان، بە سەر، بە پێ، بە دەستان
هاتنە سەمایە مەستان، نەومەستەکانی گوڵزار(١٠)
لالە و گوڵ بێ سەدان، شەهیدی عەشقی خودان
ئەم بە تەنی پڕ لە خوێن ئەو بە دڵی داغدار(١١)
گوڵ تار و زەرد و شینە، بەرگی زومورڕەدینە
نەقش و نیگاری چینە، دەشت و دەمەن کۆهسار(١٢)
هەوای گوڵانیان بزووت، هاتنە باغێ تاق و جووت
فاختە و عەندەلیب، بولبول و کەبك و هەزار(١٣)
هاتنە چەمەن کەفزەنان، خۆش نەفەس و نەغمەخوان
قومری و دورڕاج و سار، بە ساز و سەمتوور و تار(١٤)

---

(١٠) نەو مەستەکانی گوڵزار: گوڵ و گیای تازە ڕواو.
واتە: گوڵ و گیا بە سەر و بە پێ و بە دەست هاتنە سەما و لە بەزمی گوڵستاندا شادی دەکەن.
(١١) تەن: لەش، پەیکەر.
واتە: لالە و گوڵە باغی وەك شەهیدی ڕێگەی خودا بێدەنگ ماون. گوڵەباغی خوێناوییە و لالە دڵی پڕ داغە.
لەف و نەشری موشەووەشی تێدایە.
(١٢) واتە: زەوی بە بۆنەی گوڵانی تۆخ و زەد و شین و ڕەنگامەوە بەرگی زومرڕوتی لەبەر کردووە چیا و دەشت و دەر وەك نەقش و نیگاری چین وایە و هەموو ڕەنگێکی پێوەیە.
(١٣) فاختە: کۆترەباریکە، مەلێکی دەنگخۆشە لە تیرەی کۆتران. کەبك: کەو. هەزار: بولبول. عەندەلیب: بولبول.
واتە: ئەو باڵندانە هەوای گوڵزار لە کەللەی دان و بە تاق و بە جووت هاتنە گوڵزار و دەستیان کرد بە خوێندن.
(١٤) قومری: کوترەباریکە. دورڕاج: پۆڕ، باڵندەیەکە وەك هەوێردە بە فارسی پێی دەڵێن بولدەرچین. سار: سێرەو، لە هەندێ شوێنی کوردەواری پێی دەڵێن گاوانی.
واتە: ئەو باڵندانە بە چەپڵەڕێزان و گۆرانی گوتن و بە ساز و سەمتوور و تارەوە هاتن بۆ ڕازاندنەوەی بەهار.

**بادی سەبا مەست و چوست، هەروەکوو شاهید پەرست**
**دەستی لە ڕووی گوڵان خست، بەربووە بووس و کەنار[(١٥)]**
**زولفی ڕەشی سونبولان، خستیە سەر و ڕووی گوڵان**
**ئایەتی نارد بۆ دڵان، حاجیبی لەیل و نەهار[(١٦)]**
**بۆ دەرسی ئەربابی دڵ، پەڕ پەڕی ئەوراقی گوڵ**
**هەر دەرسی عیشقە حاسڵ، سەرمەشقی ئامووزگار[(١٧)]**
**وەنەوشە و گوڵ خەملیوە، عیبرەتە چی نەدیوە**
**لە یاقووت و لە زیوە، فەزا بە خەتی غوبار[(١٨)]**

---

(١٥) بووس و کەنار: ماچ و مووچ.
واتە: بای سەبا مەست و چالاك کەوتە نێو گوڵان و دەست تێوەردان و ماچ کردنیان وەك جوانپەرست وایە.
(١٦) حاجیب: دەرکەوان، داپۆشەر، ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهارِ وَ يُولِجُ النَّهارَ فِي اللَّيلِ﴾ . ئایەت: نیشانە.
واتە: پەردەداری شەو و ڕۆژ (خودا) ئایەتی بۆ دڵ نارد و بە وەدەرخستنی زولفی ڕەشی سونبوڵی خستە سەر ڕووی گوڵان.
(١٧) واتە: پەڕە پەڕەی گەڵای داران بۆ خاوەن دڵان سەرمەشقێکە و مامۆستایەکە کە بیخوێنێتەوە.
سەعدی شیرازی ئەڵێ:
برگ درختان سبز در نظر هوشیار هر ورقش دفتری است معرفت کردگار
(١٨) چی: هرچی. نەدیو: نادیار. خەملیو: ڕازاوە.
واتە: وەنەوشە ڕازاوەتەوە و هەرچی نادیار و نەدیوە بۆتە هۆی عیبرەت و پەند وەرگرتن و فەزا پڕ بووە لە زێڕ و زیو و یاقووتی ورد وەك ئەوە کە بەخەتی غوبار (کە خەتێکی ناسك و وردە) نووسرابێ.
[خەتی غوبار: جورێ خەتی خۆش نووسینە کە بە قەڵەمی زۆر ورد و ناسك ئەنووسرێ و لە شیعری شاعیرانی فارسیشدا ئیشارەی پێ کراوە، سەعدی شیرازی ئەڵێ:
بە مشك سودەای در عرق ماند کە بر تحریر نویسد کسی بە خط غبار
ع.ح.ن]

**بـــاغ نـــییە مـــەیخانەیە، پــــڕ مــەی و پــەیمانەیە**
**هــەر شــەم و پــەروانــەیە، لەبـەر چـاوی هـۆشـیار(١٩)**

**غـــەیری ئــاوی زۆر و کــەم، بـە زەمـزەمەی زیـر و بـەم**
**دەخـــوێنـــین بــە هـــەموو دەم، مـــەعریفەتی کـــرگار(٢٠)**

**«وەفــایی» ئــیدی بــەسە، عــیشق و هــەوای مـەدرەسە**
**بـــینووسە ئـەم هـەندەسە، بـێنـە خـەت و خـاڵی یـار(٢١)**

**بــــچۆ بــەلای دڵروبــای، بــەسەر بــە یــادی بــەقای**
**هــەتا ئــەتۆ بــێوەفـای، بـە خـۆت مـەکـە ئـیعتیبار(٢٢)**

**دەمـــێك نـــەفس بگـــرەوە، وە دووی دڵی خـــۆت کـــەوە**
**بـــزانــە ڕۆژ یـــا شـــەوە، خـــەوت نـەیە هـەستە کـار(٢٣)**

**هەزار سەوم و سەلات بـێ، چـاوت لە دووی زەکـات بـێ**
**خـــودات نـییە حـەیات بێ، قـەت وانـییە تـۆبـەکـار(٢٤)**

---

(١٩) واتە: لەبەرچاوی ئینسانی هۆشیار باغی بەهار باغ نییە بەڵکە وەکوو مەیخانەیە پڕە لە مەی و پەیمانە و شەمع و پەروانە.

(٢٠) واتە: بێجگە لە ئاو کە بە زۆری و بە کەمی بە دەنگی بەرز و نەوی باسی خـودا دەکـا، هەموو شتێ لە زیکری ئەڵلادایە، یانی ئەوان بە بێدەنگی و ئاو بە ئاشکرایی.

(٢١) واتە: وەفایی دەرس و هەوای مـەدرەسە کـافییە وەرە لە خـەت و خـاڵی یـار دەرسـی هەندەسە فێربە و ببە شناسای کردگار.

(٢٢) واتە: بچۆ بە لای یەك دڵڕفێنەوە کە ئەو بـاقییە و تـەغیر نـاکـا هـەتا تـۆ وا بـێوەفـابی، ئیعتیبارت بە خۆت نەبێ.

(٢٣) ماوەیەك بە قسەی نەفست مەکە و وەشوێن قەلبت کەوە تا شەو و ڕۆژت لێ عەیان بێ و خەوی غەفلەت داتنەگرێ.

لە عیرفاندا نەفس = هەوای مادییە. قەلب = مەعنەوی و جێگەی عەشقی خودایە.

(٢٤) سەوم و سەلات: ڕۆژوو و نوێژ.

واتە: تۆبەکار ئەوە نییە هەر بە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات خۆی بە موسڵمان بزانێ، دەبێ حەیای

تـــف لە ڕەنگ و ڕەوانت، دەگـــەڵ فـــیعل و ژیـــانت
چـــی تـیّدایـە دووکـانت؟ چت لیّ‌بکـڕیّ خـڕیـدار؟[٢٥]

مـــومکینی ســـڕ و نـــەهان، هـەم سـوحوفن هـەم بـەیان
هـــەم کـیتابن هــەم زوبـان، بـە وەسـفی پـەروەردگار[٢٦]

قسـە بـیست و چـــوارە، هــەر یــەکـێکـیان بــەکـارە
ڕێگـــای خـــودای دیـــارە، بـمرە بـــبە ڕەســـتگار[٢٧]

لە خـــەو لە خـــۆوە هـەستە، حـەیات بـیّ! هـێنـدە بـەستە
«وەفــایی» گــێژ و مـــەستە، دەنگــە لە شـــار و بـازاڕ[٢٨]

---

☞
بیّ و خودا بە قەلب بناسیّ.
موتەسەویفە و موتەشەریعە دوو فریقەن: تـەسەوف، شـناسایی خـودایـە بـە دڵ و دەروون. موتەشەریعە ئەو کەسانەن بە زاهیر و بە ڕیعایەتی یاسای شەریعەت هەڵسوکەوت ئەکەن.

(٢٥) واتە: تف لە ئەخلاق و کردارت لە ئەفکار و ئەعمالت، دووکانت هیچی تێدا نییە خەڵك چیت لیّ بکڕیّ؟

(٢٦) واتە: عالەمی مومکینات بە دیار و نادیاریەوە وەك کـتێب و نـووسراوە و قسـە وان کـە وەسفی خودا دەکەن.
واتە: موتەشەریعە بە کتێب و قسە خودا دەناسن و عارف بە ڕاز و سیڕ و پەنهانی.

(٢٧) واتە: قسە هەزارە و دوانی بەکارە ئەگەر پێت خۆشە بە خودا بگەی، بمرە تا ڕزگار ببیت و بە خوداش بگەیت.
تەلمیحە بە حەدیسی: «مُوتُوا قَبْلَ أَنْ تَمُوتُوا»، یان: مەرگ لیقائوڵلایە.

(٢٨) واتە: وەفایی لە خەو هەستە ئیدی حەیات بیّ بەسیەتی، گێژی و مەنگیی تۆ لە شار و دیّ دەنگی داوەتەوە.

[ ٢٥ ](١)

بـــادی نـــەورۆزی ئـــەوا هـــات، گـــوڵوەشـان و عـەتربار
وەك شەمیمی ڕوویی دڵبـەر، وەك نـەسیمی زولفـی یـار(٢)
گـــوڵ قـــەرارێکـــی بـــە بـولبول دابـوو دیسـان بێتـە بـاغ
زۆر نەچوو، بای وەعدە بـۆی هـێنـا نـەویدی نـەوبەهار(٣)
وەك شەهیدی زولف و ڕووی دڵبەر لەسـەر یـەك کـەوتوون
تـــا قـــیامەت مـــات و بـــێدەنگ و خـــمۆشـن لالەزار(٤)
بـــۆی وەنـەوشە و سـونبوڵە سـەحرا سـەراسـەر تـۆ دەڵێی
بـــای ســـەبا عـــەنبەر دەبـارێنـێ لە دەشت و کـۆهسـار(٥)

---

[ ٢٥ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف.
ڕەدیفی نییە. قافیە: عەتربار، زولفی یار، نەوبەهار، و...
ئەم غەزەلە یا ئەم قەسیدەیەش هەر بەهارییە. شاعیرانێ کە زۆر عومر دەکەن بەهارییان زۆرە.
(٢) گوڵوەشان: گوڵ ئەفشان، گوڵ پژێن. شەمیم: بۆنی خۆش.
واتە: بای نەورۆزی ئەوە هات و گوڵ ئەپرشێنێ و عەتر ئەبارێنێ، هەر لە بۆنی زولفی نەسیمی ڕوخساری یار دەچێ.
لەف و نەشری تێدایە: ڕووی یار گوڵ ئەفشانە و زولفی یار عەتربارە.
(٣) بای وەعدە: بای وادە، ئەو بایەیە کە لە ئاخری زستاندا دێ و بەفر دەتوێنێتەوە و هەوا بەرەو گەرمی دەچێ.
واتە: گوڵ قەراری مولاقاتی دابوو بێتە جێژوانی بولبول، زۆری پێ نەچوو قاسیدەکەیان کە بای وادە بوو مزگێنی بەهار و کاتی ژوانەکەی هێنا.
سنعەتی تەشخیسی تێدایە.
(٤) واتە: لالەزار و گوڵاڵان دەڵێی شەهیدن خوێناوی و بێدەنگ و مات تا ڕۆژی قیامەت کەوتوون و هیچ ناڵێن.
(٥) واتە: سەراسەری سەحرا لە بۆنی وەنەوشە و سونبول پڕ بووە بە چەشنێ کە تۆ پێت وایە بای سەبا عەتری باراندووە.

مـــەیلی کـــردە جـــۆیـــاران ســـەروی گـــوڵڕوخســـاری مـــن

جـــــەننەتێکـــی دیکـــەیە ئـــەمڕۆ کـــەناری جـــۆیـــبار[٦]

سەر بەسەر زیکـر و حـەدیسی گـوڵشـەن و سـەرو و گـوڵە

نەغمەیی گوڵبانگی بولبول، دەنگی قومری، سەوتی سـار[٧]

بـوو بـە مـایەی سـۆزی جـەرگ و دوودی ئـاهی عـاشقان

گوڵ بە ڕوویـی ئـاتەشین و سـونبول بـە زولفـی تـابدار[٨]

بـــاغ دەڵێی مـــەیخانەیە، پـیری مـوغان گـوڵ، مـەیفرۆش!

لالە سەرخۆش، ئەرغەوان پەیمانەکەش، نێرگس خـومار[٩]

گـوڵ بـە نـاز و عـیشوە خـەندان، بـولبولی ئـاشوفتە حـاڵ

نەغمە پەرداز، مەست و حەیران، دڵ فیدا و جان نیسار[١٠]

---

(٦) واتە: یارە گوڵڕوخسارەکەی من خەیاڵی سەیرانی قەراخ جۆگەی ئـاوی کـرد لەبـەر وی دەشت و دەر و گوڵزار بوونە بەهەشتێکی تازە.

(٧) نەغمە: ئاواز. گوڵبانگ: هەرا و دەنگی بەرز. سەدا: دەنگ.

واتە: دەنگی بولبول لە گوڵشـەندا و سەوتی قومری لە سەر داری سەوڵدا و دەنگی سێروو لە سەر بنجی گوڵ بە تەواوی حەدیسی زیکر و یادکردنەوەیە. لە ڕوانگـەی عـاریفاندا هـەموو دەنگێکی سروشت زیکری خودایە.

وەفایی بۆ خۆپاراستن لە تیکرار ئەم سێ وشە هاومەعنایەی هێناوە.

(٨) دیسـان لێرەشدا لەف و نەشرێکی جوانی هێنـاوە، واتـە: گـوڵ بـە ڕوخسـاری ئـەوینەوە باعیسی سۆزشی دڵی عاشقە و سونبول بە پرچی لوولی دووکەڵی ئاهی عاشقە. لە هەمانکاتدا تەشبیهی موزمەری گوڵ بە ئاو و سونبول بە دووکەڵیشی تێدایە.

(٩) واتە: باغ وەکوو مەیخانە وایە پیری موغان و مەیفرۆش گوڵە و گوڵی لالە مەستە و گوڵی ئەرغەوان ساقییە و گوڵی نەرگس حاڵەتی خومارییە.

ئەم بەیتەدا «تنسیق الصفات» هەیە کە گوڵەکان لە ڕووی شکڵی خۆیانەوە کەسبیان مەعلووم بووە. لالە: سیراب، واتە مەست. ئەرغوان: لە پیاڵە دەچێ، ساقییە. نەرگس: لە چـاو دەچـێ، خومار. ئەمە عەزەمەت و بەرزی شیعری وەفایی ئەگەیەنێت.

(١٠) واتە: گوڵ کە نمادی مەعشووقە بە نازەوە پێدەکـەنێ و بـولبولیش کـە نـمادی عـاشقە سەرگەشتە و حەیرانی یارە و هەر گۆرانی دەڵێ.

**وەســڵ و گــریان قــورب و هــیجرانــە تـەریقی عـاشقی**
**فەسڵی گوڵ بۆیە لە سـەر چـاوان وەهـا ئـاو دێتـەخوار(١١)**
**هــەر گــوڵێ ڕەنگـێکـی بـۆنـی ڕەنگ و بـۆی دڵبـەر دەدا**
**ڕەنگـی بـێڕەنگـی تـەماشاکـەن! بـە چـاوی ئـیعتیبار(١٢)**
**بــــۆ تــەنی دڵمــوردەگــان کــاری مــەسیحایی دەکــا**
**سەبز و خوڕڕەم، دڵگوشا، جانبەخشە، دەشت و کۆهسار(١٣)**

---

(١١) وەسڵ: جووت بوون لەگەڵ یار. هیجران: دووری لە یار. قورب: نزیکی.
واتە: دەزانی بۆ بەهار ئاوا ئاو لەو سەرچاوانە جاری دەبن؟ چونکا ڕێگا و ڕەوش و تـەریقی عاشقی وەسڵ و هیجران و نزیکی و گریانە، جا بۆیە فەسڵی بەهار کە فەسڵی عاشقانە ئاویش ئاوا جاری دەبێ.
جوانترینی «حوسنی تەعلیل»و تەزادی تێدایە.
(١٢) دڵبەر: یار لێرەدا مەبەست خودایە.
واتە: هەر گوڵێکی بەهاری ڕەنگێکی لە یار هەیە و بۆنێکی لە یار هـەیە، واتـە یـار خـاوەنی هەزاران ڕەنگ و بۆنە و گوڵان نموونەی جوانی وین، بە چاوی عیبرەتەوە تەماشای ئەم هەموو ڕەنگە لە بێڕەنگێ بکەن.
بێڕەنگ شایەد مـەبەست «ئـاو» بـێ یـان «خـودا». ئـەم دوو بـەیتە فـارسییەی خـوارەوەش ناواخنێکی وایانە هەیە:

ز آب بـــیرنگ صـــد هـزاران رنگ　　لاله و گـل نگـر در آن گـلزار. «هـاتف»
خاك سیه بر سر او کز دم تو تازه نشـد　　یا همگی رنگ شود یا همه آوازه شود

«مولوی»
(١٣) دڵمووردە: مردووی هەست و ئیحساس. کاری مـەسیحایی: واتـە زیـندوو کـردنەوەی مردوو کە ئیعجازی مەسیح بووە.
واتە: لە دەشت و کۆهساردا ڕەنگی گوڵ و دەنگی بولبول و ئاو هەڵدێران بۆ ئەو کەسانەی بە دڵ مردوون و هیچ هەست و سۆزێکیان نییە کاری حەزرەتی مـەسیح دەکـەن و زیـندوویان دەکەنەوە و وەجۆش و خرۆشیان دەخەن.

عــەتری بــەردا غــونچە دەم، نــێرگس نــیگاهی کــردەوە
دوودی عوودی مەجمەری باغ بوو بە دەفعی چـاوەزار(١٤)

ئــەشك و ئــاهی مــن هــەتا بــێ زۆرتــرە ئـاسوودەگـیم
ڕاحـــــەتی ڕۆح و دڵە، ئـــاب و هــەوایــی ســازگار(١٥)

دەم بــەدەم ســەرو و ســنەوبەر واکــە هــەر دێن و دەچــن
عــاشقن ســەوداســەرن مــەجزووبی گـوڵ بـێئـیختیار(١٦)

عــوشرەتی هــەردوو جــیهان دێنــێ «وەفــایی» فـرسەتە
گــۆشــەیی گـوڵزار و جـامی بـادە و ڕوخسـاری یـار(١٧)

•••••••━━━━●━━━━•••••••

---

(١٤) مەجمەر: ئاوردان. چاوەزار: دوعایێکە بۆ بەتاڵکردنەوەی چاوی چاوپیس.
واتە: غونچە دەم، عەتری بڵاوکردەوە و گوڵی نەرگس چـاوی هـەڵێنـا و دووکـەڵی عـوود لە مەجمەرداکە دەسووتێ بووبە چاوەزاری تا باخ بە چاوەوە نەبێ، یان یار بە چاوەوە نەبێ.
(١٥) لەم حوسنی تەعلیلەدا دەفەرموێ: تا فرمێسك و ئاهی من زۆرتـر بـێ ڕاحـەتی ژیـانم زیاترە. دەڵێن گریان تەسکینی دڵ دەدا دیارە ئاو و هەوای سازگار بۆ ڕاحەتی دڵ باشە، جا بۆیە من دەگریم تا ڕۆحم ئاسوودە بێ.
(١٦) واتە: سەوڵ و سنەوبەر کە هەر بە با دەژێن وەك مەجزووبی گوڵ بوویێتن بە بێ ئیختیار وایە، یانی: بۆ خۆشیان نەیانزانیوە عاشقی گوڵ بوون و هەر بۆیە ئەم دوو دارە وەك دەروێشی مەجزووب خۆیان ڕادەوەشێنن.
تەشخیس و حوسنی تەعلیلی تێدایە.
(١٧) واتە: وەفـایی فـرسەتە و لە دەسـتی نـەدەی گـۆشـەی گـوڵزار و جـامی بـادە و دیـتنی ڕوخساری یار عەشرەت و شادی و عەییاشی و خۆشی ئەم دوو جیهانە دێنێ و بایەخی پترە.

[ ٢٦ ][1]

ئەی چرای زوڵمەتکەدەی دڵ، ئەی جەلای نووری بەسەر
تۆ و جەماڵی باکەماڵت، ئافتابی یا قەمەر؟[2]
شەو ئەگەر تۆ ماهتابی، ئینتیزاری تا بەکەی؟
ڕۆژ ئەگەر تۆ ئافتابی، بۆچ لە هەوران نایە دەر؟[3]
جیلوەیێکت پڕ بە عالەم بۆ شەهیدان عومری نەو
خەندەیێکت پڕ بە دونیا بۆ نەخۆشان گوڵشەکەر[4]
ئاب و تابی ڕووتە مایەی سۆزش و گریانی من
گا غەریق و گا حەریقی میهری ڕووت وەك نیلووفەر[5]

---

[ ٢٦ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بە حری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەیفی نییە. واژەی قافیە: بەسەر، قەمەر، دەر، و...

(٢) زوڵمەتکەدە: تاریکستان. جەلا: بریقە، ڕوونکەرەوە، سەیقەل. بەسەر: بینایی.

واتە: ئەی یارێ کە بۆ تاریکستانی دڵم چرایت و بۆ نووری چاوانم جەلادەر و ڕوونکەرەوەی، سوێندت ئەدەم بە جوانی لەویەڕتدا تۆ هەتاوی یان مانگی؟

(٣) واتە: ئەگەر لە کاتی شەودا وەك مانگەشەو وای تاکەی چاوەڕێی دیدارت بم؟ ئەگەر لە کاتی ڕۆژدا هەتاوی بۆ لەبن هەوران خۆت وەدەرناخەی؟

(٤) گوڵشەکەر: دەرمانێکە بۆ نەخۆش تەسکین دەهەندەیە. جیلوە: خۆ پیشاندان و خۆ ئاشکراکردن.

واتە: خۆپیشاندانێکی تۆ هەموو عالەم پڕدەکاتەوە، واتە: ئەگەر بۆ کاتێکی کەم و زۆر کورت خۆت پیشانبدەی، هەموو عالەم لەو جیلوەیە پڕدەبێ. جا بەو جیلوە هەموو شەهیدانت زیندوو دەبێتەوە.

ڕازە (ئارایە)ی موازەنەی تێدایە.

(٥) نیلووفەر: گوڵێکە بنی لە ئاودایە سەرمایەتی و ڕووی لە تاودایە و گەرمایەتی.

واتە: باعیسی سووتان و گریانی من ئاو و تاوی ڕوومەتی تۆیە جارێ بە ئاوت دەمخنکێنی و جارێ بە تاوت دەمسووتێنی، وەك نیلووفەرم لێدەکەی.

ئـــاوی چـــاوم بـــۆتـــە مـــایەی ســـۆزش و گـــریانی دڵ
گا نەخۆش و مەست و حـەیران، گـا بـەهۆش و بـاخەبەر[٦]

وا فـــیگار و ڕەنـــجەڕۆم کـــافر بـــە حـــاڵی مـــن نـــەبێ
بـــێ قـــەرار و ئـــەشکبار و، دوور لە یـــار و دەربـــەدەر[٧]

هـــێنـــد لەبـــەر ئـــاوری فـــیراق و ئـــیشتیاقت مـــامەوە
بوو بە کۆی زووخاڵ دەروونم، بوو بە خوێن جان و جگەر[٨]

دەســـتی مـــن دامـانی زولفت بـا لە ڕووت مـەحرووم نـەبم
ڕەوشـــەنە مـــوشکیل‌گوشای شـەو زیـندەدارانـە سـەحەر[٩]

دوێنـــێ دەیـفەرموو: بـە هـەویای وەسـڵی ڕوخسـارم مـەبە
تـا وەکـوو زولفـم نـەبی گـەردەن‌کەچ و دەسـتە و نـەزەر[١٠]

سـەد شـوکر هـێنـامیە بـەر ئـەبرۆ لە قـەیدی زولفـی خـۆی
پـــاشی عـــومرێکـــی درێژ بـاڵی هـومای ئـاویتمە سـەر[١١]

---

(٦) واتە: باعیسی سووتان و گریانی دڵم ئاوی چاومە، گاهـ ئاگام لە خۆمە و گـاهێ لە خـۆم بێ خەبەرم.
(٧) فیگار: بریندار، غەمناك.
واتە: هێندە غەمناك و ناڕەحەتم کافر بە حاڵم نەبێ دوور لە یارم و دەربەدەر چاو بە گریانم.
(٨) ئیشتیاق: تاسەو تامەزرۆ، ئارەزووی کەسێ کردن.
واتە: هێندە لەبەر ئاگری دووریت ڕاوەستام و سەبرم کرد تا وای لێ کردم جان و جگەر بوون بە خوێناو و دەروونم سووتا و بوو بە زوخاڵ.
(٩) واتە: زولفت لەسەر ڕوخسار لابە با ڕۆژی ڕووت دەرکەوێ دیارە گیروگرفتی شەوبێداران چارەسەر دەکا، واتە ئەگەر ڕۆشنی ڕووت دەرکەوێ شەوگاری زولفت دژوار نییە.
(١٠) دەستە و نەزەر: خزمەتکار. گەردەن کەچ: موحتاج، هەژارو نەدار.
واتە: یار دوێنی دەیفەرموو تۆ ئەگەر بە ئاواتی ڕوخساری من و وەسڵی من بی، وەك زولفم دەبێ دەستە و نەزەر و ملکەچ ڕاوەستی.
(١١) هوما: مەلی خۆشبەختی، باڵندەیەکی خەیاڵییە کە ئەڵێن بەختەوەری دێنێ.

**حـۆری عـین، ڕوحـولقودوس، یـاخۆ مـەلایك، یـا پـەری؟**
**یــا ئــەتۆ بـووی وا خـەرامـان هـاتی ڕۆحـم هـاتەبەر؟**(١٢)
**خۆش بە ناز فەرمووی: «وەفایی» عومری خۆی هیچ ڕابوارد**
**یــا بــە قـوربانی دەمـم بـوو یـا بـە سـەرگەردی کـەمەر**(١٣)

**[ ٢٧ ]**(١)

**یـــا رەســـوولەڵلا دەخـــیلەك ڕووم نــییە بــێمــە حــوزوور**
**وەك دزان گـــەردەن کـــەچ و شـــەرمەندە وێســـتاوم لە دوور**(٢)

---

☞

واتە: خوا شوکر کە لە بەندی زولفی ڕزگار کردم و خستمیە ژێر نەزەر و تاقی ئەبرۆی. پاش بەرخستنی برۆی کە وەك باڵی مەلی خۆشبەختی سێبەری لێ کردم و حەسامەوە.

(١٢) حۆری عین: ئافرەتی چاوڕەشی بەهەشتی. ڕوحولقودوس = «روح القدس»: فریشتەی وەحی، جوبرەئیلی ئەمین، یان عیسای مەسیح کە بە «ڕۆحی پیرۆز» مەشهوورە.

واتە: ئەرێ فریشتە، یان پەری یان حۆری بەهەشتی یان تۆ بووی کە بە ناز و عیشوە تێپەڕیت و گیانم بە بەرادا هاتەوە؟.

(١٣) واتە: یار بە ناز فەرمووی وەفایی چاك عومری خۆت لەسەر دوو هیچ دۆڕاند، یەکێکیان دەمم بوو کە هێندە بچووکە وەك هیچ وایە، ئەویان کەمەر بوو کە هێندە بارێکە ئەویش وەك هیچ وایە.

وەفایی لەم دوو هیچە واتە دەم و کەمەر زۆر کەڵکی وەرگرتووە کە لەو جوانتر حاجی قادر گوتوویە کە لە شەرحی غەزەی ژمارە (٧)دا هێناومانە.

**[ ٢٧ ]**

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: حوزوور، دوور، سوور، و...

(٢) واتە: ئەی پێغەمبەر دەخیلتم لەبەر باری گوناه و تاوان ڕووم نییە بێمە خزمەتت، وەکوو دز ملکەچم و بە شەرمەوە لە دوورەوە وەستاوم.

گــەرچــی ســەرمایەم نــییە خــۆ مــوستەحەققی ڕەحــمەتە
ڕەنگی زەرد و ڕوویی ڕەش، موویی سپی و فرمێسکی ســوور(٣)
وەك لە گــۆشــەی بــێشــەدا مــەل بــێتــە تــووشی دام و داو
تووشی نەفس و تووشی شەیتان بووم غەریب و بــێ‌شــوعوور(٤)
موستەحەققی ڕەحمەتم، ئەی مەستی حەق! ئەی دەســتی حــەق!
دەســتی مــن بگــرە لە نــار و بــمخە نــێو دەریــایی نــوور(٥)
ڕۆح لەســــەر لێوم نــــەفەس‌گیرە، لە نــێو خــەوف و ڕەجــا
چــــاوەڕێی فــەرمانی تــۆیــە: چــێتــەدەر، یــابێتــە ژوور(٦)
تــابی گــێســووت وەقــتی خــەندە تـابشی ڕووت بــوو، وتــم:
نــەردەبانی عــەرشە پــایەی لامــەکــان مــایەی حــوزوور(٧)
تــا خــەس و خــاشاکــی بــەردەرگاهی تــۆم بــۆ دەست بــدا
چــیم لە گــوڵزاری بــەهەشت و لەززەتــی حــوور و قــوسوور(٨)

---

(٣) واتە: هەرچەند سەرمایە (توێشووی قیامەت، کردەوەی چاکە)م نییە، خۆ ڕەنگی زەرد و ڕووی ڕەش و مووی سپی و فرمێسکی سوورم موستەحەققی بەخشش و ڕەحمەتە.
موراعاتی نەزیر هەیە لە نێوان ڕەنگەکاندا.
(٤) واتە: هەر دەڵەی باڵندەیەکم لە گۆشەی دارستانێکدا تووشی داو و دانە بووم و شەیتان فریوی داوم و هەستم لە دەست داوە.
(٥) واتە: تۆ کە مەستی حەق و دەستی حەقی منیش موستەحەقم، کەوابوو دەستم بگرە لە ئاگر و بمخەرە ناو بەحری ڕووناکایی.
لە نێوان موستەحەق و مەستی حەق و دەستی حەقدا نەوعێ جیناس هەیە.
(٦) خەوف و ڕەجا: ترس و هیوا. حەدیس ئەفەرموێ: «المؤمن بين الخوف و الرجاءِ».
واتە: ڕۆحم لە سەر لێوە و لە نێوان ترس و هیواداگیری کردووە نازانێ بچێتە دەر یان بێتە ژوور.
(٧) نەردەبان: پلیکان، پەیجە، میعراج.
واتە: گێژ و خولی زولفت لە کاتی پێکەنیندا ڕووی تۆی نواند گوتم: بۆ چوونە بانی عەرش و حوزووری حەق وەسیلە لازمە ئەوەش زولفی تۆیە ئەی موحەممەدﷺ.
(٨) واتە: درِك و داڵی دەرکی تۆ شك بەرم باغ و گوڵزاری بەهەشت و قەسری ئەوێم ناوێ.

یـــادی ڕووی تـــۆم کـــرد و ئـارامـی نـەهێشـتم نـووری حـەق
ئـــاوری تـــێبـــەردام شـــوعاعی ڕۆژ بـــە تـــەقریبی بـــلوور(٩)
دەنگـــی بـــێڕەنگـــی سـەدای هـات ڕەنگ و دەنگـم پـێ نـەما
بـــاغی ڕۆحئـــەفزا دەپشکـــووتن لە پـــووشی وشك و زوور(١٠)
ڕووی وەدەرنـــــا مـــووی پـــەرێشـــان کـــرد دڵی پـــێدامـــەوە
یـــەعنی: هـــەر ئـــەمنم شـــەفیعی عـاسییان ڕۆژی نـوشوور(١١)
تـــاقی ئـەبرۆم دی، عـەیان بـوو سـوجدەگـای مـولك و مـەلەك
تابشی ڕووم دی، وەدەرکـەوت بـارەگـای نـووری سـودوور(١٢)

---

(٩) شوعاع بە تەقریبی بلوور: نوور ئەگەر لە شووشەوە تێپەڕبێ سووتێنەرە.
واتە: یادی ڕووی وەك بلووری تۆم کرد و نووری حەق ئارامی لە دڵدا نەهێشتم. نووری حەق لە نزیکی پێغەمبەر کە مونعەکیسکەرەوەی نووری خودایە سووتاندمی. وەك چۆن تیشکی خۆر کاتێك کە زەڕڕەبین مونعەکیسی ئەکاتەوە شت ئەسووتێنێ
لە نزیکی ڕەوزەی پێغەمبەروە ئەم شیعرە گوتراوە.
(١٠) زوور: زبر. دەنگی بێدەنگی. نەوای حەق.
واتە: دەنگی غەیبی هات و من خامۆش و فانی بووم. ئەو دەنگە لە پووش و خار و خاشاکی زبری عەرەبوستان، باغی ڕۆحئەفزا و گیانبەخشی پێك دەهێنا.
(١١) ڕۆژی نوشوور: ڕۆژی قیامەت.
واتە: ڕووی وەك درەخت و زولفی پەرێشان کرد و دڵخۆشی دامەوە و گوتی ڕۆژی قیامەت هەر من تکاکاری گوناحبارانم.
لە نوسخە پێشووەکەدا ئەم شیعرەی خوارەوەش هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناتەواو بوو نەمخستە ناو غەزەلەکە.
قُلت لي هو الوری خبْث نفسي بالهوی ..... لە ماء العیون...... النادم ماء طهور
(١٢) سودوور «صدور»: کۆی «صدر»ە واتە: چاوگە، یان بە مانا هەنارده‌کردنە.
واتە: تاقی ئەبرۆی پێغەمبەرم بینی جێی سوجدەی ئینس و جان بوو، نووری ڕوخساریم دی بارەگا و جێی بڵاوکردنەوەی نوور دەرکەوت. یانی بە نووری تۆ نووری خودا دەرکەوت.
موازەنەی تێدایە.

ئـەی شـەهەنشاهی سـەریری عـەرش و ڕۆحـانی غـولام!
چـل‌چرای عـالەم‌فەراز و شـانشینت مـاه و هـوور(١٣)
شـانشینت عـەرشی ئـەعزەم، جـیلوەگـاهت فـەرشی خـاك
مەزهەری وەعد و وەعیدت، سەوتی ڕیزوان نـەفخی سـوور(١٤)
ئـەی گـوڵی گـوڵزاری وەحـدەت، سـەروی بـاغی ئیستیفا
عـاریزت وەقـتی بـەیانان، قـامەتت وەقـتی زوهـوور(١٥)
ئـەی جـەماڵت بـاوەشێنـی شـاهباڵی جـوبرەئیل
جایڕووبی خـاکی ڕێت کـاکـۆڵی غـیلمان زولفی حـوور(١٦)
بـەندەگـانی عـاشقی ڕووتـن سـتارەی مـیهر و مـاه
زەڕ خـرِیدەی خـاکی پـێتـن عـەنبەر و مـیسك و بـخوور(١٧)

---

(١٣) سەریر: تەخت. هوور: خۆر، هەتاو. شانشین: جێگەیێ لە قەڵاکە بۆ دانیشتن دروست دەکرێ.
واتە: ئەی شاهی سەر تەختی عاڵەمی باڵاکە غوڵامت فریشتەکانن، تۆ چلچرای لە دونیا دیاری، جێی دانیشتنت مانگ و ڕۆژە.
(١٤) عەرش: عالەمی باڵا. فەرش: عالەمی نەوی، زەوی. وەعد: بەڵێن و پەیمان بە شتی چاك. وەعید: بەڵێن و پەیمان بە شتی نالەبار، هەڕەشەلێ کردن. ڕیزوان: دەرکەوانی بەهەشت. سوور: شەیپوور کە ئیسرافیل لێی‌دەدا و دونیا خراب دەبێ.
واتە: تۆ لەسەر عەرش دادەنیشی و لەسەر خاك خۆت نیشان دەدەی، دیاردەی وادە چاکەکانت دەنگی دەرکەوانی بەهەشت و بەڵێنت بۆ بێ‌باوەڕان سووری ئیسرافیلە. واتە ڕۆژی قیامەتە.
(١٥) واتە: ڕوخسارت کاتی بەیان وەك گوڵی گوڵزاری وەحدەتە و قامەت و باڵات کاتی دیار بوون وەك سەوڵی هەڵبژێرراوی باخ وایە.
نەف و نەشری مورەتتەبی تێدایە.
(١٦) واتە: ئەی ئەوکەسەی کە شاباڵی جوبرەئیل باوەشێنی جوانیت دەکات و فوکلە و کاکۆڵی حور و غیلمان گسك‌دەری بەر پێتن.
(١٧) واتە: ڕۆژ و مانگ کۆیلە و بەندەی عاشقی ڕوخساری تۆن و عەنبەر و میسك (کە زۆر

خـــۆش‌نـــویسی مـوسحەفی ڕووت بـۆ ڕەواجـی حـوسنی تـۆ
خۆش خەتی کـێشـا بـەسەر ئـایاتی «تـەوڕات» و «زەبـوور»(١٨)
گــەر تــەجەللای حـــەق مـورادی جـیلوەیی ڕووی تـۆ نـەبوو
چاوی «مووسا» کەی دەبوو ڕوون بێ بە سورمەی کێوی «توور»(١٩)
تــۆ و خـەمی گـیسووت کـە تـەشریحە لە سـیڕڕی ڕۆژ و شـەو
تۆ و خوتووتی ڕووت کـە تـەفسیرە لەسـەر ئـایاتی «نـوور»(٢٠)
تــــۆ بـــیو زاتـــی خـــودا ـقـــوربان ـ وەهـــاوارم وەرە
ئەو دەمەی بێ کـەس دەمـێنـم دەبـمە لوقـمەی مـار و مـوور(٢١)
دەم بــە خـــەندە یـەك دەم ئـەی کـەششافی سـیڕڕی لامـەکـان
کـــافییە جـــارێك بـــفەرمووی بـــۆ «وەفـــایی» یـــاغەفوور(٢٢)

☞

بۆنخۆشن) غولامی خاکی بەرپێتن (خاکی بەرپێت زۆر لەوان بۆنخۆشترن).
موازەنەی تێدایە.

(١٨) واتە: قەڵەمی خوش‌نووسی خوداکە جوانی ڕوخساری تۆی کێشاوە، لەبەر ڕەواجدان بە جوانی تۆ کتێبەکانی تـەوراتـی مـووساو زەبـووری داوودی جـوان خـەتداو نـەسخی کردنەوە.

(١٩) واتە: زاتی حەق لە کێوی توور لەبەر تۆ خۆی پیشاندا بۆیە مووسا چاوی بە کلەی کێوی توور ڕۆشن بووەوە.

(٢٠) واتە: بیکە بە خاتری قەفی زولفت کە ڕۆژ و شەو ڕازێکە لەو قژەی تۆ؛ بیکە بە خاتری خەتی ڕوخسارت کە ئایاتی نوور شەرح و راڤە دەکا.

(٢١) واتە: بیکە بە خاتری زاتی خودا، بگە بە هاوارم لەو کاتەیدا کە لە ژێر قەبردا بـێکـەس دەبمە خۆراکی مار و مێروو.

(٢٢) واتە: ئەی کەسێ کە ڕازەکانی خودات کەشف کردووە جارێك بۆم لە خودا بپاڕێرەوە و بفەرموو یاغەفوور، واتە: وەفایی ببەخشە.

**[ ۲۸ ][۱]**

**شەو لە خەودا من چرا بووم دڵ چرا بوو جان چراغ**
**ئەی لەبەر عەیشی شەوی دی جان چرا جانان چراغ[۲]**
**گەھ فریشتە، گەھ پەری، گەھ حۆری عین گاهێ مەلەك**
**گەھ قەمەر،گەھ موشتەری،گەھ ڕۆژ،گەهێ ڕەخشان چراغ[۳]**
**ڕەنگ بە ڕەنگ زولفی درەوشان دەم بەدەم ڕووی خۆی نواند**
**چلچرا یا شەو چرا بوو؟ یا بە سەد ڕەنگان چراغ؟[٤]**
**ڕووی لە تاتا زولفی دەرخست هاتە سەر ڕووی مەرحەمەت**
**نەوبەهار بوو، شەو بەهار بوو، وا کە داییسان چراغ[٥]**

---

**[ ۲۸ ]**

(۱) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف.
ڕەدیف: چراغ. واژەی قافیە: جان، جانان، ڕەخشان، و...
تێبینی: وەفایی ئەم غەزەلە تەقریبەن قەسیدە ئاسایەی بە بۆنەی خەونێکەوە داناوە کە شە و لە خەویدا لە جێگایەکی زۆر خۆشدا بووە و مەعشووق یان بە قەولی عارفان: جانان دیاربووە و دونیا و دار و بەردی لێبووەتە چراغان، لە ئاخرا یار دەڕوا و وەفاییش شیعرەکەی دێنێتە کۆتایی. دوور نییە مەجلیسی خەتمی عیرفانیی بە خەو دیبێ وەك نیزامی لە «مخزن الأسرار»دا یەك دوو جەلەسەی وای هەیە کە دەڵێ بە خەوی عیرفانی دیومە.
(۲) وەی: دەنگە واتە: چ خۆشە!. شەوێ دی: دوێشەو. جانان: مەعشووق.
واتە: شەوێ لە خەومدا من و دڵ و یار بووینە چرا، وەی کە عەجایب شەوێ بوو، دوێشەوێ گیان و جانان گشتی ببوونە چرا.
(۳) واتە: تاوێ فریشتە و پەری و حۆری دەبوونە چرا و دەهاتن، گاهێ مانگ و ئەستێرەی موشتەری و ڕۆژ وەك چرا داگیرسابوون.
(٤) ڕەنگ بە ڕەنگ: ڕەنگارەنگ. درەوشان: بریسکانەوە و پیشان دان. دەم بە دەم: قەیدە واتە هەرکات. چلچرا: چرای زۆر، لۆستر.
واتە: یار هەر لەحزە بە ڕەنگێ زولفی ئەدرەوشانەوە و پیشانی ئەدا، دەتگوت شەو چرا یا چلچرایە یان لە شەودا چرایەکە سەد ڕەنگ دەنوێنێ.
(٥) داییسان: داگیرسان، ڕۆشن بوون. هاتە سەر مەرحەمەت: لوتفی کرد.

ڕوو لە حــەلقەی تـاری زولفـان، دەم لە فـرقەی پـێکـەنین
وەك لە کــن کــانی حـەیاتێ، شـەو هـەزار تـابان چـراغ[٦]
ڕەونــەقی حــەوت ئــاسمان و زیــنەتی ڕوویــی زەمـین
هــەروەکــوو بــۆ شــانشین و مــەنزڵی شـاهان چـراغ[٧]
تـابی سـونبوڵ، تـابشی گـوڵ، نـیم نـیگاهی چـاو خـومار
نەشئە بەخشا، جان فەزا، وەك شـەو لە مـەیخانان چـراغ[٨]
عـەکسـی ڕووی ئـارایشـی زولف و خـەت و خـاڵان دەدا
وەك لە گوڵشەن گوڵ چرا بێ، سونبول و ڕەیـحان چـراغ[٩]

---

واتە: یار هاتە سەر ڕووی مەرحەمەت و ڕوخساری جوانی لە ژێر زولفیدا پیشان دا دەتگوت بە شەوی بەهارە یان بەهاری تازەیە کە چرا داگیرساوە.

(٦) فرقە: تریقەی پێکەنین، ناوی دەنگە وەك خشە، وزە، هـاژە. کـانی حـەیاتێ: چـەشمەی ئاوی حەیوان کە گوایە هەرکەس بیخواتەوە نامرێ و لە تاریکستاندایە.

واتە: یار ڕووی لە ڕەشایی زولفیدا وەدەرنا و دەمی لە قاقای پێکـەنین دا بـوو، دەتگـوت لە تاریکستانی ئاوی حەیاتدا شەو هەزار چرای تابان هەڵگیرساوە.

تەشبیهی مورەککەب و ئیستیعارەی تێدایە.

(٧) شانشین: سەکۆیەکە لە کاخی شاهان کە شا و نیگەهبان و شتیوای لەسەر دادەنیشێ. مەسنەد: تەختی شایی.

واتە: یار ڕەونەقی حەوت ئاسمان و جوانگەی ڕووی زەمین بوو دەتگوت لە سەر شانشین و تەختی شاهان چرایەو هەڵکراوە.

(٨) نەشئە بەخشا: سیفەتی فاعیلی مورەککەبە واتە نەشەدەر. جان فـەزا: سـیفەتی فـاعیلی مورەککەبە واتە: گیانی زیاد دەکرد و هێزی گیان بوو.

واتە: لوولی زولفی یار وەك تاب و خەمی سونبول وابوو و ڕوخساری یار وەك تابشی گوڵ بوو بە نیو نیگای چاوی خومارەوە کە تەماشای دەکرد نەشەی دەبەخشی بە ئینسان و ڕۆحی زیاد دەکرد و هەر وەکوو شەوان لە مەیخانەدا چرا دابگرسێ و نەشە و گەشەی ئەدا بە کۆڕەکە.

(٩) واتە: وێنەی ڕوخساری یار خەت و خاڵی یاری ئارایش دا و جـوانـی کـرد هـەر وەك لە

**شەوقی دامێ ڕووی دە من کرد، دیـم شـەوم لێ بـۆتـە ڕۆژ**
**من دەسووتام، من عەجەب مام! من چرا بووم یان چراغ؟!**(١٠)
**دڵ لە لایــێ، تــەن لە لایــێ وەك نـەیستان ئـاوری گـرت**
**مــەسجید و دەیــر و کــلیسا مــاوە پـڕ تـابان چـراغ**(١١)
**دار و بــەرد وەك مــن دەســووتا، دەر نـەما، ئـەیوان نـەما**
**زاهــیر و بــاتین چــرا بــوو، دەر چـرا ئـەیوان چـراغ**(١٢)
**زولفی تۆ و ڕوخســاری تـۆیـە؟ یـا شـەوم ڕۆژی ویســاڵ؟**
**ڕوویی تـۆ و بـاڵایـی تـۆیـە؟ یـا لە سـەروستان چـراغ**(١٣)

---

☞

گوڵشەنداگوڵ و سونبول و ڕێحانە وەك چرا وان ڕۆشنایی دەخەنە گوڵشەن.
تەشبیهی موزمەری ڕووی یار بە گوڵشەن و زولفی بە ڕێحان و سونبول.
(١٠) دامێ: پێی دام. دەمن: لە من.
واتە: یار شەوقێکی بە من دا و ڕووی تێکردم دیتم بەوکارەی یار شەوم لێ بووە بە ڕۆژ، من خۆشم گڕم گرتبوو و دەسووتام تەعەجوبم دەکرد و نـەمدەزانـی مـن چـرا بـووم یـان چـراغ چرابووا. چرا مەبەست خۆیەتی. چراغ: مەبەستی یارە.
(١١) تەن: لەش، ئەندام. نەیستان: قامیشەڵان. دەیر: عیبادەتگای مەسیحی، و زەڕتوشتی.
واتە: دڵ و تەن هەرکام لە لایێ وەك قامیشـەڵان زوو ئاگری تێکـەوت، مـزگەوت و دەیـر و کلیسایش پڕ بووە لە چرای نوورانی. واتە ئەو یـارە تـایبەتی ئـیسلامیان نـەبوو، یـەهوودی و مەسیحیشی ڕوون کردبووە.
(١٢) واتە: ئەو ڕوخسار و تەجەللای یارە وای کرد دار و بەرد و هیچ شتێ نەمابوو نەسووتێ لە عیشقی ئەودا، دەرگا و ئەیوان هەمووی ڕوون بوو، زاهیر و باتین لێكدرابوون و ڕۆشن بوون. دەرکە و بەرهەیوان هەموو ڕووناك بوو. واتە: عالەمی مەعلوومات بوو و حیجاب نەمابوو.
(١٣) شەوم ڕۆژی ویساڵە: پارادۆکسێکی جوانـە واتـە ئـەو شـەوە مـن ڕۆژی وەسـڵم بـوو. سەروستان: (سەر/وس/تان)، باغی سەوڵ.
واتە: ئەوە زولف و ڕوخساری تۆیە یان شەوی منە بۆتە ڕۆژی پێكگەیشتن لەگەڵ یار، ئەوە ڕوخسار و باڵای تۆیە یان چرایەکە لە نێو باغێکی سەوڵا هەڵکراوە؟
تەشبیه و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

**من ئەوا مەست و نەزان بووم، بۆ لە داغی باغی ڕووت:**
**گوڵ وەکوو بولبول دەسووتا تەرزی پەروانان چراغ(١٤)**
**ناگەهان دڵبەر نەهان بوو، بوو بە ڕۆژی ڕەستەخێز**
**کەفزەنان مەیخوارە، وێران مەیکەدە، گریان چراغ(١٥)**
**شەعشەعەی خورشید نیهان بوو، لاڵ و کەڕ بوو نیلوفەر**
**مات و خامۆش ما «وەفایی» وەك سەحەرگاهان چراغ(١٦)**

---

(١٤) ئەوا: وافەرزکەین، فەرزەن. داغ: ئارەزوومەند، بیرکردنەوە.
واتە: ئەوا گریمان من مەست و نەزان و گێژ بووم ئەدی ئەی گوڵ بۆ وەکوو بولبول کە بە داغ و حەسرەت و ئارەزووی باغی ڕووی تۆوە دەسووتا و دەتگوت پەروانەیە بە دەوری چرادا دەخولێتەوە. واتە هەر من عاشقی تۆ نیم و گوڵیش عاشقتە و وەك پەپوولە بە دەوری شەمی ڕوخسارتدا دەخولێتەوە.
(١٥) ناگەهان: لەپڕدا. نەهان بوو: ون بوو. ڕەستەخێز: قیامەت، مەحشەر. کەفزەنان: چەپڵە لێدان و هەراو بگرە. مەیکەدە: مەیخانە.
واتە: لە پڕدا یار ون بوو و بووبە ڕۆژی قیامەت و مەیخۆرەکان دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و هەراوبگرە، مەیکەدە وێران بوو چراکان دەستیان کرد بە گریان.
(١٦) واتە: گوڵی نیلووفەر لاڵ و کەڕ بوو تیشکی ڕۆژ خۆی ون کرد، وەفایی وەها مات و خامۆش بوو دەتگوت چرایە و لە کاتی ڕۆژ بوونەوەدا نووری خۆی لە دەست داوە.
سنعەتی تەشخیسی تێدایە.
گوڵی نیلووفەر نمادی دوو ژیانی دژ بەیەك و موتەزادە. لێرەدا مەبەست نیلووفەری ئاوییە. نیلووفەری ئاوی گەڵایەکی پانی هەیە کە لەسەر ئاودایە و لە هاویندا بەشی سەرەوەی لەبەر تاو خەریکە دەسووتێ و بەشی بنەوەی لە نێو ئاودا سەرمایەتی و هەڵدەلەرزێ.

**[ ٢٩ ]**[١]

**پێم بڵێ گوڵی بەهاریم لە تۆ تابەکەی جودا بم؟**
**وەرەوە، بە شەرتی جاران، ڕۆژی سەدجارت فیدا بم**[٢]
**خاڵی چاو و گۆشەی ئەبرۆ، دوو دینیان کردم لەسەر تۆ**
**یا بمکە پیری مەیخانە، یا موریدی خانەقا بم**[٣]
**سەرەکەم فیدات عەزیزم، وەرە زیز مەبە لەسەر دڵ**
**سەرە پایەبەندی تۆیە، دڵە ماڵی خۆتە تا بم**[٤]

---

**[ ٢٩ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن» یا «فعلت فاعلاتن فعلاتن فاعلاتن» کە هەوەڵەکە بەحری موزارع «اخرب»ە. دووهەمەکەی «ڕەمەلی مەشکوول» بەڵام هێندەی زوحاف تێدایە ناکرێ دەقیق بڵێی کامیانە ئەویش هی ئەوەیە ئەم شیعرە بۆ گۆرانی گوتراوە و تەسنیفە، تەسنیفیش چون بە ئاواز دەگوترێ پەیڕەوی لە عەرووز ناکات، چونکە لە ئاوازدا هیجاکان (بەخشەکان) بە ئێشتیای گۆرانیبێژ بڵند و نەوی و گەورە و چکۆلە دەکرێن. ئەم ئاهەنگە گۆیا خاسسی وەفاییە مەرحوومی مامڵی گوتوویە، بەڵام ئەم غەزەلە لە پاشان خودی وەفایی یان کەسێکی دیکە تەخمیسی کردووە کە پێشم وایە خودی وەفایی بووە. مامڵێش تەخمیسەکەی بە گۆرانییەکە و ئاهەنگەکەی خودی وەفایی گوتووە چونکا مەرحوومی سەعیدی مامڵێ ـ بابی کاك موحەممەد ـ وەفایی دیوە. ئەمەم بیستووە ئیتر ڕاست و دروستەکەی نازانم.
ڕەدیف: بم. واژەی قافیە: جودا، فیدا، خانەقا، و...
(٢) واتە: ئەی گوڵی بەهاریم تا کەی لە تۆ جودا بم، تۆ وەرە شەرتە بە شەرتی جاران ڕۆژی سەد جارت خۆم بە فیدات کەم.
(٣) واتە: دوو دینی خاڵی لای چاو و گۆشەی ئەبرۆتم، یانی هەر دووکیان بوون بە ڕووگەم و وەك ئەوەیە کە بەرەو دوو ڕووگە کڕنووش ببەم، یان بمکە پیری مەیخانە کە چاوتە یان لە ژێر میحرابی برۆتا بمکە موریدی خانەقا.
(٤) واتە: خۆشەویستەکەم! لێم زیز مەبە لەسەر دڵی من، سەرم فیدای تۆیە دڵیشم هەر ماڵی خۆتە.

**شــەو بــە تــای زولفت شـێوانـدم، ڕۆژ لە تـاوا دەتسـووتاندم**
**چ خـــودا لە تـۆ هـەڵدەگـرێ بـە شـەو و بـە ڕۆژ عـەزابـم؟(٥)**
**نــەفەسێ مــۆڵەتـێ بـدە عـومرم، بـدبینم زولفـەکـەت بگـرم**
**بــە کـەمەندی تـۆوە بـمرم خـۆشـترە تـاوەکـوو ڕەهـا بــم(٦)**
**لە نێو مەنزەرەی دوودەری خۆشـە سـەیری مـەوجی بـەحری**
**وەرە ســەر چـــاوم عـــەزیزم، چ دەکـەی لە دڵەی کـەبابم؟(٧)**
**غەمزەدەی نازی چـاوت بـم مـەیلی ئـەبرۆی تـۆ قـەت نـانێم**
**من کـە هـات و قـیبلەم گـۆڕی، یـاخودا کـافر بـێ جـەلابم!(٨)**

---

(٥) واتە: بە شەوی زولفت شەوانە دەمشێوێنی و بە ڕۆژی ڕوخسارت ڕۆژانە دەمسووتێنی، کوا خودا هەڵدەگرێ بە ڕۆژ و بە شەو عەزابم دەی؟!

شەو و ڕۆژ ئیهام و ئیستیعارەن لە زولف و ڕوخسار، بێجگە مانای ڕاستەقینەی خۆیان.

(٦) نەفەسێ: ساتێ، هەناسەیێ.

واتە: بۆ ساتێکی زۆر کەم عومری بدەرێ با بتبینم دەست لە زولفت وەرێنم کە بە کەمەندی تۆ بمرم خۆشترە لە ڕەهایی و ئازادیم.

(٧) مەنزەرەی دوودەری: پەنجەرەی دوودەری، بەرهەیوانـی دوولا ئـاوەڵا، ئیستیعارەیە لە چاوی وەفایی. مەوجی بەحری: ئیستیعارەیە لە گریانی وەفایی.

واتە: تۆ چیتداوە بەوەی چوویتە نێو دڵی کەباب و برژاوی من؟ لەوێ جێگەت ناخۆشە وەرە نێو چاوم و سەیری گریانم کە وەکوو ئەوە وایە لە پەنجەریەکی دوودەرییەوە سەیری شەپۆلی دەریا بکەی.

(٨) جەلاب: خوێنرێژ، بەو کەسەش دەڵێن کە کۆیلە زنجیر دەکات و شار بە شـار دەیـبا بـۆ فرۆشتن.

واتە: ئەگەر هات و مەیلی ئەبرۆت بنێم و فەرامۆشت بکەم یا خودا بە دەستی چاوی بازت دوچاری غەم بم، ئەگەر هات و لە تۆ زیاتر کەس بە قیبلە بزانم و قیبلەکـەم بگـۆڕم یـا خـوا کافرێکی بێڕەحم خوێنرێژم بێت، یان ڕاکێشەرم بێ و شار بە شار بە کۆیلەیی بمگێڕێ بـۆ فرۆشتن.

بوویە گوڵباغی گوڵەکەی من، سارێژ بوو داغی دڵەکەی من
ڕەحمت کرد بە حاڵم گوڵەکەی من، بەندەی باڵاتم سەد شا بم(۹)
داد لەبەر حوسنی فیتنەجۆ! دڵم دا زولف و ئەبرۆی تۆ
لەلایێ زونار بە دۆشم، لەلایێ ڕوو بە میحرابم(۱۰)
سەگەکەی ڕێبازی لەیلێ وەرە سەر دوو چاوی مەجنوون
چاوم ئەو ڕۆژە لێ ڕوونە خاکی بەرپێی ئاشنابم(۱۱)
غەرەزم چونکە پەنهانە وەرەزم لەو جیسم و جانە
مەرەزم مەرگی دەرمانە، هەر ئەزم بۆ خۆم حیجابم(۱۲)
خوێنی گرتم چاوی بازی، جگەری بڕیم تیری نازی
دەڵێ: من مەستم سەرخۆشم، جگەرە مەزەی شەرابم(۱۳)

---

(۹) واتە: تۆ بوویتە گوڵەباخی سەر خاکی گۆڕی من و سارێژت کرد برینی دڵی من، ئەی گوڵی من ڕەحمت بە حاڵی من کرد، چونکا هێندە چاکی سەد شا بم هەر غولام و نۆکەری باڵای تۆم.

(۱۰) حوسنی فیتنەجۆ: جوانی شەڕئەنگێز. داد: هاوار. زونار: کەمەربەند یا ملوانکی مەسیحیان. میحراب: ئیستیعارە لە برۆی یارە.

واتە: هاوار لە دەستی جوانی شەڕەنگێزی تۆ دڵم دا بە زولفت و بە ئەبرۆت؛ لەلایێ وەك مەسیحی پەت لە ملی زولفم و لە لایێ لە ژێر برۆتدا ڕووم لە میحرابی مزگەوتی ئیسلامانە.

(۱۱) واتە: ئەی سەگێ کە لەسەر ڕێی لەیلدای و پێ بە جێ پێی لەیل دادەنێی، وەرە سەر چاوی مەجنوون با تۆزی بەرپێت کە تۆزی پێی لەیلیشی پێوەیە و ئاشنای مەجنوونی، چاوی ڕوون بکاتەوە.

(۱۲) غەرەز: مەبەست، هەدەف. مەرەز: نەخۆشی. حیجاب: داپۆشەر.

واتە: چونکە من لە شیعرەکانمدا بە ڕاشکاوی قسە ناکەم و ڕازەی قسە دەکەم غەرەز و مەبەستم شاردراوەیە، بۆیە لە جیسم و جان بێزارم، نەخۆشییەکەشم دەردێکی گرانە دەرمانەکەی هەر مەرگە و دیارە خۆم حیجاب و داپۆشەری خۆمم و بە مەرگ نەجاتم دەبێ و حیجاب لادەچێ.

(۱۳) واتە: تیری نازی کە بریتییە لە برژانگەکانی وەکوو ڕەگ زەن (فصّاد) جەرگی بڕیم و چاوە ☜

دەمــەکــەت بــە دڵ وا بــێنــە، تــۆ خــودا دڵم مــەشکێنــە

جێ بەجێ ڕۆحم بستێنــە، مـن کـەوا عـاشقێکـی چـا بـم(١٤)

وەرە تــووری ســینە ئــەی دڵ، بـا بـە دڵبـێ دیـداری گـوڵ

کـە دڵ و دڵبـەر بـوونە یـەك، چ بـە ئـارەزووی جـەوابـم؟(١٥)

خۆش بەو دەمەی گوڵ پشکووت، شەکەر دەبـاری لە یـاقووت

لێم‌لادە «وەفایی» دەیکـوت: تـۆ گـەدا مـن شـا بـۆت نـابم(١٦)

---

☞

بازەکەی خوێنی گرتم، بۆ خۆیشی دەڵێ من مەست و سەرخۆشم و مەزەی شەرابیشم جەرگە.

(١٤) واتە: من کەوا عاشقێکی چاکم دەمت واوە بێنە و تۆبی‌وخودا دڵم مەشکێنە لە بەرامبەریدا فەوری ڕۆحم لێ‌وەرگرە. یانی ماچێکت بایی ڕۆحمە و ئەو موعامەلەیەش دەکەم.

(١٥) واتە: ئەی گوڵ وەرە سەر کێوی تووری سینای دڵی من با دیدارەکەت بەکەیفی دڵ بێ، لەوێ وەك چاوپێکەوتنەکەی خودا و مووساکە دڵ و دڵبەر بوونە یەك، من ئاواتی جوابم نییە. تەلمیحە بە ئایەی «لن ترانی» کە خودا جوابی مووسا ئەداتەوە. شاعیرێکی فارسی دەڵێ:

چو رسی بەطور سینا «أرنی» مگو و بگذر  کە نیرزد این تمنا بە جواب لن ترانی

هەروەها مەولاناش دەڵێ:

ز عشق شمس تبریزی چو موسیٰ گفتەام أَرِنی

ز سوی طور تبریزی چرا چون لَنْ نمی‌آیی

هەروەها لە جێیەکی دیکەش دەڵێ:

بە فلك برآ چو عیسیٰ، أرنی بگو چو موسیٰ  کە خدا تُرا نگوید کە خموش لن ترانی

(١٦) واتە: خۆش بە حاڵی ئەو کاتەی بەو دەمە جوانەی دەیگوت ئەی وەفایی لەکۆڵی من بەوە تۆ گەدا و سواڵکەری و منیش پادشاهم بۆ یەکتری نابین.

[٣٠][١]

دەمێك ساقی دەمت بێنە دەخیلی چاوەکانت بم
بە جامێك دەستی من بگرە فیدای پیری موغانت بم[٢]
لە دوو لا مەست و حەیرانم، بە قووەی جەزبە نازانم
نە سەرگەردی سەر و گەردەن، نە قوربانی لەبانت بم؟[٣]
چ خۆشە وەجدی سەرو و گوڵ، بە دینی قومریی و بولبول
دەمێك شەیدای قەد و باڵات، دەمێك شێتی دەهانت بم[٤]

---

[٣٠]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف: بم. واژەی قافیە: چاوەکانت، موغانت، لەبانت، و...

(٢) دەمێك: تاوێك، لەحزەیەك. دەمت: زارت. پیری موغان: ساحێبی مەیکەدە، گەورەی بادەخۆران. ساقی: ئەو کەسەی مەی تێدەکا، لە عیرفاندا پیری موغان و ساقی جاری واهەیە یەکن کە ئەویش مانای مورشیدن.

واتە: ئەی ساقی بۆ ساتێ دەمت بێنە ماچی کەم من بە فیدای خاوەنی گەورەی بادەخۆران و ڕێنوێنەکەت بم.

(٣) جەزبە: کەشش و ڕاکێشانی عاشق بۆ لای مەعشووق، وەجد و حاڵی سۆفیانە.

واتە: من وەها بە قودرەتی کەشش و جەزبەی مەعشووق لە دوولاوە سەرگەردان بووم نازانم کە بە سەرگەردانی سەر و ملت بم، یان بە قوربانی لێوەکانت بم.

(٤) وەجد: شادی و خۆشی.

واتە: سەیری خۆشی داری سەوڵ و گوڵە باغ، چەندە خۆشە. داری سەوڵ لە قەد و باڵای تۆ دەچێ، گوڵە باغ لە دەمی تۆ دەچێ و قومری و بولبول یەکیان عاشقی سەوڵە کە قومری و یەکیان عاشقی گوڵەکە بولبولێ، جا بە دیتنی ئەوانە سەیری ئەو دوو شتە خۆشە بۆیە منیش ساتێ شەیدای قەد و باڵاتم وەك قومری کە لە داری سەوڵ دەچێ ساتێ شێتی دەمتم وەکوو بولبول کە لە گوڵباخی دەچێ.

لەف و نەشر و ئیستیعارە و «موراعاتوننەزیر»و تەشبیهی تێدایە.

له نیشانەی پەڕەی جەرگم نەوەستا تا نەگەییە دڵ
به قوربانی خەدەنگی دەست و بازووی چاوەکانت بم[٥]
شیفای دام غەمزەکەی چاوت کەوا خوێنی دڵی گرتم
بە قوربانی موداوایی حەکیمی حاڵزانت بم[٦]
بەبێ ئیمدادی خاڵی گەردنت دەردم شیفای نایە
مەگەر بێم دەست و دامانی گەلاوێژی بەیانت بم[٧]
له وەسڵی ڕوویی تۆی کردم حیجابی پێچشی زولفت
هەتا کەی دڵشکستەی دەرد و تەعنەی باغەبانت بم؟[٨]
موقیمی خاکی دەرکەی تۆ حەریمی جەننەتە جێگای
بە لوتفی تۆ چ کەم نابێ منیش ڕیزەی سەگانت بم؟[٩]

---

(٥) خەدەنگ: تیر، لێرەدا مەبەست برژانگی یارە.
واتە: ئەمن بە قوربانی قودرەتی کەمانداری چاوەکانت بم، هێندە بە قودرەت بوو لە پەڕەی جەرگمی داکە کردبووی بە نیشانە و بەوەوە ڕانەوەستا ئاخری دڵیشی پێکام.
(٦) خوێن گرتن: کەڵەشاخ گرتن، ڕەگ لێدان بە مەبەستی دەرمان، حەجامەت.
واتە: چاوت بە غەمزە کاتێ خوێنی دڵی گرتم، لە باتی ناڕەحەتی، من شیفام پێدرا چونکا مەبەستی حەجامەت بوو، ئەی خۆم فیدای ئەو دەرمانکردنەی چاوت بم کە دەڵێی دوکتۆری ئاگا لە حاڵی نەخۆشە.
(٧) گەلاوێژی بەیان: ناوی ئەستێرەیەکە لێرەدا مەبەست چاوی یارە.
واتە: دەردی من تا خاڵی گەردنت کۆمەکی نەکا، چارەی نایە؛ ناعیلاجم بێم و بپاڕێمەوە لە چاوەکانت ئەویش کۆمەك بکا تا دەردم چا بێتەوە.
(٨) زولف: لە عیرفاندا موشکیلاتە. حیجاب: بەرگر.
واتە: زولفی پێچاوپێچت نەیهێشت بە وەسڵی دیداری تۆ بگەم. زولفت وەك باغەوان نایەڵێ سەیری باغی ڕوخسارت بکەم تاکەی دڵم بە تانەی ئەو باغەوانە بشکێ.
(٩) موقیم: ساکن، نیشتەجێ. حەریم: هەرێم، مەنتیقە. ڕیزە: دەستە، سەف.
واتە: کەسێ لە دەرکەی تۆدا ساکن بێ خەڵکی وڵاتی بەهەشتە، خۆ لە لوتفی تۆ کەم نابێ

**بە زولفی پڕ لە هاواری دڵان کـەوتووم، دەسـا ڕوحـمێ**

**ئەمان سەرقافڵەچی قوربانی زەنگـی کـارەوانت بـم(١٠)**

**لەوی ڕۆژێ کە ڕووت وا کرد و لێت پرسیم، هەتا دەمرم**

**بە بۆی جەننەت دەبێ من هەر لەسەر ڕازی نیهانت بم(١١)**

**بڕۆت تێکنا، دەمت وێکنا، لە دەریای لوتـفی تـۆ دوورە**

**لە قـــوربی قـابەقەوسەین و مـەقامی لامـەکـانت بـم(١٢)**

---

☞

منیش لە ڕیزی سەگەکانت بم و لە دەرکی تۆ ساکن بم.

دەکرێ تەلمیح بە سەگی ئەسحابی کەهف بێ.

(١٠) زولفی پڕ لە هاواری دڵان: یانی زولفی یار هێندەی دڵی عاشقی تێدایە ئەوانیش هەموو هاوار دەکەن لەو بەندیخانەدا. سەرقافڵەچی: مەبە ست نەجاتدەرە، خدری زیندە. زەنگی کاروان: پێشەنگی کاروان زەنگی لە مل وڵاخەکەی دەکا تا تێپەڕبوونی کاروان ڕاگەیەنێ.

واتە: کەوتوومە گێژی زولفێ کە هەزاران دڵی تێدا ئەسیرە و هاوار ئەکەن. سەرقافڵەچی بە قوربانی زەنگی کاروانت بم وەرە دەگەڵ خۆتم خە و نەجاتم دە.

(١١) بۆ: بۆنە، هیوا، ئاوات.

لەو ڕۆژە کە ڕووت کردەوە و هەواڵێکت لێپرسیم من هەر بە ئاواتی بەهەشتم و لە سەر ئەو ڕازە شاردراوەی نێوان هەردوکماندام. یان دەکرێ بڵێین ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی پاشەوەیدا دژایەتی هەیە، بەمچەشنە: لێرەدا ڕووکردنەوەیە و لەوێ ڕووگرژکردنە، لێرە لێپرسینەوەیە و لەوێ دەم لێکنان و هەواڵ نەپرسینە. وە مەبەست لە «بۆی جەننەت»: بۆنی هەناسە و مەبەست لە «ڕازی نیهان»: دەمی بچووکی یار بێت.

(١٢) برۆ تێکنان: تووڕەیی. دەم وێکنان: قسە نەکردن. قورب: نزیکی. قاب قەوسەین: نێوان دوو ئەبرۆ، ئیشارەیە بە ئایەتی «فکان قاب قوسين أو أدنى». مەقامی لامەکان: ئیشارەیە بە میعراجی پێغەمبەر و گەیشتن بە حوزووری خودای مەزن.

واتە: تۆ لێم تووڕە بووی، بە برۆ لەو نزیکی قابەقەوسەینەت دوور خستمەوە و دەمت وێك‌نا، لە مەقامی لامەکانت (کە زارتە) بێبەشت کردم ئەمە لە بەحری لوتف و ڕەحمی تۆ بە دوورە و چاوەڕوان نەکراوە.

☜

**ئــەمن کــورد و دڵ ئـیفتادە، ئـەتۆ شـۆخ و عـەرەبزادە**
**مەگەر بمرم بە بەختی خۆم دەمێکی هەمزوبانت بـم**(١٣)
**بە یادی زولف و ڕووی تۆ وەك «وەفایی» هەر دەنـاڵێنـم**
**دەبێ تا ڕۆژی مەحشەر تازیەدار و ڕەوزەخوانت بم**(١٤)

---

☞

(دەکرێ بەم جۆرەش مەعنای لێبدرێتەوە: واتە تۆ (ئەی پێغەمبەر) کە وەکوو قابەقەوسەینی لە نزیکی لە خودا و لە بارەگای لامەکانی خودابیەوە لە لوتفی تۆ دوورە لەگەڵ من کەم لوتف بی و قسەم لەگەڵ نەکەی و نەڕوانی بۆم لە حاڵێکدا خودا ئەو لوتفەی لەگـەڵ تـۆ کـردووە و ئـەو مەقامەی داویتێ).

ئیستیعارە، تەلمیح و «موراعاتونەزیر»ی تێدایە.

(١٣) دڵئیفتادە: عاشقی بێ دڵ. شۆخ و عەرەبزادە: ئیستیعارە بە یارە و دەکرێ مەبەستی حەزرەتی موحەممەد بێ. هەم زوبان: واتە بە یەك زمان قسـە بکـرێ، لە پـاش مـردن دەڵێن هەمووکەس بە عەرەبی قسە دەکەن.

واتە: یا موحەممەد من کوردێکی عاشقم و ئەتۆ جوانێکی عەرەبی مەگەر لە کاتی مردندا وەك تۆ بە عەرەبی قسە بکەم تا ببمە هاو زمانت.

(١٤) ڕەوزەخوان: مەرسیەخوێن، کەسێ کـە لە تـەعزییەدا بـە شـیعر و بـەند و بـاو مـردوو دەلاوێنێتەوە.

واتە: وێنەی وەفایی بە یادی زولف و ڕوخساری تۆ هەمیشە هەر پیشەم ناڵینە شەرتە تا مردن تازیەدار و ڕەوزەخوێنت بم.

هیچ شکی تێدا نییە ئەم شیعرە لە مایەی عیرفانی بێبەش نییە جا مەگەر بە سەبکی حافیزی شیرازی ـکە هەندێ جار لە واژەگەلی عیرفانی بۆ عەشقی مەجازیش کـەڵکـی وەرگـرتووە ـ کاری کردبێ، کە ئەوە ئەوجی قودرەتی شیعریی وەفایی دەگەیەنێ.

**[ ٣١ ]**[١]

| | |
|---|---|
| خۆشا ڕۆژێ لە عالەم دەربەدەر بم | لە نێو ئەوزاعی دونیا بێخەبەر بم[٢] |
| لەبەر بێ تاقەتی دێوانە ئاسا | لە غەوواسانی دەریا بێخەتەر بم[٣] |
| شەو و ڕۆژێ لە چۆڵی هەر بە ناڵە | حەریفی شەوڕەوی بادی سەحەر بم[٤] |
| نەزانێ هیچ کەس ناو و نیشانم | ئەگەر عاقڵ ئەگەر ئاشفتە سەر بم[٥] |
| لە هەرلا با بسووڕێنێ غوبارم | لە هەر جێگایێ پێویستە سوپەر بم[٦] |
| چرا بێ هەڵکرێ، جانا، لە نێو دڵ | لە ڕوونـاکی دڵی یارم خەبەر بم[٧] |
| لەبەر چاوی تەڕم سۆرانی بڕزێ | گەهێ بێ‌دایك و گاهێ بێ‌پەدەر بم[٨] |

---

**[ ٣١ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن فعولن» بەحری هەزەجی موسەددەسی مەحزووف.
ڕەدیف: بم. واژەی قافیە: دەربەدەر، بێخەبەر، بێخەتەر.

(٢) واتە: ئەو ڕۆژە خۆشە لە عالەم بچمە دەرێ و ئاوارە و تەنیا بم و لە ئەحواڵی دنیا هیچ خەبەرێکم نەبێ (مەقامی تەجەڕڕود).

(٣) غەواس: مەلەوان. بێخەتەر: نەترس.
واتە: وەك شێت و دێوانە لەبەر بێتاقەتی خۆم وەك مەلەوانانی بەحر نەترس بم.

(٤) واتە: شەو و ڕۆژ لە چۆڵێکدا ڕەفیق و هاوڕێی شەوانەی بای بەرەبەیانی بم. واتە نەخەوم.

(٥) واتە: ئەگەر عاقڵ بم یا سەرشێت و دێوانە، کەس بە ناو و نیشانم نەزانێ.

(٦) واتە: با بای سەبا و شەماڵ گەرد و غوباری من گێژ و خول بدا و لە هەرجێیەکیش لازم بێ قەڵغانی بەلابم.

(٧) واتە: چرایەکی ڕووناك لە نێو دڵمدا هەڵکرێ تا بە خەبەر و ئاگەداری دڵی یاریشم بم.
چرای ئاگاهی و بینش.

(٨) سۆرانی: فەقیانە.
واتە: ئەوەندە بە سۆرانییەکەم چاوم بسڕم سۆرانییەکەم پەڕپووت بێ و بڕزێ وەك هەتیو ساتێ بێ‌دایك بم و ساتێ بێ‌باب.
واتە بێ کەسی و بێ‌قەدری و جیابوون لە تەعەللوقات کە لە عیرفاندا پەسەندە حافیز دەڵێ:

| | |
|---|---|
| غلام همت آنم کە زیر چرخ کبود | ز هرچە رنگ تعلّق پذیرد آزاد است |

خودا خۆم چۆن بسووتێنم بە جارێ لە دەرد و داخی ئەحواڵم بە دەر بم[٩]
شەوێ هەر تاکوو ڕۆژێ هەر بناڵم بە گریان دەست و دامانی سەحەر بم[١٠]
چ ڕێگەی چارە نابینم «وەفایی» مەگەر سەر تا قەدەم غەرقی نەزەر بم[١١]

[ ٣٢ ][١]

ئەگەر بێ یادی زولف و چاوەکەت یەك لەحزە سابیر بم
ئەسیری بەندی کافر کوشتەیی بێدادی ساحیر بم[٢]
ویسالی خاڵەکەی لێوت حەیاتی عاشقە ئەمڕۆ
بە حەققی ساقیی کەوسەر بڵا لەو بەزمە حازر بم[٣]

---

(٩) واتە: خودایا چ بکەم تا خۆم وەها بسووتێنم کە ئیدی لە دەست هەرچی دەرد و ئەحواڵ و شتیوایە نەجاتم بێ.

(١٠) واتە: شەوێ تا ڕۆژ بناڵێنم و گریانەکەم هەتا بەیانی درێژەی هەبێ.

(١١) نەزەر: چاو لێکردن بە قەسدی چاکە و خۆشەویستی.

واتە: وەفایی هیچ ڕێگە عیلاجێ نابینم مەگەر ئەوەی کە سەراپا ببمە یەك ئینسانی نەزەرباز و ئەهلی تەماشا.

حافیز ئەڵێ:

در نظربازيِ ما بی‌خبران حيرانند ما چنينيم كه نموديم دگر ايشان دانند

[ ٣٢ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.

ڕەدیف: بم. واژەی قافیە: سابیر، ساحیر، حازر، و...

(٢) یاد: بیر. سابیر: خۆڕاگر. بەند: زیندان، زنجیر.

واتە: ئەگەر بێ‌یادکردنەوەی زولف و چاوەکەی تۆ تاقە ساتێ سەبر و خۆڕاگریم هەبێ یاخوا ئەسیری زنجیر و زیندانی کافر و کوژراوی زوڵمی سیحربازان بم.

لەف و نەشر و هەروەها تەشبیهی زولفی یار بە بەندی کافر و چاوی یار بە ساحیر و جادوو هەیە.

(٣) بڵا: دەبا، بهێڵە. ساقی کەوسەر: ئیستیعارە لە خاڵی یارە.

**نیگاهی گەرمی تاراجــی هــەموو دەرد و غــەمە وەك مــەی**

**کوشندەی میحنەتە قوربانی نەشئەی دەوری ساغر بــم(٤)**

**بە جەزبەی خاڵی ڕووت بەڵکوو بەباغی حوسنی تۆ شاد بم**

**دەبێ من هــەر لەســەر ئــایینی ئــیبراهــیمی ئــازەر بــم(٥)**

**کەمەندی زولفــەکــەی تــۆ بــمگرێ مــن عــاشقی ڕووتــم**

**موراد و مەتلەبێکی دیم نــییە، «غــیر از» تــو، کــافر بــم!(٦)**

---

☞

واتە: لێرەدا وەسڵ و پێکەوەبوونی خاڵی لای لێوت بۆ عاشق وەك ژیان وایە، تۆبی و ساقی کەوسەر، کە ئەو خاڵەی تۆیە، دەبا منیش لەو مەجلیسەدا حازر بم و لە کەوسەری دەمت ئاو بخۆمەوە.

(٤) نیگاهی گەرم: تەماشا کردنی عاشقانە و خۆشــەویستانە.کـوشندەی مـیحنەت: لابــەری غەم. نەشئە: نەشە و شادی کە لە خواردنەوە دەست دەدا. ساغر: پیاڵەی شەراب.

واتە: تەماشاکردنی یار بە گەرمی و موحەبیەتەوە وەکوو مەی لابەری دەرد و غەمە، بە قوربانی نەشئەی ساغەر بم کە غەم ناهێڵێ.

ێرەدا بە هێماوە چاوی یار بە پیاڵەی شەراب دەشوبهێنێ. دیارە ئەم شەرابە عیرفانییە هەروەك مامۆستا هەژاریش دەڵێ:

مەی ئەسڵەحەیە لەشکرە پەرچــەم شــۆڕشــە دژی دیکـتاتۆری غــەم

(٥) واتە: دەبێ من هەر لەسەر دینی ئیبراهیمی ئازەر بم چـونکە خـاڵی ڕووت دەمکـێشـێ بەرەو باغی جوانیت.

بەڵام نازانم بە چ مەبەستێ دینی ئیبراهیم پەسەند دەکا؟ شایەد ئـەوەی کـە ئـیبراهـیم بـوتی شکاند، یان مانگ و ڕۆژی بە خودا زانی یان لە ئاگر نەترسا، یەکێ لە مانە هۆکارە.

(٦) واتە: من عاشقی ڕووی تۆم، یا خوا ئەگەر درۆ بکەم بە کەمەندی زولفتەوە ئەسیر بم، وە ئەگەر موراد و مەتڵەبێکی دیکەش غەیری تۆم هەبێ یاخوا لە دین بەری بم.

موستەفا بەگی کوردی لەم بابەتەدا ئەڵێ:

ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم غەریبی کۆیــی دڵبــەر بــم

ئەگەر ساتێ لە یادم چی هیلاکی زەخمی خەنجەر بم

وەکوو پەروانە دەگریم و دەسووتێم دوور لە زولفی تۆ
هەتا کەی من لە داغی تۆ حەریقی ئاو و ئاور بم؟[٧]
بە خەندێکی دڵی بیماری ئەو چاوانە مەشکێنە
لە ئەم گوڵقەندە مەحروومم مەفەرموو بەڵکوو چاتر بم[٨]
«وەفایی»! گەر بە هەوپای وەسڵی زاری دڵ مەدە زولفی
مەحاڵی عەقڵە جەمعییەت کە من ئاشفتە خاتر بم[٩]

## [ ٣٣ ][١]

ئەی حوقەیی شەهد و شەکەرت ئابی حەیاتم
مردم، بە بەدەن بێنەوە بەو ئابە، حەیاتم[٢]

---

(٧) واتە: وەکوو پەپوولە دەگریم و دەسووتم، دوور بێ ئەو سووتانە لە زولفی تۆ، یان لە دووری زولفی تۆ، کە ئەمە ئیهامە، یان فرە مانایی بە قەولی مۆدرنیستەکان: هەتا کەی لە دووری تۆ خنکاوی ئاوی گریان و ئاگری سووتان بم.
دەکرێ ئەو «حەریقی»یە بە «غەریقی» و «حەریفی»یش بخوێنرێتەوە، بەڵام حەریفی لەهەموویان مانابەخشترە.
(٨) واتە: بە پێکەنینت دڵی من کە نەخۆشی چاوتە مەشکێنە، دەمت و پێکەنینت وەك گوڵقەندەی دەورەی نەخۆشیمە لەم دەوایەم مەحرووم مەکە بەڵکوو چاکتر ببمەوە.
لە نێوان بیمار و گوڵقەند و چاتر بوونەوەدا موراعاتی نەزیر هەیە.
(٩) جەمعییەت: ئاسوودەخاتری. پەرێشان: دڵ بڵاوی، زیددی جەمعییەت.
واتە: وەفایی ئەگەر بە هیوای گەیشتن بە دەمی یاری کە وەکوو جەمعییەت و ئاسوودەخاترییە، عاشقی زولفی یار مەبە کە نموونەی پەرێشانییە، موحاڵی عەقڵییە بەشەر هەم جەمع بێ و هەم پەرێشان، بە وتەی لۆژیکییەکان (مەنتیقییەکان): ئەمە قەزییەیەکی مانیعەتولجەمعە.

**[ ٣٣ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەب مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: حەیاتم، حەیاتم، سیاتم، و...
(٢) حوقە: سندۆقچە. دورج: سندۆقی جواهرات، ئیستیعارە لە دەمی یارە. ئابی حەیات:

**ئـاهوو کـە دەکـا جـیلوە چ شـیرینە نـیگاهی!**
**یەعنی بە فیدای غەمزەیی دوو چاوی سیاتم** (٣)

**سەودائیی زولفـی سـیەهت نـیم بـە هـەوایـی**
**تا ڕۆژی وەفاتم بە تـەمای مـیهر و وەفـاتم** (٤)

**بڕوانـە چـلۆن عـەکسـی عـیزارت لە دڵی دام**
**پەروانە بە دڵ سووختەیی شـەوقی چـراتـم** (٥)

**هــەر چـاوەنوارم کـە کـوتت دێم و نـەهاتی**
**یارەب مەدەدێ! سالیکی ڕێی هات و نەهاتم** (٦)

---

☞

ئـاوی بەقا، گۆیا هەرکەس بیخواتەوە نەمر دەبێ.
واتە: ئەی دەمت کە وەك سندۆقچەیەك لە هەنگوێن و شەکرە ئاوی حەیاتی منە، من مردووم بەو ئاوی حەیاتەی دەمت زیندووم کەرەوە.
(٣) ئاهوو: ئاسك کە بە چاو ڕەش و چاو جوان بەناوبانگە.
واتە: کاتێ کە ئاسك بەلەنجە و لار دێ و تەماشا دەکا و خۆی دەنوێنێ چەندە جوان و لەبەر دڵانە، مەبەستی لەو کارە ئەوەیە کە بڵێ خۆم بە فیدای چاوی ڕەشی تۆ دەکەم.
(٤) سەودایی: شێت و عەوداڵ. هەوایی: خۆڕایی و بێدەلیل. میهر و وەفا: داستانێکی کۆنە و بە مانای موحەببەت و وەفاداریشە. وەفات: مەرگ و مردن.
واتە: من بە خـۆڕایـی عـاشقی زولفـی ڕەشـی تـۆ نـەبووم تـا ڕۆژی مـەرگم هـەر چـاوەڕێی موحەببەت و وەفای تۆم.
جیناسی تەواو هەیە لە نێوان هەردوو وەفاتمدا.
(٥) واتە: بڕوانە چۆن وێنـەی ڕوخسـارت لە دڵمـدا جـێگـیر بـووە وەك پـەپوولەیەك بـە دڵ سووتاوی شەوقی چرای ڕوخساری تۆم.
(٦) هات و نەهات: لە عیرفاندا بەحسێکی گەورەیە یانی شایەد دنیا بە کەیفی ئێمـە نـەبوو.
سالیك: دەروێش، کەسێ کە لە هەوڵی عیرفاندایە.
واتە: من هەر چاوەڕوانی هاتنی تۆ بووم کە گوتت دێم کەچی نەهاتی، بۆیە وەك دەروێش هەر بە تەمای هات و نەهاتم.

☜

دڵ جیلوەگەهـ و جێ قەدەمی تۆ بـووە دیـدەم
هەرچەندە کە دوورم بـە دڵ و دیـدە لەلاتـم[٧]

سەرگەشتەیی سیڕی دەمی تۆم بەم ڕوخە دایم
گۆیا کـە دەقـیقە شـومەری ڕۆژ و سـەعاتم[٨]

بەو ڕەنگە دڵم داوە بە سیحری سەری زولفت
تا دڵ هەیە مـومکین نـییە لەو داوە نـەجاتم[٩]

گرتوومی قـولابی مـوژە بـۆ خـدمەتی ئـەبرۆ
یەعنی کە «وەفایی» وەرە مـن قـیبلەنوماتم[١٠]

---

☞

عومەری سوڵتانی لەم بابەتەوە دەڵێ:

نـــەهاتی بـۆ گــوتت دێم و نـــەهاتی ... نـــەهاتی بـۆیــە گــرتوومی نـەهاتی
بـــهاتبایەی گـــوڵم هــاتت دەهــێنـا ... چ خۆشە هات، بەلەعنەت بێ نـەهاتی

(٧) واتە: دڵم جێی پیشاندانی تۆیە و چاوم جێی هەنگاو و قەدەمی تـۆیـە ئـەگـەرچـی لێت دوورم بەڵام بە چاو و بە دڵ لە لای تۆم.

(٨) واتە: سەرگەشتەی دەمی تـۆم و لە سـیڕڕی دەم و ڕوخسـارت نـەگـەیشتم هـەر دەڵێی سەعات و ڕۆژ دەژمێرم و دایمە هەر لە حەرەکەتدام.

(٩) بەو ڕەنگە: بەو تەرزە، بەو چەشنە.

واتە: بە جۆرێ دڵم داوە بە سیحری جادووی زولفەکانت پێم وایە تا قیامەت لەو داو و بەندە ڕزگاریم نایەت.

(١٠) واتە: مژۆڵی پێم دەڵێ یار وەك قولاپێ گـرتوومی تـا خـدمەتکاری ئـەبرۆی بـم کـە لە میحرابی کەعبە دەچێ و برۆی پێم دەڵێ وەفایی وەرە مـن قـیبلە پـیشاندەری تـۆم لە مـنەوە قیبلەت لێ دەردەکەوێ.

[ ٣٤ ](١)

ئــەی نــەشئەی خــەندەی زارت شــیرینکاری حــەیاتم
عیشوەی زولف و عـیزارت مـوژدەی شـەوی بـەراتـم(٢)
فەرمووت: تۆم نـەمری نـاییم، نـاژیم نـەیتە سـەر جـێم
وەعــدەکــانت بــەخێر بـێ، هــەر چـاوەڕێی وەفـاتم(٣)
خۆزگەم بەوەی لە دووی تـۆ، هــەر دەنـوارێتـە ڕووی تـۆ
مــــردم بــــە ئــارەزووی تــۆ، قــوربانی ئــاشناتم(٤)
بــــە تــــیرێك دوو نــیشانە، شــایانی شــای تــورکانە
قوربانی دەست و بـازووی ئـەو چـاوەی سـورمەساتم(٥)
ئــەو تـیرە دات لە جـەرگم، دەرکـەوت ئـاساری مـەرگم
فەرمووت: کە دێ، بە سەر بـێ، بـەختم نـەبوو نـەهاتم(٦)

---

[ ٣٤ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن» بەحری موزاریعی موسەممەنی ئەخرەب. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: حەیاتم، بەراتم، وەفاتم، و...

(٢) شیرینکاری، شیرینکەر، خۆشکەر.

واتە: ئەی یارێ کە نەشەی پێکەنینی دەمی تۆ ژیانی من شیرین دەکات، زولف و ڕوخسارت کە بە عیشوە و نازکار دەکەن وەك مزگێنی شەوی جەژنی بەرات وان بۆ من. یانی لەو عیشوەتا دەردەکەوێ خەیاڵت هەیە شتێکم بۆ بەرات کەی.

(٣) واتە: تۆ فەرمووت بە گیانی تۆ قەسەم نایەم، ئاخر من تۆ نەبی ناژیم و وەعدەکانت کەی بە عەمەل دێ من هەر چاوەڕێی وەفا بە وەعدەکانتم.

(٤) واتە: خۆزگەم بەو کەسەی لە دواتەوە تێر تێر لە ڕوخساری تۆ دەڕوانێ، مردم بە ئاواتی تۆوە من فیدای ئاشناییت بم.

(٥) واتە: هەر پادشای تورکان دەتوانێ بە تیرێ دو نیشانە بپێکێ، چاوی پڕ لە کـلەی تـۆش دەڵەی شای تورکانە ئەویش دەتوانێ بە تیرێ دوو نیشانە لێدا.

(٦) واتە: بەو تیرەی لە جەرگت دام شوێنەواری مەرگم لێ پەیدا بوو. تۆ فـەرمووت ئـەگـەر دێی بۆ لام بە لاق مەیێ بەسەر وەرە کەچی من بەختم نەبوو نەمتوانی بەسەر بێم.

چـــی عـــیشقی تـــۆی لە دڵدا، دەســـتی لە ئـــاب و گـــڵ دا
داغـــی شـــێواوی ڕووتـــم، کـــوشتەی ڕەقس و ســـەماتم[(٧)]
تـــــیرت قـــەراری دڵ بـــوو، ئـــارامـــی دا بـــە جـــەرگم
بـــا دڵ دڵی نـــەمێنـــێ، ئـــەو جـــارەکـــەش فـــیداتـــم[(٨)]
ئـــەی ســـاقی خـــەرابـــاتی، قـــەترێك ئـــاوی حـــەیاتی
ئامان دەســـتی مـــنت دامـــان! ســـووتاوی نـــێو زوڵمـــاتم[(٩)]
ســـاقی چـــاوت بـــنوێنـــە، زوهـــد و تـــەقوام بســـتێنە
قوربانی جامێك مەی بـــێ، هـــەموو ســـەوم و ســـەلاتم![(١٠)]
مـــوتریب! هـــادی ڕۆحـــانی، لێدە تـــاری ســـوبحانی
شاباشی سۆزەی نەی بێ، هەموو جـــومعە و جـــەماتم[(١١)]

---

(٧) دەستی لە ئاب و گڵ دا: خەریکە دەمرێ. داغ کردن: نیشانە کردن بە غولامی.
واتە: هەرکەس عەشقی تۆی لە دڵە، دەبێ لە فیکری مردندا بێ، شێواوی ڕوخسارت منی داغ کردووە و ڕەقس و سەماکەشت دەمکوژێ.
(٨) واتە: تیرت کە دا لە جەرگم باعیس بوو دڵی بێقەرارم قەرار بگرێ و ئارامتر بـێ، لەبـەر ئەوەی دڵم دڵی نەمێنێ ئەوجاریش بە فیداتم تیرێکی دیکەی بۆ بهاوە.
(٩) واتە: ئەی ساقی خەراباتی، یەك قەترەم لە ئاوی حـەیاتت بـدەیە و دەسـتم بـە دامـانت سووتاوی نێو تاریکستانم.
لە نێوان ئاوی حەیات و زوڵماتدا موراعاتی نەزیر و تەلمیح هەیە.
(١٠) سەوم و سەلات: ڕۆژوو و نوێژ.
واتە: ساقی، چاوتم پیشان بدە و تەقوا و ئیمان و پارێز کردنم لێ بسێنەوە و تەواوی ڕۆژوو و نوێژەکانم بە قوربانی جامێکی شەراب بێ.
(١١) موتریب: ساز لێدەر. هادی ڕۆحانی: هیدایەتگەری ڕۆحەکان، دەشکرێ بڵێی ها دەی ڕۆحانی لێبدە.
واتە: موتریب تارێکی سوبحانی واتە عیرفانی لێدە، تەواوی جومعە و جەماعەتێ کە کردوومە، فیدای سۆزەی ئامێری شمشاڵ بێ.

ڕیشـێکـی گـێژ و وێژ بـێ، بـە ڕیـا دوور و درێژ بـێ
موشکل ئـەو پـووشە ویشکـە، بـێتـە مـایەی نـەجاتم[١٢]
دڵ پــڕ خــەو و خـەیاڵات، دەم بـە زیکـر و مـوناجات
زەحمەت بە ڕۆژی تاریك، خۆش بێ وەقت و سەعاتم[١٣]
دەمــێکــــە دڵ بــڵاوە، بــەو زولفــە پــێ بــە داوە
یا خودا بـە ڕووت گـوشا بـێ، غـەریبی دوور وڵاتـم[١٤]
نـەمزانـی گـوڵ دەپشکـووت، شـیرین بـە لێوی یـاقووت
یا تۆ بە خەندە فـەرمووت حـوققەی شـەهد و نـەباتم[١٥]
گوڵ عەتری خۆی بڵاو کـرد، دونـیای پـڕ لە گـوڵاو کـرد
لاڵ بــوو زوبـانی بـولبول، کـوشتەی زات و سـیفاتم[١٦]

---

(١٢) پووشی وشك: گیای وشکەوە بوو، ئیستیعارەیە لە ڕیش.
واتە: ڕیشێکی درێژ یان پان بۆ ڕیاکاری درێژ کرابێتەوە بە کەڵکی چی دێ، دیارە ئەم پووشە وشکە قەت باعیسی نەجاتی من نابێ.
(١٣) واتە: دەم پڕ بێ لە زیکر و خەیاڵات و دڵ پڕ بێ لە خەو و خەیاڵ، زەحمەتە بەو تاریکییە وەقت و سەعاتم خۆش بێ.
ڕوودەکی سەمەرقەندی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| روی به محراب نهادن چه سود | دل بـــه بـخارا و بـتان طـراز |
| ایـزد مــا وســوسەی عـاشقی | از تــو پـذیرد، نـپذیرد نـماز |

(١٤) دڵ بڵاوە: دڵ پەرێشانە. گوشا بێ: بکرێتەوە.
واتە: لە مێژە دڵم غافڵ و نیگەرانە یاخودا بکرێتەوە و شاد بێ بە ڕوخسـاری غـەریبی دوور وڵاتم.
دەبێ مەبەست لە غەریبی دوور وڵات شێخ عوبەیدیللا بێ.
(١٥) واتە: کاتێ تۆ قسەت دەکـرد بـەو لێوە شـیرینە یـاقووتییەت گـوڵ دەپشـکـووت و مـن نەمدەزانی کە چی تۆ دەمت دەتگوت سندووقچەی هەنگوێن و نەباتە.
(١٦) زات: وجوود، جیسم. سیفات: ئەخلاق و ڕەوش و کردەوە.

خۆش‌خوانی مەجلیسی گوڵ! بێنەوە جۆش ڕۆح و دڵ
بێ‌حاڵە زۆر «وەفایی» فیدای دەنگ و سەداتم[(١٧)]

[ ٣٥ ][(١)]

نیگارا! دڵبەرا! نامیهرەبان! یاری جەفاکارم
بە زاری کوشتمت! تاکەی دەفەرمووی من وەفادارم؟[(٢)]
دەڵێی مورغی شەباهەنگە لە دەوری سوبحی دیدارت
لە حەلقەی زولفی تۆ دێ دەم بەدەم ناڵەی دڵی زارم[(٣)]
بە دەردێ موبتەلا بووم جاهیل و دانا کە حەیرانن
مەگەر چاوی نەخۆشی تۆم نە مەخموورم نەهۆشیارم؟[(٤)]

---

☞

واتە: گوڵ عەتری بڵاوکردەوە دونیا پڕ بوو لە گوڵاو، زمانی بولبول لە حەیبەتا لاڵ بوو کوژراوی زات و سیفات بوون. دەشکرێ مەبەست لە زات گوڵ و لە سیفات گوڵاو بێت.

(١٧) واتە: ئەی گۆرانیبێژی مەجلیسی گوڵ، دەی بڵێ گۆرانی و ڕۆح و دڵ بێنە جۆش، وەفایی زۆر بێ‌حاڵ و بێ‌تاقەتە بە فیدای دەنگ و سەدات بم بە ئاهەنگێ حاڵ لێ بێنە.

[ ٣٥ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: کارم، وفادارم، زارم، و...

(٢) واتە: ئەی نیگاری دڵبەرم، نادڵسۆزم و ستەمکارم بە ناڕەحەتی و گریان من دەکوژی و دوایەش دەڵێی وەفاداری تۆم.

(٣) مورغی شەباهەنگ: مەلێکە شەو تا ڕۆژ ناخەوێ و هەر دەخوێنێ.

واتە: دڵی زارم وەك مەلی شەوخوێن بە دەوری بەیانیی ڕوخسارتدا لە داوی حەلقەی زولفتدا هەر ناڵەی دێ.

(٤) واتە: دەردێکم گرتووە زانا و نەزان تێی‌ناگەن دەڵێی چاوی تۆم هەم نەخۆشم و هەم مەستم و هەم هۆشیارم.

**گـەهێ سـووتاوی ئـەبرووتم، گـەهێ پـابەندی گـیسووتم**

**لە لایــەك ڕوو لە مـیحرابـم، لەلایـەك ڕوو بـە زونـنارم(٥)**

**نــــیشانەی قـــاتیلی نـــــامیهرەبانم زاهــیرە یــەعنی:**

**فەرەنگی خەت و زەنگی زولف و هیندوو خاڵ و دڵدارم(٦)**

**بە تـای زولفـی و چـینی تـوڕڕە دیـن و دڵ دەبـا چـاوی**

**دەڵێی مــن خـــانەوادەی ئـــاهوانـــی چــین و تـــاتارم(٧)**

**وەسییەت بێ کە مردم تەخت و تـابووتم لە عـەرعەر کـەن**

**هــەتا عـــالەم بــزانــێ مــن شـــەهیدی قـامەتی یـارم(٨)**

**«وەفــایی» دوور لە تــۆ پـەیوەستە حـاڵی شـین و گـریانە**

**لەبەر چاوت بە سـەد جـێ وەك نـیشانەی دڵبـریندارم(٩)**

---

(٥) واتە: تاوێ بە ئەبرۆت دەمسووتێنی و تـاوێ بـە پـەلکەت دەمبەسیتەوە، لایـێ ڕووم لە میحرابە یانی برۆت و تاوێ زوننارى مەسیحیانم لە ملدایە یانی پەلکەکانت.

(٦) زاهیرە: ئاشکرایە.

واتە: ئاشکرا و ڕوونە کە کێ قاتڵی نادڵسۆزی منە. ئەوکەسە یارێکە بە خەت و خاڵ و ڕوخسار فەرەنگییە، یانی سوور و سپییە، بە زولفی قەلەرەشەیە، واتە قژی ڕەشە بە خاڵەکەی خەڵکی هیدوستانە، واتە ڕەشە.

(٧) خــانەوادە یـان خـانەزادە: عـێل و تـەبار. تـاتار: سـەرزەمینێکـە لە مـەغولستان ئـاسکی بەناوبانگە.

واتە: یارم بە تاتای زولف و پەرچەمی دڵ دەڕفێنێ و دەڵێ من لە تایەفەی ئاسکی تاتار و چینم بۆنم خۆشە.

(٨) عەرعەر: دارێکی جەنگەڵییە کە ڕاست هەڵدەچێ و نمادی قەد و باڵای یارە.

واتە: بۆ ئەوەی سابت بێ کە یاری من قەد و باڵای وەك داری عەرعەر وایە، کاتێ مردم تەخت و تابووتی من لە داری عەرعەر سازکەن.

تەشبیهی موزمەری قامەتی یار بە داری عەرعەر.

(٩) نیشانە: ئەو شتەی کە دایدەکەن و بە تیر تێی هەڵدەکەن ئەوەندە دەیئەنگێون بریندار و کون کون دەبێ.

[ ٣٦ ][1]

گـــا دەســـووتێم گـا دەگــرییێم غــەرقی ئـاو و ئـاورم
ئـاخ لەبــەر بــەختی ســیا! نــازانـم ئـەز بـۆچ نـامرم؟[2]
هــەر کــە دەتــبینم دەڵێی تـۆ شـەم و مـنیش پـەروانـەتم
تـا سـەراپـا نـەبمە کـۆی زووخـاڵ قـەد ئـارام نـاگـرم[3]
هــەر ڕەگــەم تــارێکـە نـاڵەی دێ لە شـەوقی ڕوویـی تـۆ
عـەندەلیبم، مـوتریبم، خـۆشخوانـی گـوڵ ڕامشگـەرم[4]

---

☞

واتە: وەفایی دوور بێ لە تۆ -دوعایە- یان لە دووری تۆ -کە ئیهامە- هەمیشە خەریکی شیوەن و گریانە لەبەر چاوی جوانی وەك نیشانە هێندە تیری نیگای تۆم تێ‌هەڵکراوە لە سەد جێی دڵمەوە بریندار بووم.

[ ٣٦ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: ئاورم، نامرم، ناگرم، و...

(٢) واتە: جاری وایە دەسووتێم و جاری وایە دەگریم لە نێو ئاو و ئاگردا نقوم بووم، ئاخ نازانم من بۆچی بەو بەختە ڕەشەی خۆمەوە نامرم؟
لەف و نەشری موشەوەشی تێدایە.

(٣) واتە: هەر دەتبینم و تۆم وەکوو شەم دێتە بەرچاو و خۆشم وەك پەپوولەی دەوری تۆم هەتاگشت گیانم نەسووتێ و نەبمە زووخاڵ دەستبەرداری هەڵسووڕان بە دەوری تۆدا نابم.

(٤) عەندەلیب: بولبول. موتریب: ساز ژەن، ساز لێدەر. خۆشخوان: دەنگخۆش، گورانیبێژ. ڕامشگەر: هەر بە مانای ساز لێدەرە.
واتە: لە عەشق و یادی ڕوخساری تۆ هەر ڕەگێ لە ئەندامم وەکوو تار ناڵەیەکی لێوە دێ، هەر دەڵێی بولبول و موتریب و ڕامشگەر و خۆشخوانم.
موراعاتی نەزیر و هاومەعنایی لە عەندەلیب و موتریب و خۆشخوان و ڕامشگەردا کە هەوەڵ عەرەبی و دووەم فارسی و سێهەم کوردیە هەیە.

**زولف و ڕوو، بـاڵاو ئـەبرۆ و خـەت و خـاڵ و چـاوی کـاڵ**
**لەو تـەلیسمی حـەوت‌خوان زۆر مـوشکیلە ڕۆح دەربـەرم[٥]**
**عــەکسی زولف و ڕووتـە مـایەی جـۆششی گـریانی مـن**
**چبکــەم ئــاخر چــاو پــڕاوی دوودی عـوودی مـەجمەرم**
**حــەقمە خـوێن بگـریم لە بـێدادی خـەت و جـەوری نـیگا**
**مــن کـە گـیرۆدەی فـەڕەنگ، یـەخسیری دەسـتی کـافرم[٦]**
**پــێکــەنینت جــەزبی کــردم بـۆ سـەر و زولفـی سیاه**
**تــووتیی شــیرین کــەلام پــابەندی داوی شــەککــەرم[٧]**
**گــــاه پــــەرێشــــانی ڕوخ و گــا دڵشکســتەی قـامەتم**
**هــەر دە زولفـی تـۆ دەچـم سـەر گـەشتە و سـەوداسـەرم[٨]**

---

(٥) حەوت‌خوان: حەوت‌خان، ناوی یەکێ لە شەڕەکانی ڕۆستەمی زاڵە کە حـەوت قـۆنـاغ بووە، دەشکرێ حەوت دەشتی شاری عیرفان بێ.
واتە: ئەی یارەکەم تۆ هەوەڵ بە زولف و دووهەم بە ڕوو و سێهەم بە باڵا و چوارەم بە برۆ و پێنجەم بە خەت و شەشەم بە خاڵ و حەوتەم بە چاوی کاڵ حـەوت‌خانێکت بـۆ سـاز کـردم ڕەحمەتە لێی نەجاتم بێ و بپەڕمەوە.
تەلمیحە بە حەوت‌خانی ڕۆستەم.
(٦) واتە: ئەگەر لە جەور و ستەمی خەت و خـاڵی ڕوخسـارت بـناڵم نـاحەقم مـەگـرن مـن ئەسیری خەتی فەرەنگی و خاڵی کافری (ڕەشی) تۆم.
تەشبیه و لەف و نەشری تێدایە.
(٧) واتە: پێکەنینی تۆ ڕامی‌کێشا بـەرەو داوی زولفـی ڕەشت مـن وەکـوو تـووتی بـۆ لێوی شەکەرینت هاتم بە داوی زولفتەوە بووم.
عەشقی تووتی بە شەکر و شیرینی وتەیەکی مەشهوورە.
(٨) واتە: جارێ پەرێشانی ڕوخساری تۆم و جارێ دڵم شکستەی باڵاتە هەر عەینی زولفـی تۆ شێت و بێ‌قەرار و سەرگەشتەم.
لە نێوان پەرێشان، شکستە، زولف و سەوداسەردا موراعاتی نەزیر هەیە.

گەر بە ناز هەر دەمکوژی با تێر ببینم چاوەکەت
لێمگەڕێ جارێ بە کووچەی مەیفرۆشان ڕابرم(٩)

دوور لە تۆ زۆر بێقەرار بووم تا بە لوتفی چاوەکان
زەحمەتت دا بەر تەبیبان هاتی ئەمڕۆ چاترم(١٠)

حاسڵی سەیر و سلووکم بوو بە خەندەی زاری تۆ
گەه بەقا، گاهی فەنا، گەه غائیب و گەه حازرم(١١)

زاهید ئینسافت هەبێ، تۆ چت لە ڕەندی بادەخوار؟
تۆ و بەهەشت، تۆ و حوور و غیلمان، ئەمن و چاوی دڵبەرم(١٢)

---

(٩) کووچەی مەیفرۆشان: ئیستیعارە لە چاوی یارە کە هەمیشە مەستن و بە نازیش خەڵکی مەست دەکەن.

واتە: ئەگەر خەیاڵت هەیە بمکوژی لێمگەڕێ جارێ تێر تێر تەماشای چاوت بکەم کە دەڵێی کۆلان و مەڵبەندی مەیفرۆشانە با لە وێ تێر تێر مەست کەم جا ئیدی لە مەرگ ناترسێم.

(١٠) واتە: من زۆر نەخۆش بووم دوور لە باڵای تۆ، تۆ زۆر زەحمەتت دا بە تەبیبەکانت، کە چاوەکانتە، و نیگاهێکیان کردم و باشە ئەمڕۆ بەو تەماشاکردنەی چاوەکانی تۆ چاکترم.

(١١) سەیر و سلووك: قۆناغەکانی عیرفانییە لە ڕێڕەووەوە بۆ ڕێبەر. بەقا و فەنا: دوو مەقامن لە عیرفاندا کە سالیك دوای تێپەڕ بوون لە بەقا دەگاتە فەنا. غائیب: حاڵەتێکە لە عیرفان کە ڕێڕەو ئاگای لە خۆیەتی و لە خودا غافڵە. حازر: ڕێڕەو ئاگای لە خەڵك نییە و لای خودا حازرە، یان هەمیشە خودا بە حازر و نازر دەزانی. حاڵ و مەقام لە عیرفاندا فەرقیان ئەوەیە حاڵ زوو گوزەرە بەڵام مەقام پایەدارە.

واتە: حاسڵی ئەو هەموو سەیر و سلووکەی لە عیرفاندا پەیدام کردبوو بە خەندەیەکی لێوی تۆ لە دەستم دا، جارێ دیارم جارێ دیار نیم، جارێ ئاگادارم و جارێ بێ ئاگا.

موراعاتی نەزیر لە نێوان سەیر و سلووك و بەقا و فەنا و غائیب و حازردا هەیە.

(١٢) زاهید: تەرك‌کەری دونیا، سالیکی ڕیاکار. ڕەند: پیاوی ئازا و جوانمەرد. بادەخوار: مەینۆش. تۆ و بەهەشت: واتە بەهەشت بۆ تۆ، ئەم «واوە» لە فارسیدا واوی مەعییەتی پێ دەڵێن کە بۆ نەوعێ هەڕەشەیە.

واتە: ئەی زاهیدی بە زاهیر موسوڵمان تۆ کارت چییە بە لاتی و جوانمەردی مەینۆشەوە، تۆ

وەك «وەفـــایی» دڵ بـــدە دیـــن دانـــیّ بـــۆ ســـاحێب دڵێك
دا بــزانـــی بـۆچـی مـن عـاشق بـە حـوسنی مـەزهەرم[١٣]

[ ٣٧ ][١]

بـــە گـــوڵزاری ئـیرەم ـقـوربان ـ دەپـرسی گـەر لە ئـەحواڵم
نەخۆش و سەرخۆش و مەست و خوماری چاوەکەی کاڵم[٢]
پـــــەرێشـــــانم، بـــڵاوم، تـــێكشكـــاوم، خـــاو و شـــێواوم
دەڵێی شاماری زولفی تـۆم لە دووی تـۆ شـێت و عـەبداڵم[٣]

---

☞

بۆ بەلای بەهەشتی خۆتەوە بەهەشت هەر بۆ تۆ بە حۆر و غیلمانیەوە و منیش چاوی بەرزەکەمم بەسە و ئەوانەم ناویٚ.

(١٣) مەزهەر: سەرچاوە.

واتە: وەك وەفایی بکە ـهەر لەگەڵ زاهیدی بەیتی پێشوویەتی ـ دڵت بدە بە یارێك بە قیمەتی دینت، دینەکە بۆ خاوەن دڵ و عارفیٚ چاکە؛ ئەوکات دەزانی من بۆچی عاشقی سەرچاوە و بنەچەکی عاشقیم.

**[ ٣٧ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: ئەحواڵم، کاڵم، عەبداڵم، و...

(٢) گوڵزار: دەمی وەك گوڵ. ئیرەم: باغی ئیرەم، باغە سەیرەکەی شەددادی حاکم.

واتە: ئەی یارەکەم ئەگەر لە ڕووی کەرەم و دلۆڤانییەوە بە دەمی وەك گوڵت ئەحواڵی من دەپرسی نەخۆش و مەست و خوماری چاوی کاڵی تۆم.

(٣) شامار: ماری گەورە، پەلکەی یار دەشوبهێنیٚ بە شامار.

واتە: پەرێشان و دڵئاڵۆز و شکستەم هەر دەڵێی پەلکەی تۆم و بە دووی تۆدا شێت و عەبداڵی کێوانم و لە دووت دەگەڕێم.

لە نێوان پەرێشان و بڵاو و خاو و شێواو و زولفدا موراعاتی نەزیر هەیە.

بە نـازی چـاوەکـەی وەك بـازی، بـازی دام هـەتا پـیر بـووم
دەتــرسم هــەر بــە بــازی بـمکوژێ ئـەو یـاری مـنداڵم(٤)
نە داغـی جـەرگی خـۆم زانـی، نـە مـایەی بـەرگی خـوێنـینم
شــەهیدی دەشــتی عـیشقم، لالە ڕەنگـم، مـن کـەڕ و لاڵم(٥)
دڵەی بــێ‌هــۆش و گــۆشــم مــوددەتێکــە هــەر دەنـاڵێنــێ
خودا ڕوحمێ بکەی بەو مورغی حـەپسی بـێ‌پـەڕ و بـاڵم(٦)
بــفەرموو «بــا» پـەرێشـانم نـەکـا زولفت لەسـەر ڕووی تـۆ
ئەمان یا کاشفی زوڵمـەت، دەخـیل ئـەی شـەوچرای مـاڵم(٧)
بە خۆت سەرمەشقی زولف و دەرسی باڵات داوم ئەز چبکـەم
نــیشانە و دەســخەتی خـۆتـە ئـەگـەر ئـەلفم ئـەگـەر دالم(٨)

---

(٤) بازی (یەکەم): ئەو مەلە ڕاوچییە کە چاو لە مەلە ڕاوەکەی دەکات هەستی لێ‌دەبڕێ و بە ئاسانی دەیگرێ. بازی (دووهەم): یاری و گاڵتە. بازی دام: یاری پێ‌کردم.

واتە: یارم بە نازی چاوی وەك چاوی باز یاری پێ‌کردم هەتا جوانیم هەموو دانا، دەترسم ئەو یارە منداڵەم هەر بە یاری و شۆخییەوە بمکوژێ.

لە نێوان نازی و بازی یەکەم و دووهەمدا جیناس و لە نێوان بازی و منداڵیشدا موراعاتی نەزیر هەیە.

(٥) واتە: نە زانیم چۆن جەرگم داخ کراوە و نە زانیم بۆچ بەرگم تا ئەو ئەندازەیە خـوێنـاوی بووە؟! من وەك شـەهیدی عـەشقم و ڕەنگـم وەك لالە سـوورە و وەك شـەهید و گـوڵی لالە بێ‌دەنگ و گۆشەگیرم.

(٦) واتە: دڵی بێ‌هۆش و بێ‌گوێم ماوەیەکە ناڵە ناڵیە، سا خودا ڕوحمێ بکە بەو دڵەم کە وەك مەلێکی بێ‌پەڕ و باڵە و لە قەفەسدا ئەسیر بووە.

(٧) واتە: بە «با» دەستوور بدە زولفەکەت لەسەر ڕووت لانەدا، ئەی ئەو کەسەی کە تاریکی لادەبەی و بە شەوا چرای ماڵمی، دەخیلت بم هاوارم بۆ هێناوی.

(٨) بە خۆت: بۆ خۆت. ئەز: من. سەرمەشق: ڕێنمایی، دەست پێ‌گرتن.

واتە: کە تۆ بۆ خۆت منت فێری ناسینی زولف و دەرسی باڵات کردووە من تاوانم چییە، من بە دەستخەتی تۆ ناسراو و نیشانە کراوم جا ئەگـەر وەك ئـەلف ڕاست و ڕێك بـم، یـا وەك دال چەماوە بم.

**ئەمن ئیفتادە بووم تۆ خـۆت بـە ڕەحـمـت دەستگـیرم بـووی**
**پـەشیمانی نـە شـێوەی تـۆیـە، ئـەی خـورشیدی ئـیقباڵم(٩)**
**ئیشارەی چاو و عیشوەی زولفەکەت بوون مورشیدی ڕێگـام**
**ئەگەر دەیـری مـوغان قـیبلەم، ئـەگـەر زونـنارە بـەرماڵم(١٠)**
**بە تیغی غەمزە ئەمن و تەرکی ڕووی تۆ؟ قـەت مـەڵێ قـوربان**
**ئەگەر قیمەم بکەن هـەر ڕۆژ پـەرستم، هـەر بـەیەك حـاڵم(١١)**
**ئەمن هەر تـۆم دەوێ، مـن چـم لە ڕۆح و چـم لە دیـن داوە؟!**
**بـە قـوربانی تـەماشایێکـی تـۆ سـەد جـار سـەر و مـاڵم**
**لە تـــاو دەردی دڵی دێوانــە خــوێن دەگــریم و نــازانــم:**
**نە خەستەی چاوەکەی مەستم، نە ڕەنجەی پەنجەکەی ئاڵم؟(١٢)**

---

(٩) ئیفتادە: پیر و پەككەوتوو.
واتە: ئەمن پیر و پەككەوتە ببووم لە ڕێی ئەویندا ئەتۆ بۆ خۆت دەستگیری من بووی، ئێستا تۆ بۆ پەشیمان بوویەوە ئەی یارێ کە وەك هەتاوی شانسم وای؟ پەشیمانی شێوە و ڕەوشتی تۆ نییە.
(١٠) مورشید: ڕێبەر، شێخ. دەیری موغان: کلیسا و عیبادەتخانەی گاورەکان. زوننار: پشتوێن، یان زنجیری ملی مەسیحیان.
واتە: ئیشارەی چاوت و عیشوەی زولفت بوونەتە ڕێبەر و مورشیدی من، ئەگەرچی ئێستا قیبلەم دەیری موغانە و بەرماڵی نوێژم زوننارى مەسێحییانە.
موزمەرەن دەڵێ: چاوت مەیخانەیە و پیاو کافر دەکا و زولفت وەکوو زنجیری ملی مەسیحیانە.
(١١) ئەمن و وازهێنان لە ڕووی تۆ؟!: خودا نەکا کاری وا ڕوو بدا، «واو» بۆ ئیستیبعادە یانی دوورە لە من. قیمە کردن: ورد کردن وەك گۆشتی کەباب. ڕۆژ پەرست: میترائیسم، ڕۆژ مەبەست ڕوخساری یارە.
واتە: ئەگەر چاوت بە تیری غەمزە بیەوێ من واز لە تەماشای ڕوخساری تۆ بێنم مەحاڵە. من هەر ڕۆژ پەرستم، هەر لە سەر یەك حاڵم.
(١٢) ئاڵ: سوور.

**بــە مــەرگی مــن بــە ڕەمــزێکــی بـڵێ بـەو چـاوە حـاڵیـم کـا**
**ئــەتۆ نــازدار و بــیماری، ئـەمن بـۆچ زار و بـێ‌حـاڵم؟!(١٣)**
**کوتی: بـۆ کـوێ دەبـەی ڕۆحت «وەفـایی»؟ دەوریـان گـرتی!**
**نیزامی پـەرچـەم و سـەربازی زولف و عـەسکەری خـاڵم(١٤)**

## [ ٣٨ ](١)

**نەخۆش و مـەستی دوو چـاوی کـاڵم   حــەقم بــە دەســتە ئـەگـەر بـناڵم(٢)**
**بە غەمزەی چاوت بە خـەندەی زارت   بردیان بە غـارەت خـەو و خـەیاڵم(٣)**

---

☞
واتە: لە حەیبەتی ئێشی دڵم بە جێی فرمێسك خوێن لە چاوم دەبارێ نازانم خـەتای ئـەوەیە برینداری چاوی کاڵم یان ڕەنجاو و ئێش پێ‌گەیشتووی پەنجە سوورەکەی تۆم.
(١٣) چاوی بیمار: چاوی خومار، چاوی عاشق نەخۆشخەر، چاوێك کە بە ئارامی هەڵدێ.
واتە: ئەتۆ بە مەرگی خۆم قەسەم دەدەم بە شێوەیـەکـی نـهێنـی بـەو چـاوە کـاڵەت بـڵێ کـە تێم‌گەیەنی، ئەگەر ئەو خومار و نازدارە من بۆچی ناڕەحەت و بێ‌حاڵم؟.
(١٤) نیزام: سەرباز، ڕەدیف. پەرچەم: زولف. سەرباز و عەسکەر: چەکدار.
واتە: گوتی ئەی وەفـایی ڕۆحت بـۆ کـوێ دەبـەی تـازە دەورت گـیراوە و گـەمارۆیـان داوی سەربازەکانی زولفم و نیزامییەکانی پەلکەم و ئەرتەشی خاڵەکانی ڕوخسارم.
لە نێوان عەسکەر و نیزامدا موراعاتی نەزیر هەیە.

**[ ٣٨ ]**

(١) کێشی شیعر: «فعلن فعولن فـعلن فـعولن» بـەحری مـوتەقاریبی مـوسەممەنی ئـەسلەم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: کاڵم، بناڵم، خەیاڵم و...
تێبینی: ئەم کێشە تایبەتی ئەشعاری تەك بەیتی و مەسنەوییەکانی کوردییە و کەمتر بە کاری غەزەل دێ، بەڵام یەگجار لە کوردیدا باوە و زۆربنەی شیعری فولکلۆری کوردی بەم کێشـە گوتراوە بە تایبەت شاعیرانی هەورامی وێژ وەك مەولەوی و بێسارانی و...
(٢) واتە: لەبەر دوو چاوی کاڵ نەخۆش و مەستم، ئەگەر ناڵەش بکەم حەقم بە دەستە.
(٣) غەمزە: بە نازەوە چاو لە کەسێ کردن. زار: دەم.
واتە: بە تەماشا کردنی چاو و پێکەنینی دەمت خەو و خەیاڵی منت بە تاڵان برد.

فەرمووت: چلۆنـی؟ چ بـڵێم عـەزیزم؟ ـ دوور لە زولفی تۆ ـ کافر بە حـاڵم[٤]
بە یـادی چـاوت چـوومە خـەرابـات لە ڕەهنی مەی دان خەرقە و بەرماڵم[٥]
من مورغی قودسی لە لامەکـان بـووم ئـیلاهی ڕوحـمێ شکسـتە بـاڵم[٦]
شـەوێکـە تـاریك، ڕێـیـێکـە بـاریك هـەر بـە ئـومێدی چـرای جـەماڵم[٧]
بـە تـیری نـازت بـڕاوە جـەرگم بـۆ چـاوی بـازت نـەماوە حـاڵم[٨]
وەك من بە چاوت یـەخسیری زولفـم کـەس وا نـەگـیرێ بـە داوی زاڵم![٩]
خۆش بەو دەمانە گوڵ گوڵ دەپشکووت شـەکـر دەبـاری پـرسی لە حـاڵم[١٠]

---

(٤) واتە: تۆ لە منت پرسی حاڵت چۆنە؟ ئازیزم چیت عەرز بکـەم دوور لە زولفـی تـۆ (کـە ڕەش وەك کافر وایە)، کافر بە حاڵم بێ، یانی وەزعم لە دووری زولفی تۆ خراپە.

(٥) خەرابات: مەیخانە، لە ئیستیلاحی عیرفانیدا یانی خانەقا. ڕەهن: گرەو، بارمتە. خـەرقە: لیباسی کۆنی دەروێشان و عاریفان. بەرماڵ: سەجادە، ئەو پارچەیەی نوێژی لەسەر دەکەن.
واتە: بە یادی چاوی تۆ کـە وەك مـەیخانە وایـە و هـەمیشە مـەستن، چـوومە مـەیخانە مـنی موسوڵمان لیباسەکان و بەرماڵەکەم لە بارمتەی مەی و شەرابدا داناوە.

(٦) قودسی: پاك و موقەدەس. لامەکان: بێ جێ، کن خودا.
واتە: من مەلێکی ئاسمانی بووم ڕێز و حورمەتم هەبوو سا خودایە ڕەحمێ بە حاڵم بکە ئێستا باڵم شکاوە.

(٧) واتە: لە شەوێکی تاریك و ڕێگایەکی باریکدا هەر بە هیوای شێوەی جوانی یارم کە وەك چرا ڕێم بۆ ڕوون بکاتەوە.

(٨) واتە: جەرگم بە نازت کە وەك تیر وایە بڕاوە، بۆ چاوت کە وەك چـاوی بـاز وایـە حـاڵم نەماوە.
تەشبیهی ناز بە تیر و چاو بە باڵندەی بازی شکارییە.

(٩) واتە: یاخوا وەك من بە داوی زولفی تۆوە گیرۆدەم هـیچکەس لە داوی زاڵمـانیشدا گـیر نەکات.

(١٠) گـوڵ گـوڵ: وەك عـەجەم دەڵێن گـولە گـولە، قـەیدی حـاڵەتـە واتـە دەمـی وەك گـوڵ دەپشکووت.
واتە: خۆشا بە حاڵی ئەو کاتەی لە دەمی وەکوو گوڵی گـوڵ دەپشـکووت و یـارم بـەو دەمـە جوانەی لە حاڵی پرسیم و لە دەمی قەند دەباری.

سەبا دەخیلم هەر تاکوو ماوم بڵێ بە زاری، بە ڕوو بە خاڵم
دەمێکی بابێ دەوای دڵم کا بە چاوەکانی گەلێ بێحاڵم(١١)
«وەفایی» چی دیت لەسەر بگێڕێ؟ نەما لەسەر تۆ نەسەر نە ماڵم(١٢)

[ ٣٩ ](١)

تا بادی خەزان دایە گوڵ و بەرگی ڕەزانم
سەد جێ وەکوو بولبول لە جگەر داغی خەزانم(٢)

---

(١١) ئەمە مانای ئەم شیعرە و شیعرە پێشووەکەیە. سەبا: بایەکە دەڵێن نامەبەری عاشقانە. بە زاری: بە گریان و پاڕانەوە. ڕوو بە خاڵ: ئیستیعارەیە لە یار. دەمێك: تاوێك، لەحزەیەك. بە چاوەکانی: واتە بە چاوەکانی قەسەم. ئەم دوو بەیتە مەوقووفولمەعانین.
واتە: ئەی بادی سەبا بە پاڕانەوە بە یار بڵێ تاوێ بێ و دەوای دەردم کات، بە چاوی قەسەم زۆری بۆ نارەحەتم.
(١٢) لە سەر گێڕان: سەدەقە، قەزاوەگێڕ.
واتە: وەفایی هەرچی هەبوو پێشکەشی کردی لەسەر تۆ، سەر و ماڵم هەموو لە دەستچوو، ئیدی چی دیکەی ماوە لەسەر تۆ بگێڕێ.

[ ٣٩ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: ڕەزانم، خەزانم، زوبانم، و...
تێبینی: ئەم غەزەلە کە نزیك بە قەسیدەیە یەکێك لە شاهکارەکانی وەفاییە کە دابڕان و جودایی دەگەیەنێ، جا نازانم مەعشووق شێخ «عبیداللە»یە یان کەسێکی دی، بە هەر حاڵ دەشکرێ حافیز ئاسایی هەردوو لای لە نەزەربێ.
(٢) ڕەزان: باخی ترێ.
واتە: لەو ڕۆژەوە بایی پاییزی گەڵای باخە ترێکەی منی گەستووە وەکوو بولبول داغ بووم و لە جگەرمدا داغی پاییز لە سەد جێ دیارە.
لە نێوان ڕەزانم و خەزانمدا جیناسی ناتەواو هەیە.

**وەك بەرگی گوڵم دی کە بە با چوو بە ئەسیری**
**کڕ کەوتم و شێت بووم، عەبەسام، لاڵ بوو زوبانم**[٣]
**قومری وەرە هەرتا دەمرین پێکەوە بگرین**
**تۆ سەروی ڕەوانت چووە من ڕۆحی ڕەوانم**[٤]
**بولبول وەرە تا ڕۆحی من و تۆیە بناڵین**
**تۆ باغی گوڵانت چوو ئەمن داغی دڵانم**[٥]
**ئەی مەعدەنی شیر و شەکەر، ئەی گوڵبەر و دڵبەر**
**ئەی تازە گوڵی دارە گوڵی باغی جینانم**[٦]
**کەس سیرڕی دەم و عیشقی میانی نەدەزانی**
**ئەشکم بووە غەممازی هەموو ڕازی نیهانم**[٧]

---

(٣) کڕ بووم: بێدەنگ بووم. عەبەسام: تاسام.
واتە: ئەوکاتە گەڵای گوڵم دی کە "با" بە ئەسیری بردی، بێدەنگ بووم و تاسام و زبانم لاڵ بوو و هیچ قسەیەکم بۆ نەکرا.
(٤) قومری: کۆترەبارێکە کە عاشقی داری سەوڵە. سەروی ڕەوان: یاری وەك سەوڵی بەڵابەرز. ڕۆحی ڕەوان: گیانی ئینسان.
واتە: ئەی قومری وەرە با پێکەوە بگرین تۆ لە حەیبەت سەوڵی خۆت و من لە حەیبەت گیانم کە یارەکەمە.
(٥) واتە: بولبول وەرە با تۆش هاوگریانم بی، تۆ بۆ باغی گوڵت بگری و من بۆ ئەوکەسەی کە بەجێی هێشتم و دڵی داغ کردم.
(٦) گوڵبەر: سەمەر گوڵ. جینان: بەهەشت.
واتە: ئەی یارێ کە کانگای شیر و شەکەری، سەمەرت گوڵە و دڵبەری، تۆ گوڵێکی تازەی باغی بەهەشتی منی.
(٧) غەممماز: قسە هێنان و بردن، سوخەنچین.
واتە: هیچکەس ڕاز و سیرڕی دەمی بچووك و قەدی باریکی تۆی نەدەزانی، ئەوە گریانی من بوو بۆ ئەو دوانە بووە شوفار و ڕازەکەی لێ ئاشکرا کردی.

تــۆ چــونکە لە لەیــلا گــەلێ شــیرینتری بـۆیـە
مــەجنوونی دەر و دەشـتم و فـەرهادی زەمـانم(٨)
ئـیشم هــەموو نــاڵیــنە لە ئـێشــی دڵی ڕێشـم
کــارم هــەموو گــریانە لەبــەر دەردی گـرانـم(٩)
بـۆ گـەردەنی تـۆ بـوومە ئـەسیری سـەری زولفت
مــن مــورغی شـەباوێزم و عـاشق بـە بـەیانم(١٠)
جان بەخشە دەڵێن ماچی دەمت وەقتی تـەبەسسوم
تاکەی بمرم موعجیزەی ئـەم سـیڕڕە نـەزانـم!(١١)
جەزبەی نیگەهت خۆشی نەهێشتم -بە برۆی تـۆ-
قیبلەم چووە تا مـەستی مـەیی پـیری مـوغانم(١٢)

---

(٨) واتە: دەزانی من بۆ مەجنوونی دەرو دەشت و فەرهادی زەمانم؟ چونکە تۆ زۆر لە لەیلا شیرینتری.
لە واژەی شیریندا ئیهام هەیە، هەروەها حوسنی تەعلیل و تەلمیح و مـوراعـاتی نـەزیریشی تێدایە.
(٩) واتە: کارم لە حەسرەتی دڵی بریندارم هەمیشە ناڵینە و لەبەر دەردی گرانم کارم هەمیشە گریانە.
(١٠) واتـە: بـۆ گـەیشتن بـە گـەردنت ئـەسیری زولفت بـووم مـن وەك مـەلی شـەواهـەنگ (تاقتاقکەرە) عاشقی بەیانم. واتە لە شەوی زولفتدا هەر دەخوێنم تا بەیانی گەردنت ببینم.
(١١) تەبەسسوم: بزەی لێو.
واتە: دەڵێن ماچی دەمت لە کاتی بزەدا گیان دەبەخشێ، تا کەنگێ مـن بـمرم و ڕەمـزی ئـەم ئیعجازە نەزانم دەماچێکم دەیە با بزانم ڕاستە زیندوو دەبمەوە؟
«حسن الطلب»ی تێدایە.
(١٢) واتە: قەسەم بە ئەبرۆی تۆ جیلوەی تەماشاکـردنت خـۆشـی نـەهێشـتووم لەو ڕۆژەوە مەستی مەیی پیری موغانی نیگای چاوەکانی تۆ بووم مەیلی کەعبەی برۆکانتم نەماوە.

فەرمووی: کە لەگەڵ هاتم ئەتۆ ڕۆح بدە، چاوم!
سا ساقی، دەجا جامێ کە هەروا نیگەرانم[(١٣)]
چاوت بە نیگەه کردن و زارت بە تەبەسسوم
هاتن بە تەمای غارەتی عەقڵ و دڵ و جانم[(١٤)]
ئەو دەستە سوارێکە ئەمیش تازە بەهارێ
ئەو ڕاو و شکارێکە منیش کاس و نەزانم[(١٥)]
کێو هاتە سەدا و ناڵە بە هاواری «وەفایی»
جارێکی لە تۆ کاری نەکرد ئاه و فوغانم![(١٦)]

(١٣) واتە: فەرمووی کە هەر من هاتم تۆ گیانی شیرینت بدە لە قەدەمی من دا، دەساقی وەرە جامێکم بدەیە من هەر وا چاوەڕوانی هاتنی یارم تا ئەویێت و من بە مەستی گیانی شیرینی پێشکەش کەم.
(١٤) واتە: چاوت بە تەماشاکردن و دەمت بە بزە و پێکەنین هاتن بە تەمای ئەوەن عەقڵ و دینی من غارەت بکەن.
(١٥) واتە: چاوت بە مژۆڵەکانیەوە وەك دەستەیەك سواری جەنگین و دەمت وەکوو تازە بەهارێ وایە، یار بە پێکەنینەوە خەریکی ڕاو و شکارە و منیش نەچیرێکی گێژ و نەزان زۆر زوو دەگیرێم.
لە نێوان ئەم شیعرە و شیعری پێشەوەیدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە.
(١٦) واتە: بە دەنگ و سەدا و هاواری وەفایی کێو وەناڵەکەوت کەچی ئاه و زاری من جارێك لە تۆ کاریگەر نەبوو.

[٤٠][1]

بــەجارێکـــی تــەماشای تــۆ، فـیدات بــێ، هــەم دڵ و دیــنم
ئەگــەر سـەد جـار قـیامەت بـێ دەمـێکـی هـەستە بـتبینم[2]
لە غەمزەی چاوەکەت دەتکـێ لە جـەرگم خـوێن و نـازانـم
نە خەستەی پەنجەیی بازم؟ نە بـەستەی دەسـتی شـاهینم![3]
مەگەر زولف و ڕوخت وەك لالە حاڵی بـێ کـە مـن بـۆچـی
جگـەر سـووتاو و سـەرتاپا غـەریقی مـەوجی خـوێنـینم[4]
وەکوو نەی کون کـونە جـەرگم لە تـاو هـیجرانـی تـۆ بـۆیـە
بـە سـۆزی نـەی دەسـووتێم و بـە نـاڵەی نـەی دەنـاڵێنـم[5]

---

[٤٠]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: دینم، بینم، شاهینم و...

(٢) واتە: هەم دڵ و هەم دینم فیدای تاقە جارێکی تەماشای تۆ بێ، ئەگەر تۆ هەستیە سەر پێ قیامەت ڕادەبێ قەیدی ناکا سەد جار با قیامەت ڕابێ تۆ هەستە سەرپێ با چاوم پێت بکەوێ.

(٣) باز: باڵندەی ڕاوچی، ئیستیعارە لە چاوی یارە. شاهین: جۆرێکی تر لە باڵندەی ڕاوچـی. خەستە: بریندار.
واتە: لە تەماشا کردنی تۆ بە چاوی پڕ ناز و غەمزەتەوە خوێن لە جەرگم دەتکێ و من نازانم برینداری بازم یان بەستراو و گیراوی پەنجەی شەهێنم. کە هەردوو ئیستیعارە لە چاوی یارن.

(٤) لالە: هەم دەکرێ لاولاوی ئاوی بێ و هەم دەکرێ مەشخەڵ یان چرادەستی بـێ، هـەم دەبێ گوڵە مێلاقە بێ کە هەناوی ڕەش و سووتاوە.
واتە: مەگەر هەر پرچ و ڕوخساری تۆ بزانێ کە من وەك گوڵە مێلاقە هەم دەسـووتێم و هـەم غەرقی خوێناوم.

(٥) واتە: جەرگم وەك شمشاڵ کون کون بووە و لە تاوی تۆیە بۆیە وەك شمشاڵ لە دووری تۆ هەر ناڵەم دێ.

**ئـــەتۆ ســـەروێکـــی ڕەنگـینی، لەسـەر چـاوان بـە شـیرینی**
**لەبــەر چـاوم نـەڕۆی چـاکـە، حـەیاتم، غـارەتی دیـنم!(٦)**
**ئەتۆ گوڵ، عەنبەرین ڕێی تۆ، ئـەمن خـاکـی بـەری پـێی تـۆ**
**لە مـن تـۆ زیـز نـەبی چـاکـە، عـەزیزم، ڕۆحـی شـیرینم(٧)**
**کوتم: دا ڕوومەتت وا بـێنـە بگـرم زولفـەکـەت! فـەرمووی:**
**بڵا گوڵ تێکنەچێ، بولبول نـەسووتێ، چت لە پـەرژینم؟(٨)**
**بە باغم کوت: بە ڕەنگ و بۆت مـەنازە، زەرد و سـوور بـووە**
**ئەگەر بـارم هـەموو سـونبول بـێ تـاێک زولفـی نـاهێنـم(٩)**
**کوشندەی من نەبوو هیچکەس مەگەر سەردایـرەی حـوسنی**
**لە ڕۆژی حەشرێ خوێنی خۆم لە چاوی مەستی دەستێنم(١٠)**

---

(٦) واتە: تۆ وەکوو سەوڵێك ڕێك و پێکی لەسەر چاوانمدابە، چونکە نازدار و شیرینی، جا بۆیە لەبەر چاوم نەڕۆی چاکە و هەر لەبەر چاومدا بی، ئەی کەسێ کە هۆی غارەت و تاڵانی دینی.

(٧) واتە: ڕێگایەك کە تۆی پێدا دەڕۆی بۆنی گوڵ و عەنبەری لێ دێ و منیش خاکی بەری پێی تۆم ئەی ڕۆحی شیرینم وا چاکە لە من زیز نەبی.

(٨) پەرژین: تەیمان، پەرچین، ئیستیعارە لە زولفی یارە. بڵا: لێ گەڕێ.

واتە: گوتم یارەکەم ڕوومەتت وابێنە تا زولفەکەت بگرم، گوتی: با ڕوخساری وەکوو گوڵی من تێکنەچێ و تۆش وەك بولبول نەسووتێی و ئەو زولفە کە وەك پەرچین و تەیمانی ڕوخسـارمە کارت بەسەریەوە نەبێ.

(٩) زەردو سوور بووە: زەرد و سوور بووەوە، شەرمی کرد، یان تووڕەبوو.

واتە: گوتم ئەی باغ تۆ بە ڕەنگ و بۆی خۆت مەنازە! ئەو شەرمی کرد و گوتی: ئەگەر تەواوی سەمەرم گوڵ بێ تاڵێ زوڵفی یار ناهێنم و ئەو لە من بە قیمەتترە.

سیفەتی تەشخیسی تێدایە. (لێرەوە قافیەی شیعرەکە دەکرێ بە (ێ)ی باڵەدار کە دەبێ لاواز بخوێنرێتەوە بە تەلەفوزی مەنگۆڕانە، نەك (ی)ی قەڵەو).

(١٠) کوشندە: قاتڵ، بکوژ. سەردایرە: ڕەئیس، سەرۆك. خوێن: دییە، خوێنبەها، خوێنبایی.

واتە: هیچ کەس و هیچ شتێ منی نەکوشتووە مەگەر چاوی یار نەبێ کە سەرۆکی جوانی ئەوە و نە ڕۆژی مەحشەردا تاوانی خۆم لە چاوانی یار دەستێنم.

**له باتی خوێنی خۆم، وەك زولفی، تـەسكینیم بـە هـیچ نـایێ**
**مەگەر دەستی شكستەی خۆم لە گەردنی زەردی وەربێنم**(١١)
**شەكەر قەدری نییە، قوربان، ئـەگـەر شـیرین نـەبێ، یـەعنی:**
**دەبێ تۆش لێوەكەت بێنی ئەگەر مـن ڕۆحـەكـەم بـێنـم**(١٢)
**بـــەنازی چـاوی بـازت وەك «وەفـایی» كـەوتمە نـێو زولفت**
**ئەوێستاش مەست و مەخموری شەرابی جامی دووشینم**(١٣)

••••••—●—••••••

**[ ٤١ ]**(١)

**له داغـــی زولفـــی یـــار و عـــاریزی وەك لالە سـووتاوم**
**بـە ڕەنگـی لالە بـۆیـێ داغـدار و غـەرقی خـوێنـاوم**(٢)

---

(١١) واتە: هەر وەكوو زولفی یار دەستی شكستەی خۆی لە ملی یار كردووە منیش لە باتی دییەی خۆم دەبێ وەك زولفی بێقەراربم و دەستێ لە ملی زەردی وەرێنم و دەستم لە ئەستۆی كەم.
تەشبیهی موزمەری زولفی یار بە دەستی شكستەی خۆی لە ملی یاردا. هەروەها تـەشبیهی مورەككەبیشە.
(١٢) شەكەر: نێوی مەعشووقەی خەسرەو پەرویز. شیرین: نێوی گەورە ژنی خەسرەو پەرویز.
واتە: ئەگەر شیرین نەبێ شەكەر قەدری نییە، لێوی یاریش وەك شەكرە گیانی من بەو شیرینیە پێشكەشی ئەو شەكرەیە.
تەشبیهی لێوی یار بە شەكر و گیانی خۆی بە شیرین. هەروەها ئیهام و تەلمیح و مـوراعـاتی نەزیریشی تێدایە.
(١٣) واتە: دوێشەو جامێ شەرابی دامێ وەك وەفایی كەوتمە داوی زولفی كەچی ئێـستاش هەر مەست و سەرخۆشی ئەو جامەی دوێشـەوم.

**[ ٤١ ]**

(١) كێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: سووتاوم، خوێناوم، لێداوم، و...
(٢) عاریز: ڕوخسار، سەر و ڕوو. لالە: شەمع، چرای دەستی، مەشخەڵ. بەڕەنگی: وەكـوو.

**دوو چـــاوی مـەستە بـیْبـادە، مـەلایك ڕوو، پـەریزادە**
**پـــەری دێوانـــەیی کـردووم، مـەلایك دەسـتی لێداوم**[٣]
**لە سەودای خـەتتی یـاقووتی لەب و کـاکـۆڵی ڕێحـانی**
**وەکوو زولفی شکسـتە تـێکشکـاو و خـاو و شـێواوم**[٤]
**لەبەر چاوت کە ڕەمـزی نـوکتەبازی مـەکـتەبی حـوسنە**
**وەها مەستم لە ڕەنگی حەرفی مەعنا لەوحی شـۆراوم**[٥]
**لە نێو سەیلی سوروشك و سۆزی دڵ حەیران و مەبهووتم**
**لە دووری تۆ عەجەب ماوم! نە خنکاوم، نە سووتاوم!**[٦]

---

☞

لالە: گوڵی مێلاقە، هەڵاڵە.

واتە: لە داخی ڕەشیی زولفی یار و سووری ڕوخساری وەك چرایدەستی گڕم گرتووە هـەر بۆیە وەکوو گوڵی خاشخاشە لە خوێندا غەرق بووم.

لە نێوان هەردوو لالەدا جیناسی تەواو هەیە.

(٣) بادە: شەراب. پەریزادە: فریشتەزادە، غەیری بەشەر. مەلایك دەستی لێدان: واتە شێتی و جنوون.

واتە: چاوی یار بێشەراب مەستە و ڕووی وەك مەلائیکەیەو دەڵێی لە فریشتە بووە، جا بۆیە من شێتی بووم.

(٤) واتە: لەبەر ڕوخساری سووری و لێوی سـووری و پـەرچـەمی وەك ڕەیـحانی و زولفـی تێكشکاوی خاو و شێواو و پەرێشانم.

موراعاتی نەزیر لە نێوان یاقووت و ڕەیحان و شکستە و خەتدا، کە جۆرەگەلی خەتی خۆش نووسینن، هەیە.

(٥) لەوح: تـەختە و تـەتەڵەی لێنـووسین. نـوکتەبازی: زانـایی و قسـەڕەوانـی. مـەکـتەب: مەدرەسە، قوتابخانە.

واتە: بێخود و بێهیچ لەبەر چاوی تۆ کە یەکجار زانا و ئەهلی قسەیە، لە مەدرەسەی جوانیدا من دەڵێی تەتەڵە یا تەختەڕەشی مەدرەسەم و لە حەرف پاك کراومەوە و هیچ مەعلووماتم تێدا نەماوە.

(٦) سەیل: سێڵاو، لافاو. سروشك: ئەسرین، فرمێسك. حـەیران و مـەبهووت: هـەردوو بـە

☜

**عیزار و زولفی تۆ -بێ‌شك- شەو و ڕۆژ پێكەوەن ئەمما**
**شەو و ڕۆژ پێكەوە؟ لەو وەجهە من حەیران و داماوم**[٧]
**تەلیسمی بابلە، سیحری حەڵاڵە -قەد ڕەها نابم-**
**«وەفایی»! یا بە داوی زولف و ڕەمزی چاوە گیراوم؟**[٨]

## [ ٤٢ ][١]

**کە هەستا زولفی ڕووی داپۆشی من لەو داغە سووتاوم**
**ئیلاهی! ئەی ڕەقیب، ڕۆژی قیامەت بێیە پێناوم!**[٢]

---

☞

مانای سەرلێ‌شێواون.

واتە: لە نێوان سێڵاوی فرمێسك و ئاگری بە سۆزی دڵمدا سەرگەردانم و شتێكی زۆر عەجایبە كە بە ئاوی فرمێسكم نەخنكاوم و بە ئاوری دڵم نەسووتاوم.

لەف و نەشری مورەتتەبی تێدایە.

(٧) عیزار: ڕوخسار. لەو وەجهە: لەو ڕووەوە، لەبەر ئەوە، بۆیە.

واتە: ڕوخسارت دەڵەی ڕۆژە و زولفت دەڵێی شەوە كە پێكەوەشن. ئەرێ دەكرێ شەو و ڕۆژ پێكەوەبن؟ ئاخر ئەوە شتێكی مەحاڵە من بۆیە سەرگەردان و دەرماندەم.

(٨) تەلیسم: نەقشەی گەنج و قەڵاو شتی‌وا. بابل: شارێكە قەدیمی كە هارووت و مارووتی تێدا زیندانی بوون. سیحری حەڵاڵ: شیعر و عەشق.

واتە: ئەرێ وەفایی ئەو شتەی منی تێكەوتووم زیندانی بابلە یان عاشقییە یان بە زولف و ڕەمزی چاوی یارە ئەسیری بووم؟ تكایە تۆ بۆم ڕوون كەوە. (جوملەكە پرسیارییە).

**[ ٤٢ ]**

(١) كێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: سووتاوم، پێناوم، زووخاوم، و...

(٢) داغ: حەیف. بێیە پێناوم: گوناحم بە گەردنی تۆبێ.

واتە: كاتێ یار هەستایە سەر پێ، زولفی ڕوخساری داپۆشی و منیش لە حەیفان سووتاوم، یاخوا ڕەقیبی من لە ڕۆژی قیامەت دا دەینم بە گەردنی بێ.

قــەراری دا بــە ڕۆحــم تــیری نــازی چــوو لە قــەلبمڕا
مەپرسن چەند ئەمن لەو حەسرەتەی دڵ پڕ لە زووخـاوم(٣)
دەمێکـە هـەر لە تـۆی ئـاوری دەروون و ئـاوی چـاوم دام
لە دووری تـۆ عـەجەب مـاوم؛ نـەسووتاوم؛ نـەخنکاوم(٤)
تـــەبیبێکـــم نـــییە دەردی دەروونـــم بـــێ مـــوداواکـــا
هـــەتا مـاوم بـە ئـومـمێدی شـیفا هـەر چـاوەڕێی مـاوم(٥)
دڵم بــۆ تــۆ دەســـووتێ، دیـــدەکـــەم بــۆ تــۆ دەبـارێنــێ
دەمێك وابێ، ئەمان! ئەی جێت لەنێو دڵ، پێت لەسەر چاوم(٦)
ئـەتۆ ڕۆحت دەوێ ئـەمنیش ئـەدەب هـەر تـالیبی وەسـڵم
مەکە مـەنعم، بـە دووری چـاوەکـانت! پـیر و خـەرفاوم(٧)
بە ڕۆح جۆیـایی وەسـڵە ڕەمـزی چـاوی، بـاوەڕیـم نـایێ
لە مەردوم هێند خـیلافی وەعـدە مـن دیـتوومە تـرساوم(٨)

---

(٣) واتە: کە نازی یار وەك تیرێ لە دڵم ڕاچوو ئەو کاتە ڕۆحم ئارامی گرت. ئیدی ئـەحواڵم مەپرسن کە چەندە لە داخان دڵم پڕ زووخاوە.

(٤) واتە: لە مێژە لە نێو ئاوری دەروون و لە نێو ئاوی چاوی خۆم دام، کە ئەویش هی دووری تۆیە، عەجایەب ئەوەیە نە لە ئاوری دەروونمدا سووتاوم و لە ئاوی چاومدا خنکاوم.

لەف و نەشری مورەتتەبی تێدایە. نیوە بەیتی دووەم لە بەیتی ژمارە (٦)ی غەزەلی پێشـوودا هاتبوو.

(٥) واتە: دوکتۆر نییە دەردی دەروونم دەرمان بکات و هەتا زیندووبم بە هیوای چا بوونەوە هەر چاوەڕێ دەمێنم.

(٦) واتە: ئەی کەسێك کە جێت لە نێوان دڵمدایە و پێت لەسەر چاومە، دەمـێکـە دڵم بـۆت دەسووتێ و چاوم بۆت دەگری.

(٧) واتە: تۆ داوای ڕۆح دەکەی و منیش بە ئەدەبەوە دەیـدەم و ویـستیاری پـێك گـەیشتنم، مەنعم مەکەن کە لە دووری چاوت پیرم و عەقڵم لە دەست داوە.

(٨) واتە: ئەوەندە بە گیان ئاواتم وەسڵی تۆیە، باوەڕ بە ڕەمـزی چـاوت نـاکـەم کـە بـیبیلەی ☞

لەلايـــێ بــارشی چــاوم، لەلايــێ ســۆزشــی جــەرگم
نــە پـێی دەمـرم، نــە پـێی دەگـرم، كـەبابی نـيوە بـرژاوم[٩]
لە سۆزی گريە جـەرگم ڕەش بـووە، چـارم چـييە چبكـەم؟
وەكوو ماسی بـە نـێو مـاوم نـە سـووتاوم نـە خـنكاوم[١٠]
بە بێ تۆ قەت نەژيم، شاديم نـەمێنـێ، ديـدە بـێنـوور بـم!
دەمێك ئارامی ڕۆحم بە، حەياتم، عـومرەكـەم، چـاوم![١١]
لە دەست ئەو شۆخە وا زولفان بە ناز دێنێ و دەبـا، هـاوارا!
«وەفايی» ڕۆژی لێ كردوومە شەو، عـومری بـە بـا داوم[١٢]

☞

چاوت، يان خەڵكی هێندەيان درۆ لەگەڵ كردووم دەترسێم دوبارە وەعدە خيلاف بكەن.
لە مەردومدا ئيهام هەيە، چونكە هەم بە مانای خەڵك و هەم بە مانای گلارە و بيبيلەی چاوە.
(٩) واتە: لە لايێ گريانی چاوم وەك بارانە و لە لايێ جەرگم دەسووتێ؛ نە ئـەوەيە بـمرم و نەئەوەيە بتوانم بە پێوە ڕاوەستم، هەر دەڵێی كەبابێكم كە نيوەم برژاوە.
(١٠) واتە: لەبەر كوڵی گريانم جەرگم ڕەشەوە بووە، عيلاجم چييە وەكوو ماسی زگم ڕەش بووەتەوە، نە دەخنكێم و نە دەسووتێم.
ئەم غەزەلە زۆر بە قەوەت نيیە ديارە هی سەردەمی لاوی وەفاييیە.
(١١) واتە: ياخوا بێتۆ قەت نەمێنم، تۆ ساتێ ئارامی گيانم بە ئەی كەسێ كە عومر و چاوی منی.
(١٢) واتە: وەفايی ئەو يارە وا بە ناز زولفی دەهێنێ و دەيبا عومری بە با داوم، هاوار لە دەستی، ڕۆژی لێ كردوومە شەو.

[ ٤٣ ][(١)]

گــوڵەکــەم دەڵێن ئــەوا دێ، هــەموو وەخــتێ چــاوە چــاوم
ئەی خودا تــۆ بــڵەی وەهــابێ، بــێتــەوە ڕوونــاکــی چــاوم؟![(٢)]

ســەبەبی زولفــی شــێواوە حــوسنی ڕوو مــەدەدی پــێداوە
مــن کــەوا ڕۆژم بــۆتــە شــەو کــە بــە ڕۆژی ڕەش دامــاوم[(٣)]

تــا بــزانــن تــۆ گــوڵزاری، ڕوســتەیی ســەری جــۆبــاری
بە خەندە هاتی بەخێر بــێی، قــەدەمت ســەر هــەردوو چــاوم[(٤)]

خوێنــی مــن بــە گــەردەنی زولفت بــە ئــیشارەی چــاوەکــانت
مــن ئــەگــەر شکــاوە پشتم، مــن ئــەگــەر جگــەر بــڕاوم[(٥)]

---

[ ٤٣ ]

(١) تێبینی: ئەم هەڵبەستە بۆ گۆرانی دانراوە و ئاهەنگی تایبەتی خۆی هەیە. لە تەقتیعی عەرووزیشدا زۆر جار دەبێ بە هەوای گۆرانییەکە هیجاکان بگۆڕدرێ.

کێشی شیعر (بە هەوای ئاهەنگە تایبەتییەکەی): «فعلاتُ فاعلاتن فعلاتُ فاعلاتن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەشکوول. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: چاوم، داماوم، و...

(٢) واتە: وەك دەڵێن گوڵەکەم قەرارە بێ بۆیە منیش هەموو کاتێ چاوەڕوانم، خودایا وابێ و ڕووناکی چاوی من بێتەوە.

(٣) واتە: بۆچی زولفی یار شێواوە، جوانی ڕوخساری یارمەتی دەدا و من لە هۆی شێواوی زولفی ڕۆژم لێ بۆتە شەو و بەم ڕۆژە ڕەشە داماو و سەرگەردانم.

(٤) ڕوستە: ڕواو، شین بوو.

واتە: لەبەر ئەوەی بزانن تۆ گوڵزاری شین بووی قەراخی جۆباری بە پێکەنین هاتی و یاخوا بە خێر بێی پێڵاوت بەسەر هەردوو چاوم.

تەشبیهی موزمەری دەمی یار بە گوڵ و چاوی خۆی بە جۆبارە.

(٥) واتە: هۆی جەرگ بڕان و پشت شکاوی من ئیشارەی چاوەکانی یارە، خوێنی من بە گەردنی زولفی یار و تاوانی ئەوە.

به سـەری خـەدەنگی نـازت، جگـەری بـڕیـم چـاوی بـازت
بــە ئــومێدی نــازێکــی ویــم، ئــەگــینا ئــەمن نــەماوم[٦]
دڵی خۆم ئـاوری تـێ بـەردا تـا لە تـای زولفـان ڕووی دامـێ
شەو هەتا نەگـەڕام بـە چـراوە، شـەوچرا نـەهاتە بـەرچـاوم[٧]
ئــەتۆی نــووری شـەوبێداران، ئـەمن بـۆ وەك شـەم دایسـیێم
ئەتۆ گـوڵی شـای گـوڵزاران، ئـەمن بـۆ غـەرقی خـوێنـاوم؟[٨]
کە دەڵێی شەیدای گێسوومی، چدەکەی لەسـەری سـەودایـیم؟
کە دەڵێی پەروانـەی ڕوومـی، چدەکـەی لە دڵی سـووتاوم؟[٩]
شەو و ڕۆژ کە دەڵێن دوو بانن، هەر یـەکـن بـۆ دوون یـەكبانن
من لە دوو لاوەی برۆی تۆ، حـەیرانـی دوو زولفـی خـاوم[١٠]

---

(٦) خەدەنگ: تیر.
واتە: چاوی وەك بازی یار بە نووکی تیرێکی نازی جەرگی بڕیم و من هیوادارم یار ناز بکات دەنا خۆ من نەماوم.
(٧) شەو چرا: ئیستیعارە لە یارە یان لە ڕوخساری یار.
واتە: من دڵم ئاگر تێبەردا تا یار زولفی لادا و ڕووی پیشاندام. من هەتا بە چرای سووتانی خۆمەوە شەو نەگەڕام یار وەك شەوچرا نەهاتە ماڵی من.
(٨) واتە: کاتێ تۆ نووری شەو نەخەوانی، من بۆچی وەك شەم بسووتێم. تۆ گوڵی و شای گوڵزارانی من بۆچی غەرقی خوێنم؟
تەشبیهی موزمەری تێدایە.
(٩) واتە: ئەگەر پێت وایە شەیدای گێسووتم سەرم بۆچی سەوداییە، وە ئەگەریش پێتوایە پەپوولەی ڕووتم، دڵم بۆچی سووتاوە؟!.
(١٠) دوو بان: دوان.
واتە: دەڵەی شەو و ڕۆژ دوانن، نا هەر یەکن، زولف و ڕووی تۆ کە شەو و ڕۆژن هەر لەسەری تۆدان ئەوە منم لە دوولای برۆی تۆ دا حەیرانی دوو زولفی خاو بووم.

ئەی شەماڵ، ئەی شیفای نەساغان، وەرە تۆبێ و خاڵی ڕووی یار
بـە گـوڵ و وەنـەوشەی بـاغان، بگـەیێنـە دوعـا و سـڵاوم[١١]
گــلەیی لە چــاوی کــاڵتــە کــە مــوعینی زولف و خــاڵتـە
دڵی پــڕ لە دەرد و داخــم، ســەری پــڕ تــەلیسم و داوم[١٢]
نــە بــە وەســڵی تـۆ سـروورم، نـە بـە دووری تـۆ سـەبوورم
گێژ و سەرگەردان و حەیران، هەروەکوو ماسی سـەر ئـاوم[١٣]
بــە نــیگای تـۆ و عـەرەقی ڕووت دڵ و دیـنم چـوو نـازانـم
نە خوماری شەرابی ساقیم، نـە مـەستی عـەتری گـوڵاوم؟[١٤]
حــەقە کــە وەکــوو «وەفــایی» شـێت و شـەیداو سـەودایـی
مــەلەکــان خـۆیـان نـیشان‌دام، پـەرییان دەسـتیان لێداوم[١٥]

---

(١١) نەساغ: نەخۆش. شەماڵ: بایەکە کە گەرما دێنێ لە ئاخری زستاندا دێت.
واتە: ئەی بای شەماڵ کە شیفای نـەخۆشـانی، دوعـای مـن بـە گـوڵ و وەنـەوشە بگـەیەنە.
ئیستیعارە لە زولفی یارە.
(١٢) موعین: یاریدەدەر، هاریکار.
واتە: سەری پڕ دەردم لە چاوت گلەیی دەکا، کە بۆ دڵبەری کۆمەکی زولف و خاڵتە.
(١٣) واتە: وەك ماسی لەسەر ئاو نە بەوەسڵت شادم و نە لە دووریت ئۆقرەم هەیە.
تەشبیهی تێدایە، دەڵێن ماسی دایمە تینووە.
(١٤) واتە: نازانم مەستی شەرابی چاوی تۆم یان مەستی ئارەق و گوڵاوی ڕووتم.
تەشبیه و ئیستیعارە و لەف و نەشری تێدایە.
(١٥) واتە: حەق بە وەفایی بدەن ئەگەر شێت و شەیدایییە، چونکا پەری و فریشتە دەستیان لێ وەشاندووە.

[ ٤٤ ][١]

یار هاتەوە دەست و دڵی خۆم گرت و بەسەر چـووم
جان قابیلی جانان نەبوو نـەمزانـی بـەسەر چـووم[٢]
فەرمووی: چکەسی؟ کەوتمە بـەرپێی کـە «وەفـایی»م
قوربان چبوو عومرێکە لەلەت بووم و لەلات بووم؟![٣]
دەسـتی لەسـەری دام و دڵی دامـەوە فـەرمووی:
خۆش هاتی! بەخێر هاتی! وەلێ ڕۆحە بەهای ڕووم![٤]
وا خسـمتی چـاوی کـە بـە داو زولفـی وەلادا
شەو ڕۆیی، بەیان بەربوو، ئەمن هەر لە خەوا بووم![٥]

---

[ ٤٤ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعولن مفاعیلن مفاعیلن فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی مەکفووفی مەحزووفی ئەخرەب. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: چووم، چووم، بووم، و...

(٢) بەسەر چووم: بە سەر ڕۆیشتم. بەسەر چووم: هەڵەم کرد، ئیشتیبام کرد، جیناسی تەواو هەیە لە نێوان هەردوو بەسەر چوومدا.

واتە: یار هاتەوە منیش لە باتی بە لاق بڕۆم لە خۆشییا بە سەر چووم و ڕۆحم پێشکەش کرد، نەمزانی گیان قابیلی وی نییە هەڵەم کرد ڕۆحم پێشکەش کرد.

(٣) لەلە: پیاوێ کە منالێ بەخێو بکات. لەلات: لە کنت، لەنێوانیاندا جیناسی ناتەواو هەیە.

واتە: یار فەرمووی تۆ کێی گوتم قوربان چۆن نامناسی؟ من وەفاییم کە عومرێك تۆم بە خێو کرد بە منداڵی و لە گاڵتەدا بووم.

(٤) دڵی دامەوە: دڵخۆشی دامەوە.

واتە: دەستێکی بە سەرمدا هێنا و گوتی بەخێر بێی بەڵام بەهای دیدار و ڕوخساری من ڕۆحە نەك گیان. وادیارە وەفایی فەرق دادەنێ لە نێوان ڕۆح و گیاندا.

(٥) واتە: کاتێ زولفی وەك داوی لەسەر ڕوومەتی دا لادا وا کاری تێ کردم، شەو ڕۆیشت (زولفی لاچوو)، بەیان هات (روخساری دەرکەوت) هێشتا من هەروەها گێژی تەمەشای چاوی بووم.

**یـارایـی مـوژە و تـابی بـرۆی تـۆی نـییە جـەرگم**
**بـەو تـیر و کـەمانە نـە فـەرامـەرز و نـە بـرزووم**[(٦)]
**ماچی دەمی، خەندەی دەمەکەی سیڕڕی بـەیان کـرد**
**ئەو جەوهەرە وا فەردە نە مەوجوودە نە مـەعدووم**[(٧)]
**زەڕڕێکـی لە سـیڕڕی دەمـی تـۆم بـرد و نـەزانـی**
**حەیرانی کـەماڵاتـی «فـەلاتوون» و «ئـەرەستوو»م**[(٨)]
**مومکین نییە بـەو نـێرگسـە مـن بـێمـەوە سـەرحـاڵ**
**من دەربەدەری ڕووتـم و سـەوداسـەری گـیسووم**[(٩)]

---

(٦) یـارایـی: خـۆڕاگـری. تـاب: تـەوانـایی. فـەرامـەرز و بـرزوو: دوو کـوڕی ڕۆسـتەمن لە کەسایەتییەکانی شاهنامە.
واتە: جەرگم توانایی خۆ ڕاگرتنی لەبەرکەوانی ئەبرۆی تۆی نییە خۆ من کوڕی ڕۆستەم نیم. تەلمیح و تەشخیسی تێدایە.
(٧) جەوهەری فەرد: مادەی غەیرە تێکـەڵ، جـوزئی لایـەتەجەززا ئـەو مـادەیەی لە وردیـیا قەبووڵی بەشەبەش ناکات، ئیستیعارە لە دەمی یارە. مەوجوود: هەبوون. عەدەم: نەبوون.
واتە: بە ماچکردنی دەمی و بە خەندەکەیدا زانیم دەمی هەیە، چونکە ئەوەندە چکۆلە بوو، ئەو دەمەی مادەیەکە کە هەشە و نیشە.
جگە لە مانای فەلسەفی و مەنتیقی، فەرد، جەوهەر، مەوجوود و عەدەم کە موراعاتی نەزیرە، وەفایی یەکجار باسی بچووکی زاری یاری بەم شێوە دەکا.
(٨) زەڕڕە: تۆزقاڵ. فلاتوون و ئەرەستوو: دوو فەیلەسووفی کۆنی یۆنانین.
واتە: نەختێ لە زاری دەمی تۆم بەهرە بوو و نەمزانی کە بە قەدکەماڵاتی ئەرەستوو و ئیفلاتوون مەتڵەبیان پێ‌بوو.
(٩) نەرگس: ئیستیعارە لە چاوی یارە.
واتە: پێم وا نییە بە چاو لێکردنی چاوانت چاك بمەوە چوون من شێتی زولفی تۆ و ئـاوارەی ڕوخساری تۆم.

لەو زولفــە ـبـە غـەمزەی نـیگەهت ـ نـیمە ڕەهـایی
مـن بـەستەیی نـێو داوی پـەریزادەیـی جـادووم(١٠)
فــەرمووی: لە کـوفر لادە مـوسوڵمـان بـە «وەفـایی»
دێوانە مـەبە، دەست مـەدە زولفـم، ئـەوەتا ڕووم(١١)

## [ ٤٥ ](١)

دریێغــا بــای خــەزان دایــە بــەهاری شــۆخ و ڕەعــناکـەم
لە ئــــیزهاری عــەمەل کــەوت ئــافتابی عــالەمئاراکــەم(٢)

---

(١٠) واتە: بە غەمزەی چاوت لەبەندی زولفت ڕزگار نابم چون بەسراوی سیحری پەریزادەی ڕوخسارتم.
(١١) واتە: فەرمووی لادە وەفایی لەکوفری زولفم و ئیمان بە موسوڵمانەتی ڕوومەتم بهێنە. لەف و نەشر هەیە لە نێوان کوفر و زولف و موسڵمان و ڕوودا.

[ ٤٥ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیف: کەم. واژەی قافیە: ڕەعنا، عالەمئارا، سەحرا، و...
**تێبینی:** وەفایی وەك بۆ خۆی بە فارسی نووسیویەتی کاتێ کە حـەزرەتی شـێخ عـوبەیدیللا دوور دەخرێتەوە بۆ تایفی عەرەبستان ئەم شیعرەی لە قاڵبی لاواندنەوەدا بۆ وتووە کە ئەمەش وەرگێڕاوی دەقە فارسییەکەی وەفاییە:
شەوێك پاش ڕووت بوونەوە لە پەیوەندییەکانی لەش، بەڕاستی دیـترا کـە مـنی بـەستەزمان (مەبەست لە وەفایی خۆیـەتی) لە شـاری تـایف (طـائف)م لە وڵاتـی حـیجاز کـە جـەنابیان (مەبەستی شێخ عوبەیدیللای نەهرییە) کۆچیان کردبوو بۆ ئەوێ و لە پاڵ جەنابی ئەواندام و ئەوان وەفاتیان کردووە و منی بەستەزمان خەریکی گریان و فوغانم، سـەری مـوبارەکـیان لە تابووتەکە بەرزکردەوە فەرموویان ئاگاداری گریان و زاری ئێوەم، کە بێدار بوومەوە ئەم قەسیدەی تەعزیەم تەواوکرد. بەڵام پڕکێشم نەئەکرد دەریببڕم. شەوی دووهەمی ڕووداوەکە فەرموویان: بۆم بخوێنەوە. منیش بۆم خوێندەوە، فەرمووی نیشانی خەڵکی بدە. منیش دەرمخست.
(٢) درێغا: داخەکەم، حەیف.ئەفسووس. ئیزهاری عەمەل: ئـیش کـردن. ئـافتابی عـالەمئارا:

وەرەق ڕێزان، خـــەزان کـــەوتە ڕەزان، وەزعـــی چـــەمەن گـۆڕا
بەسەرچوو فەسڵی گوڵگەشت و تەماشای باغ و سەحراکـەم(٣)
خەزان هات و چەمەن چۆڵ بوو لە نەغمەی بـولبول و قـومری
دریغـــا! حـــەسرەتا! بـــۆ گـــوڵعـــیزارە ســـەرو بـــاڵاکـەم(٤)
لە گـــریان ئـــاسمان دامـــانی ســـوور بـــوو شـــینی گـــیڕاوە
مـــەگـــەر گـــیراوە یـــا مـــایل بـــە شـــامە ڕۆژە ڕووناکـەم؟(٥)
ئـــــەدیمی بـــــەختی مـــن ڕەش بـــوو تـــەرازوو وا تـــرازاوە
دەبـــێ مـــەیلی بـــە تـــائیف کـردبێ تـەئسیری شـەعراکـەم؟(٦)

---

☞

هەتاوی دونیا جوانکەر، مەبەست شێخ عوبەیدیللایە.
واتە: داخەکەم بای پاییز کەوتە باخەکەم و شکۆفەکەمی نەهێشت و هەتاوە جوانکەرەکـەی دونیاکەم ئیدی لە کارکەوتووە.
(٣) وەرەق: گەڵا. ڕێزان: ڕژان، وەران. ڕەزان: باخە ترێکان.
واتە: گەڵاکان وەرین و پاییز کەوتە نێو باخە ترێکان وەزغ و چۆنیەتی چـەمەن گـۆڕا و کـاتی گەڕانی سەحرا و گوڵگەشتی باخان دەوری نەما.
لە نێوان ڕێزان و ڕەزاندا جیناسی موزاریع هەیە.
(٤) واتە: پاییز هات چەمەنزار لە دەنگی بولبول چۆڵ بوو ئـەی حـەیف و مـەخابن بـۆ ئـەو یارەی باڵای وەکوو داری سەوڵ وابوو.
(٥) واتە: ئاسمان بە هۆی گریان کەنارەکانی (شەفەقی) سوور بوو، ئاسمان شیوەن دەگێڕێ چونکە ڕۆژی ڕووناکم (شێخ عوبەیدیللا) گیراوە، یان بەرەوکاتی ئێوارە چەمیوەتەوە و ئەڕوا، یان مایل بە سەرزەمینی شامە.
ئیهام لە ڕۆژ و شام و گیراندا هەیە.
(٦) ئەدیم: سفرە، «ادیم السماء» واتە ژێر ئاسمان، لێرەدا مەبەست ئاسمانی بەختە. تەرازوو: میزان، ئەستێرەی کۆ. تایف: شارێکی عەرەبستانە کە شێخ دوورخراوەتەوە بۆ ئەوێ. شەعرا: ئەستێرەی شەعرای یەمانی کە ئەستێرەیەکی زۆر گەورەیە لە ئاسماندا.
واتە: سفرە یان ئاسمانی شانسی من ڕەش هەڵگەڕا و لە میزان دەرچوو، پێم وایە ئەستێرەی شەعرای من مایل بووە بە شاری تایف.

له من دوور بۆتـەوه خـورشیدی ئـەوجی مـەعریفەت، شـایەد
به تیغی غەم سەری خۆم هەڵگـرم هـەمرەنگـی جـەوزاکـەم(٧)
له مـــن وەحشـــی بـــووه ئــاهوو خـــەرامـــی لاله ڕوخســارم
مەکەن مەنعم که هەروەك شێت و هاران ڕوو له سـەحراکـەم(٨)
بـــه مـــەحروومی لەگـــەڵ بـــەختی ســـیادا مـاوه فـرمێسکـم
له تـــازیەی هـیجرەتی خـورشیدی عـالەم واسـورەییاکـەم(٩)
«وەفـــایی» پـــێت بـڵێم: دونـیا و دیـنت بـۆچـی بـەرهەم بـوو
دەڵێن: ڕۆیـی لەسـەر دونـیایێ قـیبلەی دیـن و دونـیاکـەم(١٠)
نـــیشات و عـــوشرەتی دونـــیا بـــه نـــەشئه و قـــووەتی چـاوه
ئـــەمن چبکـــەم له دونـــیادا کـــه ڕۆیـی نـووری بیناکـەم(١١)

---

(٧) خورشیدی مەعریفەت: هەتاوی ناسین، تەشبیهێکی زۆر بەلیغە چونکە چـرا هـەیە بـۆ ڕێ دۆزینەوە بەڵام وەفایی ئەڵێ شێخ عوبەیدیللا هـەتاوی ڕێگـە دۆزیـنەوەیە. جـەوزا: دوو پەیکەر و بورجێکی مانگی قەدیمین.

واتە: هەتاوی مەعریفەت و ناسین لە من دوورکەوتەوە و لە داخان منیش بە تێغی غەم سەری خۆم هەڵدەگرم و خۆم وەك بورجی جەوزا دەکەم بە دوولەت.

(٨) واتە: یاری ئاهوو خەرامی ڕوخسار وەك لالەم دوورکەوتەوە لە من، مەنعم مەکەن ئەگەر وەك شێتان ڕوو لە سەحراکەم.

(٩) خورشیدی عالەم: هەتاوی جیهان، مەبەست شێخ عوبەیدیللایە. واسورەییا: واتە: هاوار بۆ ئەستێرەی سورەییاکەم.

واتە: لەگەڵ بەختی ڕەشم کە بێبەشی فرمێسکم قەتیس ماوە مەجبوورم لە حەیبەت هەتاوی ئاوابووم هەر هاوارکەم کە ئەستێرەی سورەییام ڕۆ.

(١٠) واتە: ئەی وەفایی پێت بڵێم بۆ دین و دونیات تێکەڵ بووە؟ چونکە لە دونیادا قیبلەی دین و دونیاکەت (کە شێخ عوبەیدیللاه بێ) ڕۆیشتووە.

(١١) نیشات: خۆشی و شادی. عوشرەت: خۆشگوزەرانی.

واتە: هەموو خۆشی و شادی و خۆشگوزەرانی لە دنیادا بە قووەتی چاوە، من کە چاوم نەماوە نووری -واتە شێخ- ڕۆیشتووە ئەدی دڵ بەچی خۆشکەم.

که تـۆ ڕۆیـی، لەبـەر چـاوم کـورەی خـاکـی بـه ئـاوا چـوو!
لە پاش تۆ، ئەی گوڵی نەوڕەستە، خاکی کوێ بەسەرداکەم؟(١٢)
خۆشـا بـەو ڕۆژە عـەکسـی پـڕتـەوی حـوسنت لە سـینەم دا
ئەوێستاش مەست و مەخمووری تەجەللای تووری سیناکەم(١٣)
خـۆشــا بــەو وەقـتە تـۆ مـیرئاتی دولبـەر بـووی بـە دڵدارم
ئەوێستاش مەحوی دیـداری جـەمالی ڕۆژە «حـیربا»کـەم(١٤)
بــە یــادی پــێکــەنینی تــۆ کــە دەگــریم و دەبــارێنـم
دەبــێتــە مـەنبەعی شـیر و شـەکـەر شـۆراوی دەریـاکـەم(١٥)

---

(١٢) کورەی خاك: کورەی زەوی، عەرز. بە ئاوا چوو: لە ئاودا نوقم بوو.
واتە: لەو کاتەوە کە تۆ ڕۆیشتووی ئیدی کورەی عەرزی لە ئاودا غەرق بووە و خاکیش هەموو بۆتە قوڕ. ئیدی بۆ من خاك نەماوە کە دوای تۆ بە سەریداکەم.
(١٣) تەجەللای تووری سینا: تەلمیحە بە داستانی مووسا کە لە کێوی توور تەجەللای نووری ئیلاهی دی و بەو نوورە ئاگر لە کێوی تووری سینا بەر بوو.
واتە: خۆشا بە حاڵم و خۆزگەم بەو ڕۆژە کە تەجەللای ڕوخساری دیداری تۆ لە سینەی منی دا و بەو دیدارە مەست بووم و ئێستاکەش کە هەر سەرخۆشی ئەو دیدارەم.
مەولانا دەفەرمێ:

عشــق جـان طـور آمـد عـاشقا            طور مست و خرّ موسی صاعقاً

(١٤) میرئات: ئاوێنە. میرئاتی دولبەر: ئاوێنەی یار، مەبەست شێخ و مـورشیدە کـە نـووری خودا مونعەکیـس دەکاتەوە بۆ ناو دڵی موریدان. حیربا: زەردە قۆڕە، قۆڕیانە زەردە، نـەوعێ مارمێلکەیە کە هەمیشە ڕوو لە خۆر دەکات بە فارسی پێی دەڵێن: ئافتاب پەرست.
واتە: خۆزگە بەو ڕۆژەی کە تۆ وەك ئـاوێنـە نـیشاندەری جـانان بـووی و لە تـۆوە بـە جـانان دەگەیشتین، ئێستاش قەلبم وەك هەتاوپەرست شێتی ڕوخـساری وەك خۆری تۆیە.
(١٥) واتە: کاتێ من بە یادی تۆ دەگریم فرمێسکی سوێرم لە دەریای چاو دێتەدەر وەك بارانە لەبەر یادی پێکەنینی شیرینی تۆ دەبێتە کانگای شیر و شەکەر. یان: بە یادی پێکەنین شیرینی تۆ هەرکات دەگریم و بارانی فرمێسك دەبارێنم، دەریای سوێر دەبێتە کانگای شیر و شەکر، واتە شیرین دەبێ.

کــە دەگــریم بــۆ جــەمالی تـۆ دیـارە ئـەشك و ئـاهی مـن
لە خـــورشیدی دەداتـــن دەم، سـتارەی شـامی یـەلداکـەم[١٦]
بــە یــادی تــۆیــە وا دەم دەم خـورۆشـی ئـاه و نـاڵەی دڵ
لە تـــاو گـولّشـەن دەنـاڵێ عـەندەلیبە شـێت و شـەیداکـەم[١٧]
فــەلەك ـخــانە خــەرابــێ ـ بـەزمی مـەستانی وەهـا تـێکـدا
نەما داری لە سـەر بـەردی، بـە دەردیسـەر چ ئـاواکـەم؟[١٨]
لە ژێر بـاڵی هـوما جـێی بـازی شـاهی قـەسری شـاهان بـووم
درێغـا! ئـێسـتە وێرانـەی، سـیسار و جـوغدە جـێگـاکـەم[١٩]
لە نـــاڵێن کـــەوتووم بـۆ دەسـتی یـاری مـوتریب و مـەجلیس
وەکوو تاری گوسەستە تێك‌چووە بەند بـەندی ئـەعزاکـەم[٢٠]

---

(١٦) لە خورشیدی دەداتن: لە هەتاو ڕووناکترە. شەوی یەلدا: درێژترین شەوی ساڵ.
واتە: ئەوکاتەی کە بۆ جوانی تۆ دەگریم فرمێسك و هەناسەم لەبەر چاوە، ئەو فرمێسکەم وەك ئەستێرەی شەوی یەلدا وایە لەبەر ترووسکە ڕووناکایی شان لە شانی هەتاو دەدا.
دەشکــرێ بــڵێیــن: «شـام» مـەبەست غـەریبی و «یـەلدا» دوور و درێژی و «سـتارە» شـێخ عوبەیدیللایە.
(١٧) عەندەلیب: بولبول، ئیستیعارەیە لە تەبعی شیعری خۆی.
واتە: لە حەسرەتی کۆچی تۆیە بولبولی تەبعی شێت و شەیدای من لە تاو دووری گوڵشەن و گوڵستانی ڕووتدا هەر ناڵە و خرۆشی گریانی دێ و هەمووی بە یادی تۆیە.
(١٨) واتە: ئەی فەلەك مـاڵت وێران بـێ وەهـا مـەجلیسی مـەستانت تـێك‌دا داری بـە سـەر بەردیەوە و هیچی بەسەر هیچیەوە نەما، ئەمن باسی چ دەردیسەرییەك بکەم؟
(١٩) هوما: باڵندەی خۆشبەختی. بازی شاهی: باڵندەی ڕاوچی پادشاهان. سیسار: سیسارك، لاشخۆر، داڵ. جوغد: کوندەبوو.
واتە: تا زەمانێ شێخ لێرە بوو من لە ژێر سێبەری ئەودا وەك بازی کاخی شاهان قەدر و قیمەتم هەبوو، ئەی ئەسەف ئێستا بێ ئەو وەك داڵ و کوندەبوو جێگەم هەر وێرانە و چۆڵی و کەلاوانە. تەزاد لە نێوان هوما و باز و سیسار و جوغددا هەیە.
(٢٠) تاری گوسەستە: تاری شکاو، تارێ کە ژێیەکانی بڕابێ.

**دڵم بـێهـۆش و خـوێنـبارە لە دووری نـێرگسـی سـاقی**
**سوراحی کـەوتووە دەگـری، دەڵێ: کـوا بـادە پـەیماکـەم؟(٢١)**
**شکـا پشت و دڵی مـن بـۆ وەفـاتی پـیری مـەیخانە**
**بە چەرخێکی فـەلەك وایکـرد نـە جـامم مـا نـە میناکـەم(٢٢)**
**لەسەر حەوزی دەروونی، چی بەسەرهات هاتوچۆت قـوربان؟**
**کوا دەم کەوسەر و خولد و خـەرام و نـەخلی تـووباکـەم؟(٢٣)**
**سـەدای یـاحەیی دەروێشـان، نـەوای یـاهوویی دڵڕێشـان**
**لە دەوری خانەقادا بـوو بـە جـیسم و ئـیسمی عـەنقاکـەم(٢٤)**

---

☞

واتە: هەر وەك تاری شکاو ناڵەو دەنگم نایە، بۆ مەجلیسی یاران و وەکوو جاران ئاهەنگ لێدەم و شیعر بڵێم. ئازای ئەندامم لەبەر یەك پچڕاوە.

(٢١) ساقی: بادەگێڕ. نێرگسی ساقی: ئیستیعارە لە چاوی یارە. سوراحی: پیاڵەی شەراب. بادە پەیما: شەرابخۆر.

واتە: دڵم لە دووری یار بێهۆشە و پیاڵەی شەراب بێ کەس کەوتووە و دەگری و دەڵێ کوا یاری بادەنۆشم.

ڕازە (ئارایە)ی تەشخیس و موراعاتی نەزیر هەیە لە نێوان ساقی و سوراحی و بادەپەیمادا.

(٢٢) چەرخ: خولی دەوران. جام: پیاڵەی شەراب. مینا: شووشەی شەراب.

واتە: پشتم بۆ وەفاتی پیری مەیخانە شکا و فەلەك چەرخێکی خوارد و کارێکی کرد نە شووشەی شەرابم ما و نە جامی شەرابم.

(٢٣) حەوزی دەروونی: حەوزی تایبەت بەماڵی شێخ بووە خۆی و ماڵی و منداڵی لەوێ دەستنوێژیان گرتووە. یان: مەبەست لە دڵی خۆیەتی کە لە کاتی ڕابیتە و یادی عیرفانیدا شێخ سەرکێشی دەروونی کردبێت.

واتە: کوا هاتوچۆکەت لە دەم حەوزی تایبەتی بنەماڵەت کە وەك بەهەشتە و داری تووبای بە ناز و لەنجەی لێ بوو ئەفسووس بۆ ئەو کاتە.

لە نێوان کەوسەر و خولد و تووبادا موراعاتی نەزیر هەیە.

(٢٤) عەنقا: سیمورغ، باڵندەیەکی خەیاڵییە کە تەنیا ناوی هەیە و لە ڕاستیدا باڵندەیەکی وەها

☜

**هەتاکەی قەلبی من دەرهەم بێ ئـەی ئـیکسیری خـاکـی مـن؟**
**لە خـاکی کویێ موقیمی پێم بـڵێ؟ قـوربانی ئـەو خـاکـەم!(٢٥)**
**لە سەر خاکـی دەرت، قـوربان، هـەتا مـن بـم هـەتا سـەر بـێ**
**ئەگەر تـاجی سکـەندەر بـێ سـەرم نـاوێ لەسـەر نـاکـەم(٢٦)**
**هـەتا ڕۆژی ئـەبەد، قـوربان، لە سـەر عـەهدی قـەدیمی تـۆم**
**بەهەشتم لێحەرام بێ گەر بـەبێ ڕووی تـۆی تـەمەنناکـەم(٢٧)**
**ئەمن شاییم بـە تـۆ بـوو؛ چـونکە شـاهی غـەمڕەوێنـم بـووی**
**کە مـن شـاییم لە دڵ ڕۆیـیوە، ئـیدی دڵ بـەکـێ شـاکـەم(٢٨)**

---

☞

بوونی نییە. حەی: زیندوو (مەبەست ئـەڵڵایـە) و یـاحەی، زیکـری دەروێشـانە. دڵڕێشـان: عاشقان.
واتە: مەجلیسی خەتم و تـەهلیلە و «یـااللّـە» و هـاواری دەروێش و عـاشق لە خـانەقادا وەك باڵندەی سیمورغی لێهاتووە، هەر ناوی ماوە و وجوودی خاریجی نەماوە.
(٢٥) ئیکسیری: ئەو ماددەیەی کە خاك ئەگۆڕێ بە زێڕ. خاك: وڵات و سەرزەمین.
واتە: هەتاکەی دڵ و دەروونی من شێواو و ئاڵۆز بێ ئەی کەسێ کەوەك ئیکسیری و منیش وەك خاکم و ئەتوانی بمگۆڕی، ئێستا لە کام خاکدا ساکنی پێم بڵێ با بە قوربانی ئەو خاکە بم.
لە نێوان خاکەکاندا جیناس هەیە.
(٢٦) واتە: قوربان هەتا خاکی دەرگای تۆ شك بەرم ئەگەر تاجی ئەسکەندەریش شك بەرم لەسەری ناکەم.
لە نێوان سەردا جیناس و تیکرار هەیە.
(٢٧) واتە: قوربان تا ڕۆژی مردن و ئەبەد هەر لە سەر ئەو عەهد و پەیمانەم کە لەگـەڵ تـۆم بەست ئەگەر بە بـێ ڕوخسـاری تـۆ بـچمە بـەهەشت، بـەهەشت لە مـن حـەرام بـێ، یـانی بەهەشتیشم لەبەر تۆ پێخۆشە.
(٢٨) شاییم بە تۆ بوو: دڵم بە تۆ خۆش بوو. شاکەم: شادکەم.
واتە: چونکە تۆ شای غەم لابەری من بووی، من دڵم بە تۆ خۆش بوو؛ کە تۆ هۆی شادی دڵم بووی ڕۆیشتی، ئیدی دڵم بە کێ شاد بێ؟.

جەنازەم دی سەری ڕاگـرد و فـەرمووی: گـوێم لە نـاڵەت بـێ
دریغـا! جـێ‌بـەجێ بـوو، هـاتەجێ تـەعبیری ڕوئـیاکـەم(٢٩)
خـودا بـۆ خـۆی دەزانـێ مـەنبەعی نـووری خـودایـی بـووی
دریغا! نـەخلی ئـەیمەن، مـەزهەری نـووری تـەجەللاکـەم(٣٠)
نـــەسیمی فـــەیزی تـــۆ دیـــن و دڵی دووبـــارە ئـــیحیا کـــرد
دریغـــا! وەك مـــەسیحا بـــاعیسی ئـــیحیایی مـــەوتاکـــەم(٣١)
دەلیـــلی تـــالیبان بـــووی، بـــۆ خـــودا، وەك ڕۆژ هـــوەیدایـە
دریغـــا! مـــورشیدی دەوران و خـــورشیدی هـــوەیداکـەم(٣٢)
لە سایەی تۆ گەلێ کەس بوونە عـاریف، ڕێی خـودایـان گـرت
دریغـــا! عـــاریفی ڕێگـــەی خـــوداو و ئـەهلی تـەقواکـەم(٣٣)

---

(٢٩) ڕوئیا: خەون.
واتە: دیتم لە خەودا جەنازەی تۆکە پێت گوتم بگـری بـا نـاڵەت ببیسم، ئـەی هـاوار ئـەوە خەوەکەم تەعبیرەکەی هاتە دی و ڕاست گەڕا.
(٣٠) نـەخلی ئـەیمەن: دارخـورمای کـێوی تـوور. مـەزهەر: شـوێنـی دەرکـەوتن. تـەجەللا: خۆپیشاندانی خودا، تەلمیحە بە دیداری مووسای کێوی توور.
واتە: خودا بۆ خۆی ئاگادارە ئەی شێخ تۆ پیشاندەری نووری خودا بووی ئەی حەیف بۆ تۆکە وەك دارخورمای موقەددەسی توور بووی و دیاردەی نووری خۆپیشاندانی ئیلاهی بووی.
(٣١) نەسیمی فەیز: هەناسەی بەرەکەت و بەخشش. ئیحیا: زیندووکردنەوە. مەوتا: مردوان.
واتە: تۆ هەناسە و بای بە بەرەکەت بووی و دڵ و دینت زیندووکردەوە، حەیف بـۆ تـۆکـە نەماوی، تۆ وەك مەسیح مردووت زیندوو ئەکردەوە.
(٣٢) دەلیل: ڕەهنوما. تالیبان: دەروێشان و عاریفانی تازە وەڕێ کەوتوو. هوەیدا: ئاشکرا.
واتە: وەك ڕۆژ دیارە تۆ ڕێنوما و مورشیدی عاریفانی تازە وەڕێ‌کەوتوو بۆ لای خودا بووی، حەیف بۆ تۆکە وەك ڕۆژ ڕووناك و ڕێ‌نیشاندەر بووی.
(٣٣) عاریف: خوداناس. دریغا: وشـەیەکـی فـارسییە بـە مـانای حـەیف و حـەسرەتە و بـۆ شینگێڕی بەکار دێ، خواجە ڕەشیدی وەتوات دەڵێ:
همی‌گفتم کە خاقانی دریغا گوی من باشد   دریغا آخرش گشـتم دریـغا گـوی خـاقانی

موریدانی دەری تـۆم دی بـە چـاوی خـۆم، لە ئـینس و جـان
دریغـا! بـۆ ئـیمامی ئـینس و جـان مـەولایی ئـەولاکـەم(٣٤)
بـەڵایـێك هـات و پـێی گـیرا، بـە بـایێك نـووری کـوژراوە
دریغـا! شـەمسی عـیرفان و چـرای تـاریکە ڕێگـاکـەم(٣٥)
لە حـەڵقـەی تـالیبان وا هـەر دەبـارێ نـوور لە تـەشریفت
دریغـا! بـۆ سـەرو سـەرحـەڵقـەیی ئـەولادی «تـاها»کـەم(٣٦)
ئـەمن نـادان و نـەمزانـی، ئـەرێ بـۆچ عـاریف و عـامی
وەکوو پەروانە سووتابوون لەبەر شـەمعی شـەب‌ئاراکـەم؟(٣٧)
لەبـەر چـاوی نـەزانـان سـاحیر و زەنـدیق و کـافر بـووی
دریغا! پیری «بەستام»، قوتبی «خەرقان»، غەوسی بەغداکەم(٣٨)

---

☞

وەفایی دەڵێ: لە ژێر سێبەری ڕێنومای تۆ زۆر کەس بوونە عارف و خوداناس، حەیف بۆ تۆ ئەی ڕێنومای عارفە خواناسەکانم.

(٣٤) مەولا: ئاغە، ڕەهبەر. ئەولا: «أولیٰ» چاکتر، یان وشەکە کوردییە مەبەست قیامەتە.

واتە: بە چاوی خۆم دیتم موریدانی تۆ هەم مرۆڤ بوون و هەم جندۆکە بوون. ئەی حەیف بۆ ڕابەری قیامەتم کە لە دەست دەرچوو.

(٣٥) واتە: بەڵایەك هات و شێخ بەو بەڵایە گیرۆدە بوو، حەیف بۆ ڕۆژی ڕووناك و چرای ڕێگای تاریکی خۆم.

(٣٦) حەڵقەی تالیبان: کۆڕی زیکری دەروێشان. تەشریف: گەورەیی. تاها: سەید تاهای شەمزینی بابی شێخ عوبەیدوڵلاه.

واتە: لە کۆڕی زیکری دەروێشان هێشتا پاش ڕۆیشتنت هەر نوور دەبارێ بۆیان، حەیف بۆ ڕێبەری ئێمە کە ئەولادی سەید تاهای شەمزینی بوو، یان مەبەست لە «تاها» پێغەمبەرە (بە تیری دوو نشانە دەپێکێ).

(٣٧) واتە: بڵێین من نەزان بووم و نەمدەزانی، ئەی چۆن سەواد دار و بێ‌سەواد (زانا و نەزان) بۆ تۆ سووتا بوون و وەك پەپوولە بە دەوری مۆمی شەوڕۆشنکەرەوەی باڵاتدا بوون!؟.

(٣٨) ساحیر: جادووگەر. زەندیق: بێ‌دین. پیری بەستام: بایەزیدی بەستامی خواناسی

☜

**بــە داوی دانــە بــۆ گــیرا، بــە دەریــای عــیلمی ئـەسماوە**
**لەبەرچی هاتەخوار ئادەم لەسـەر فـیردەوسی ئـەعلاکـەم؟[٣٩]**
**پەنای بۆچ بردە بـەر دار ئـەو کـە دەیـزانـی دەبـیٚ شـەق بـیٚ؟**
**نە ئاخیر ساحیبی ئـایات و مـوعجیز بـوو زەکـەریاکـەم؟[٤٠]**
**لە سیرڕی نووری چاوانی عەجەب بیٚنوور و حـیکمەت بـوو**
**بـلیٚ بـۆچ پـیری کـەنعانی دەگـریا، نـووری عـەیناکـەم؟[٤١]**
**ســولەیمان خــاتەمی ون بــوو لە قـودرەت مـاوە نـەیفەرموو**
**بــەڵا سـەخرەی بـە ئـاودادام بـەڵا ئـاسەف لە دەریـاکـەم[٤٢]**

---

☞

سەدەی سیٚ و چواری کۆچی. قوتبی خەرقان: ئەبولحەسەنی خەرقانی خواناسی سەدەی سیٚ و چواری کۆچی.

واتە: نادانان تۆیان پیٚ ساحیر و بیٚدین و کافر بوو، حەیف بۆ تۆ کە لە ڕیزی ئـەبولحەسەنی خەرقانی و بایەزیدی بەستامیدا بووی.

(٣٩) تــەعنەیان دەدا لە شـیٚخ کـە لەبـەر مـەقامی دونـیایی قـیامی کـردووە، شـیٚخیش کـە ئاسیونالیستیٚکی پاك بووە بۆیە دەفەرمیٚ:

ئەگەر پیٚیان وایە تاوانباری و هەڵەت کردووە، ئەی ئادەم خۆ عیلمی ئەسمای دەزانی ئەو بۆچی بە دوای دانەیێ لە شەجەرەی مەمنووعە گرفتار بوو؟ کەوابوو خەتای تۆ نییە دونیا هەر وایە.

(٤٠) واتە: زەکەریاش کە پیٚغەمبەر بوو دەیزانی بچیٚتە نیٚو داریٚك دەیبڕنەوە. ئەی بۆ چووە نیٚوی و دوایەش بڕییانەوە، دیارە چارەنووس بیٚئەملا و لایە و حەتمییە و تاوانی کەس نییە.

تەلمیحە بە داستانی پیٚغەمبەران کە ئەوانیش گرفتارییان بووە، گرفتاری شیٚخیش بە پیٚچەوانەی بیروڕای نەزانان بۆ دونیا نەبووە، نەجاتی قەومی خۆی هەر جیهادە.

(٤١) واتە: خۆ یەعقووب ئەیزانی ئەگەر زۆر بگری کویٚر دەبیٚ ئەی بـۆچ خـۆی نـەپاراست ئاخری کویٚر بوو، تۆش دەبا ئەو شۆڕشەت هەرکردبایە چونکە وەك پیٚغەمبەر و نەجات دەری بۆ قەومی خۆت.

(٤٢) واتە: سولەیمان نەقیمی ئەنگوستیلەکەی لیٚ ونبوو بە دەست دیٚوان و سەخری جین گیرۆدە بوو، بۆ کاری لە دەست نەهات؟.

تەلمیحە بە داستانی سولەیمان و گرفتاریی بە دەست «دیٚوان»ەوە.

کەلیم ئێستا نەبووبوو چەند هەزار مەعسووم لەسەر وی چوو؟
دەبێ جـوابـی چبـێ ڕۆژی جـەزا، گـوستاخە مـووساکـەم(٤٣)
لەبــەر قــەومی مــونافیق بــوو دەبــێ هـەڵبێ کـە دەیـزانـی
مەقامی خۆی وەکوو ڕۆژ ڕوونە «روح الله»یـی عـیساکـەم(٤٤)
سەحابەی بۆچ شکا؟ بۆچـی شـەهید بـوو گـەوهەری پـاکـی؟
موحەممەد: باعیسی بوون، شاهی تاج و تـەختی لەولاکـەم(٤٥)
شــەهیدی دەسـتی کـافر بـوون کـە ئـەکسـەر ئـەولیایی دیـن
جەوابی موددەعی چبدەم؟ سکووتی بـێحـەد ئـینشاکـەم(٤٦)
نــە «ئــاو» مــوختارە بــڕوێنــێ، نـە «ئـاور» تـا بسـووتێنـێ
نە «خاك» چی پێیە بینوێنێ، ئەگەر سەدجاری بەر «با»کـەم(٤٧)

---

(٤٣) کەلیم: حەزەتی مووسا. گوستاخ: نەترس، ئازا. دوژمنانی شێخ گـوتبوویان چـونکە لەو قیامەی شێخدا خەڵکی بێتاوان کوژراوە، تاوانبار شێخە. وەفایی دەفەرموێ:
ئەگەر وابێ مووسا هێمان لە دایك نەبوو بوو سەدان منداڵیان لە سەر وی کوشت و لە چۆم هاویشت، ئەگەر وابێ ڕۆژی قیامەت مووسا لای خودا چ جوابێکی هەیە؟.
(٤٤) واتە: ئەوەتە عیسا (روح اللّه)ش لە دەستی قەومی مونافیق هەڵات و خۆی شاردەوە لە کاتێکدا بۆ خۆی دەیزانی لای خودا چەندە گەورە بوو.
(٤٥) سەحابە: هاوەڵان و یارانی حەزرەت. گەوهەر: ئیستیعارە لە ددانی حەزرەتی موحەممەدە.
واتە: تەنانەت حەزرەتی موحەممەد کە بە شاهی لەولاك مەشهوورە و خودا دونیای لەبەر ئەو خەلق کردووە، یارانی لە شەڕدا شکستیان هێنا و ددانی ئەویش موبارەکی شکا.
تەلمیحە بە غەزای ئوحود و بە حەدیسی «لولاك لما خلقت الأفلاك».
(٤٦) واتە: دەبینی زۆربەی دۆستانی خودا بە دەستی کافر شەهید بـوون، تـا کـەنگێ دەنگ نەکەم و بێدەنگی بنووسمەوە.
(٤٧) واتە: بێئیزن و ئیرادەی خـودا ئـاو و ئـاور، خـاك و بـا (عـەناسوری ئـەربـەعە) هـیچ ئیختیارێکیان نییە، کەوابوو هەرچی هەیە بە ئیرادەی خودایە و قیام و شکستی شێخیش هەر ئیرادەی خودابووە.

**عــەدەم «بــاری» ســەبەبکارە، وجــودێکــی حــەقە دیــارە**

**بۆ خۆی فـەععال و مـوختارە، خـوداوەنـدی تـەوانـاکـەم(٤٨)**

**بــە مــینهاجی خــەلیلی حــەق، بــە مـیعراجـی «رسـول الله»**

**دەبـێ هـەر بـێتـەجێ ئـەمر و ئـیرادەی حـەق تـەعالاکـەم(٤٩)**

**ئەتۆ چووی بۆ جیواری حەق ئـەمن مـام حـەبس و زیـندانـی**

**غەمی بەندەت هەبێ ئەی سـەیید و سـەردار و مـەولاکـەم(٥٠)**

**بە سوورەت گەرچی لێم دووری، بە مەعنا بـەرقی مـەستووری**

**بەڵێ بەرچـاو و مـەنزووری دەڵێی تـۆی نـووری بـیناکـەم(٥١)**

---

(٤٨) عەدەم: نەبوون، ڕۆژی ئەزەل. سەبەبکار: باعیس، ئەو کەسەی باعیس بوو کە شێخ شکست بێنێ. فەععال و موختار: هۆ و توانای گشتی.

واتە: دەزانم لە ڕۆژی عەدەمدا هەموو شتێك براوەتە و ئەو کەسەی وای کرد کە شێخ بمرێ و نابود بێ، بۆ خۆی فەعال و خاوەن گشت کردەوەیەکە و هەرچی بیهەوێ کەس ناوتوانێ بەری بگرێ. یانی: ئەمە کارێکی قەزا و قەدەر بوو کە خودا لە ئەزەلدا نووسیبووی.

(٤٩) مینهاج: ڕێگە. خەلیل: دۆست، حەزرەتی ئیبراهیم. میعراج: بەرز بوونەوە و چوونە لای خودا لەلایەنی پێغەمبەر.

واتە: قەسەم بە میعراجی پێغەمبەر و ڕێگای ئیبراهیمی خەلیل، دەبێ ئیرادەی حەق تەعالا بێتە جێ.

ئیرادەی حەق تەعالا تەلمیحە بە ئایەتی «و نرید أن نمنّ على الذين استضعفوا في الأرض و نجعلهم أئمّة و نجعلهم الوارثين»: ڕۆژێ گەلی ژێر دەست خاوەنی عەرز دەبێ.

(٥٠) جیوار: کەنار، نزیك. سەیید و مەولا: ئاغا و سەروەر.

واتە: جەنابی شێخ تۆ چووی بۆ نزیك خودا و من تەنیا و زیندانی ماوم، ئەی ئاغە و سەروەری من! خەمی غولامی خۆت هەبێ دوعایەکیش بۆ من بکە.

(٥١) سوورەت: زاهیر. مەعنا: باتین. مەستوور: داپۆشراو.

واتە: بە زاهیر دیار نیت بە باتین وەك نووری داپۆشراو هـەر دیـاری. دایـمە لەبـەر چـاوی و مەبەستی دڵی منی و دەڵەی نووری بینایی من ئەتۆی.

له کویێ بتبینمەوە، شـاد بـم بـە ڕووی تـۆ، بـێیـە سـەرچـاوم؟
مـەگـەر چـاوم له دڵ بـێ سـینەکـەم ئـاییـنە سیماکـەم(٥٢)
دەمت بـێنـە دڵم مـەشکێنـە دەسـتم بگـرە ئـەو جـارەش
بە هۆشیاریم دەیێ ساقی، کـە نـەڕژێ جـامی سـەهباکـەم(٥٣)
غەریب و بێ‌کەس و ئـاوارە کـەوتووم، دوور لە ڕۆحـی خـۆم
بـە دەردی بـێ‌دەوا مـاوم، ڕەفـیقان کـوا مـەسیحاکـەم(٥٤)
خـوداوەنـدا! ڕەحـیما! قـادرا! ئـامورزگاری خـۆم
کەریم و، حەییی و غەففار و، قـەدیم و فـەردە یـەکـتاکـەم(٥٥)
بە حـەققی نـووری وەجـهی پـاك و بـێ‌مـانەند و بـێ‌مـیسلت
بە ئیسمی ئەعزەمی خۆت ئەی خودای سەتتار و دانـاکـەم(٥٦)

---

(٥٢) واته: بڵێ لە کوێت ببینمەوە پێت لەسەر چاوم دانێم، دڵ و چاوم بە خاکی پێت ڕوون کەمەوە و سینەم وەکوو ئاوێنە بە دیدارت ساف بێت.
یان: ناتوانم بتبینمەوە بتخەمە سەرچاوم، مەگەر چاوی دڵم بکرێتەوە، کە بۆ بینین بە چـاوی دڵیش، ئەبێ سینە (دڵ)م وەك ئاوێنە ساف و بێگەرد بکەم و تۆزی غەیری پێوە نەیەڵم.
(٥٣) سەهبا: مەجازەن بە مانای شەرابە دەنا بە مانای پیاڵەی شەرابە.
واتە: دڵم مەشکێنە دەمت بێنە مـاچت کـەم و ئـەمجارەش دەسـتم بگـرە، سـاقی وەهـام بـە هۆشیاری مەی بدەرێ کە جامی شەرابەکەم نەشکێ.
(٥٤) ڕۆح ئیستیعارەیە لە شێخ. مەسیحا: دوبارە مەبەست شێخە.
واتە: دوور لە شێخ بێ‌کەس و ئاوارەم ئەی ساقی کوا مەسیحاکەم، چونکە دەردێکی بێ‌دەوام گرتووە.
(٥٥) قادر: توانا. کـەریم: بـەخشـەر. حـەی: زیـندوو. غـەففار: بـەخشنده. قـەدیم: هـەربووە لەوەپێش. فەرد و یەکتا: تەنیا. لەم بەیتەوە ئیدی بەشی (شەرتییە و ئـیعتیزارییە)ی قـەسیدە دەست پێدەکا و دوعای دەکا بۆ مەمدووح.؟
(٥٦) ئیسمی ئەعزەم: ناوە گەورەکەی خودا. سەتتار: داپۆشەر.
واتە: خودا بۆ خاتری نووری بێ‌هاوتا و ناوی گەورە ی خۆت.... دوعاکە دوایی دێ، ئەم چەن بەیتە ماناکەیان بەسراوە بە یەکەوە.

بـــە ســەرمەستانی بـادەی ســاغیری عــەهدی ئــەلەستت کــەی
به قەترێکی نەجاتم دەی لە دەست خۆم ڕوو لە دەریاکـەم(٥٧)
وەفـــــایی بــــێ کــەس و دامــاوە پـــابەندی تـــەلیسمێکــە
مەدەد یـا ڕۆحـی غـەوسی ئـەعزەم و شـاهی بـوخاراکـەم(٥٨)
بە حەققی نووری موتڵەق، جەددی ئـەمجەد، شـاهی لەولاتـان
ئیمامی یـەسریب و، قـیبلەی مـەلایك، مـاهی بـەتحاکـەم(٥٩)
بــــە حــــەقی چــــار یــار و ئــال و ئــەولادی «نــبي‌الله»
بــە ئــەنسار و مــوهاجیر قــائیدانـــی قـیبلە گـومڕاکـەم(٦٠)
بــە ڕۆحـــی خــواجــەگـانی نـەقشبەند و قـیبلەگـاهی خـۆم
غــەریب و جـانسپاری کـەعبە قـوتبی دیـن و دونـیاکـەم(٦١)

---

(٥٧) ئەلەست: ڕۆژی ئەزەل.
واتە: خودایە بەو مەست و عاشقانەی ڕۆژی هەوەڵت قەترە و زەڕەیەك لە ڕەحمی خۆت بە من بکەی نەجاتم بێ و ڕوو بکەمە دەریا.
(٥٨) غەوسی ئەعزەم: غەوسی گەیلانی (شێخ عەبدولقادر). شاهی بوخارا: شاهی نەقشبەند گەورەی سیلسیلەی نەقشبەندی.
واتە: خودایە بۆ خاتری ئەم خواناسە گەورانەت وەفایی ئەسیری داو و تەلسمێکە...
(٥٩) نووری موتڵەق، جەددی ئەمجەد، شاهی لەولاك، ئیمامی یەسریب، قیبلەی مەلایك، شاهی بەتحا: هەموو ئەمانە ئیستیعارە لە پێغەمبەری ئیسلامن.
(٦٠) چار یار: ئەبووبەکر و عومەر و عـوسمان و عـەلین. ئـەولادانـی «نبي اللّـه»: سـادات، ئەولادی پێغەمبەر. ئەنسار: یاریدەدەران، یارانی مەدینەیی پێغەمبەر. موهاجیر: کـۆچکـەران، ئـەو مـوسوڵمـانانەی لە مـەککـەوە کـۆچـیان کـرد بـۆ مـەدینە. قـائید: ڕێبـەر. قـیبلە گـومڕا: ناموسوڵمانانی عەرەبستان دەورەی جاهیلییەت.
(٦١) واتە: بۆ خاتر خواجەگانی نەقشبەندی و شێخـانی نـەقشی کـە قـیبلەی خـۆمـن، واتـە موریدی ئەوانم، قیبلەی دین و ئیمانم غەریب و بێ‌کەس لە خاکی کەعبەیە. مەبەست شێخ عوبەیدیللایە.

**بــە قــووەی جــازیبەی دڵتــان «وەفــایی» دەست و دامــانە**
**چ نــابێ گـــەر لە ســایەی ئـێوە قـەتعی «مـاسوی الله» کـەم[٦٢]**

[ ۴۶ ][١]

**ئــەی (إمــام المــرسلین، شــمس الهــدی، بـحر الهـمم)**
**ئــەی (شــفیع المــذنبین، خــیر الوری، مــولی النـعم)[٢]**

(٦٢) «ماسوی اللّە»: مادیات، هەرچی غەیری خودا.
واتە: بۆ خاتری ئەو پیاوچاکانە وەفایی دەست و دامانی ئێوەیە ئاگاتان لێ بێ تا لە سایەی ئێوەدا لە مادیات ڕابڕم و ببمە ئینسانێکی ڕۆحانی و عاریف.
لە کۆتایی ئەم قەسیدەیەوە بە فارسی چەند دێڕێ ئـامۆژگـاریی نـووسیوە ئـەمە وەرگـێڕاوی دەقەکەیەتی بە کوردی:
برایانی ئایینی بە قوربانتان بم، وەسییەت بێ لەبەر خوا ئەم ئەندازەیە فەرامۆش مەکـەن. بـە گوێرەی ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنونَ إِخْوَةٌ﴾ (موسوڵمان و خاوەن باوەڕان هەموو بران) ڕاگەیاندنیم بـە پێویست زانی، ئامان هەزار ئامان! لەگەڵ پیری گەورەدا، کە قوتبی مەدارە بەدگومانی مەکەن و دڵ خراپ مەکەن، ئەو کارە ژارێکی کوشندەیە و بە دڵ و بە گیان خۆشەویست و دڵسۆزی ئەو کەسە بن کە مایەی سەرفەرازییە، لە کردار و (کەراماتی) ئەو زاتە ئەم کورتەیە شتێکی گران نییە و یەك لە هەزارە: دوای دانانی ئەم مەرسییە، لە کاتی چاشتەنگاودا، نامەیەکم بۆ جێگری ئەو زاتە نووسی، وام زانی لە کاتی نووسینی نامەکەداگیانی لەلام حازرە. هەر ئەو ڕۆژە نامەکەم بە حاجیاندا نارد. شەو لە حاڵەتی واقیعەدا ئەو زاتە (قُدِّسَ سِرُّە) فەرمووی: وەفایی لە فڵان قسە کە لە نامەکەتا نووسیوتە بە هەڵەدا چوویت و باش نییە، ئەتوانی بگە بە حاجیان و بـیگۆڕە. نەگەیشتم بە حاجیان...! پاش گەڕانەوەیان و هاتنەوەی وەڵامی نامەکەم ئەو زاتە چۆنی فەرموو بوو هەر وابوو. ئەم بەستە زمانە هەر ڕاگەیاندنی لەسەرە و ڕێگەی تری نییە.

[ ۴۶ ]

(١) کـێشــی شـیعر: «فـاعلاتن فـاعلاتن فـاعلاتن فـاعلن»، بـەحری ڕەمـەلی مـوسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: «هِمَم»، «نِعَم»، ئیرەم و...،
(٢) واتە: ئەی ڕێبەری نێردراوەکان! ڕۆژی هیدایەت و ڕێنوێنـی، دەریـای هـیممەت، ئـەی تکاکاری گوناحکاران، باشترینی بنیادەمەکان و وەلی‌نیعمەتی بەشەرەکان.

ئـــەی نـــەسیمێکـــی گـــوڵی زار و شـــوعاعێکـــی ڕوخت
شـــەوقی ڕۆژ و بـــەدری تـابان عـەتری گـوڵزاری ئـیرەم(٣)

ئـــــەی لە شـــــەوقی جـــــەننەتی ڕووت ئـــەنبیا و ئـــەولیا
ڕۆح لەســـەر لێون وەکـــوو پـــەروانـە بـۆ دیـداری شـەم(٤)

ئــەی دەم و خـــەندەت دەلیــلی دەعـویی بـوون و نـەبوون
ئـــەی بـــرۆ و بـــاڵات بـــەیانی مـــەعنیی نـوون و قـەلەم(٥)

ئـــاسمان پـیر بـوو لە داغـی خـەتی ڕووی تـۆ ڕۆژ و شـەو
سەد چـرای هـەڵکـرد و نـەیبوو وا سـەوادی یـەك ڕەقـەم(٦)

تــۆ بــیی‌و تـــەشریفی (لولا) و ســـیڕڕی (مـــازاغ البـصر)
تـــۆ و مـــەقامی (لي مـــع الله)، تـۆ بـیی‌و نـووری قـیدەم(٧)

---

(٣) واتە: ئەی کەسێ کە نەسیم و هەناسەیەکی دەمی وەك گوڵت هۆی ڕووناکایی ڕۆژە و شەوقی مانگە و هۆی بۆنخۆشی باخچەی بەهەشتە.

(٤) واتە: ئەی کەسێ کە لە شەوقی ڕوخساری تۆ پێغەمبەران و پیاوچاکان وەك پەپوولە بۆ دیداری شەم ڕۆحیان هاتووەتە سەر لێویان.

(٥) دەم: زار. خەندە: پێکەنین. نوون و قەلەم: ئایەتێکە لە قورئانی پیرۆزدا، ﴿نٓ. و القلم و ما یسطرون﴾.

واتە: دەمت هێندە بچووکە دەڵەی عەدەمە کە پێدەکەنی دەلیلی هەبوون و وجوودە، بـرۆت پیشاندەری مەعنای حەرفی «نوون»ە باڵات ڕێکی پێشاندەری قەڵەمە.

تەشبیهی برۆیە بە نوون (ن) و باڵایە بە قەڵەم.

(٦) واتە: ئاسمان هێندە ئاواتەخوازی ئەوە بوو وەکوو خەتی ڕوخساری تۆ وابێ شەو و ڕۆژ بە چراوە و هەزاران ئەستێرەوە پیر بوو هەر نەگەیە جوانی تۆ.

(٧) تەشریفی «لولا»: گەورەیی قەدری تۆ بە حەدیسی «لولاك لما خلقت الأفلاك». سیڕڕی «مازاغ البصر» واتە: ڕاز و حیکمەتی ئەوەی کـە چـاوترۆکـانێ لە شـەوی مـیعراجـدا چـاوی پێغەمبەر هەڵەی نەکرد. «لي مع اللّٰه»: واتە: هـەندێ جـار بـە خـوداوە زۆر نـزیکم کـە هـیچ مەلائکەیەکی موقەڕەب و هیچ پێغەمبەرێکی مورسەل ناگەنە من. قیدەم: ئەزەلی و ئەبەدی.

واتە: ئەی پێغەمبەر بۆ خاتری ئەم تایبەتمەندییانەت...

**بــێ نــەوام هــیچم نــییە هــاتووم و مــەحرووومم مــەکــە**
**قەت لە دەرگای خۆی گـەدا نـاکـاتەدەر سـاحیب کـەرەم**[٨]

**هــــیچ تـــەبیبێ ڕێی نــــییە دەردی دەروونــم کــا دەوا**
**ئــەمڕۆ گــەر چـارەم نـەکـەی (وا حســرتا یـوم النـدم)**[٩]

**هاتمە بـەر ئـەبرۆت و نـاسووتێم لە سـایەی خـەتتی ڕووت**
**ئایەتە: «چی داخڵی کـەعبەی بـوو نـایێ تـرس و غـەم»**[١٠]

**دەست و دامــانی خـــەمی گــێســوویی تــۆم لەو عــاریزە**
**نــائومێد نــابم کـە مـن دەسـتم لە حـەلقەی کـەعبە دەم**[١١]

**مــن چــلۆن مــەحرووم بــبم ئــەی (رحــمة للــعالمین)**
**دێ ســەدای (لا تَــقْنَطُوا مِـن رَحـمةِ اللّـه) دەم بـە دەم**[١٢]

---

(٨) واتە: من فەقیرم هاتوومە بەر دەرگـای تـۆ، خـاوەنی کـەرەم و بـەخشش قـەت فـەقیر لە دەرگای خۆی دەرناکا و ناهومێدی ناکا.

(٩) وا حسرتا یوم الندم: ئەی هاوار و داغ بۆ ڕۆژی پەشیمانی کە قیامەتە.

واتە: دەردی دەروونی من بە هیچ تەبیب و دوکتۆرێ چارەی ناکرێ، ئەمڕۆ تۆ فریام نەکەوی ڕۆژی قیامەت هاوار بە ماڵم.

(١٠) برۆ: بە هێماوە بە کەعبە شوبهاوە.

واتە: هاتمە ژێر سێبەری برۆت و لە خەتی ڕوخساری وجوودت ناترسێم چونکا ئایەتە: ﴿وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِناً﴾: هەر کەس لە کەعبە وەژوور کەوێ هێمنایەتی هەیە.

ڕازە (ئارایە)ی تەلمیح و حوسنی تەعلیلی تیدایە.

(١١) عارز: ڕوخسار، سەروچاو.

واتە: لە ڕوخسارتدا دەست و دامانی زولفت بووم زولفت وەکوو ئەڵقەی کەعبە وایە هەر کەس دەستی پێوە بگرێ ناهومێد نابێ.

(١٢) «رحمة للعالمین»: ڕەحمەتی عالەمیان، سیفەتی پێغەمبەر. «لا تقنطوا من رحمة اللّه»: لە ڕەحمەتی خودا ناهومێد مەبن.

واتە: ئەی کەسێ کە بۆ جیهانیان مایەی ڕەحمەتی، من مەحرووم نابم، چونکا دایمە دەنگی فەرموودەی خودا: (لە ڕەحمەتی خودا ناهومێد مەبن) لە گوێمدا دەنگ ئەداتەوە.

هـــات نــەسیمی خـــاکـــی دەرگـــات ئـــاوری دڵ دامـــرا
(ذُقتُ مِـــن مـــاءِ الحَـــياة شـــابَني بَـــعدَ الهِـــرَم)[١٣]

چاوەکـانت سـەرخـوشن، قـوربان، کـوتم: مـایل بـە چـین؟
عەکسی زولفی خستە سەر حەرفی مودەووەر یـانی: دەم[١٤]

کەوتمە خـاکـی دەرکـی هـاتن بـمکوژن خـۆش بـەو دەمـە
(قـــال رب البـــيت: هـــان! لا تَـــقتُلوا صَـــيْدَ الحَـــرَم)[١٥]

تەوقی ئەبرۆی، شەوقی ڕووی، خستمیە ناو زولف و کـوتی:
کـــــەعبە و ڕۆژی مـــــوناجاتە و مـــــەقامی مـــولتەزەم[١٦]

(یـــا ڕســـول الله) دەزانـــی تـــۆ کـــە شـــەیتانە عـــەدووت
هەم لە تۆ مەعلوومە ئەمنیش ئوممەتی تۆم هەرچـی هـەم[١٧]

کـــــەی ڕەوایـــە و غـــیرەتە بـــۆ تـــۆ کـــە فـــەخرولئەنبیای
دوژمنی خۆت شاد بفەرمووی، ئوممەتی خۆت دڵ بەغەم[١٨]

---

(١٣) واتە: هەر کە نەسیمی خاکی دەرکەت هات دڵم ئاورەکەی دامرکا، چـەشتم لە ئـاوی حەیات و لاویەتیم دوای پیری گەڕایەوە.

(١٤) واتە: لە چاوتم پرسی کە مایل بە چییە؟ زولفی سەر ڕوخساری گوتی: ئەو حەرفە خڕە یانی «دەم» کە وەك «م» بچووك و خڕە.

لە واژەی چیندا ئیهام هەیە.

(١٥) واتە: خۆزگە بەو کاتەی کەوتمە خاکی دەرکی و هاتن بمکوژن بە زاری جـوان خـۆش خۆش، ساحێب ماڵەکە گوتی: نەچیری حەرەم حەق نییە بیکوژن.

(١٦) واتە: تاقی ئەبرۆی و شەوقی ڕووی منی خستە گێژاوی زولفی و گوتی: وەك کـەعبە و ڕۆژی ڕاز و نیازە و وەکوو مەقامی مولتەزەمە، کە حاجی خۆیانی پیا هەڵئەواسن و موناجات ئەکەن.

(١٧) واتە: ئەی فرستادەی خودا خۆ تۆ دەزانی کە دوژمـنت شـەیتانە و دەشـزانـی کـە مـن هەرچی هەم ئوممەتی تۆم.

(١٨) واتە: کوا ڕەوایە بۆ تۆ کە جێی شانازی پێغەمبەرانی، شەیتان کە دوژمنی تۆیە شاد بێ و ئێمە بخەڵەتێنێ و ئوممەتت دڵغەمناك بێ، واتە لە دەس شەیتان بمانپارێزە.

داغــــی تــــۆم هــــەر پــێوەیـــە ســەد جــار دەرمکــەی دێمــەوە
من غولامی تۆم «وەفایی»م ڕوو لە دەرگای کــێ دەکــەم؟[(١٩)]

## [ ٤٧ ][(١)]

ئەی پەڕتەوی حوسنت هەموو ڕەنگی گوڵە باغان
نەشئەی نەزەرت زەوقی دڵ و شەوقی دەماغان[(٢)]
ئــەسما و ســیفاتن بــە تــەجەللی لە وجــوودت
یا شەو بوو ئەتۆ هاتی لەمەت کردە چــراغــان[(٣)]
تۆ هاتییە گــوڵشــەن بــە ســەر و زولفــی بــڵاوت
زۆر پێ‌نەچوو ڕۆیی لە چەمەن لالە لە داغان[(٤)]

---

(١٩) داغ: نیشانە، دیاریکراو.
واتە: من نیشانەکراو و داغکراوی تۆم ئەگەر سەد جارم دەرکەی هەر دێمەوە. ئەمن وەفاییم و غولامی تۆشم ڕوو لە دەرگای کەسی دیکە ناکەم.

**[ ٤٧ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن»، بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: باغان، دەماغان، چراغان، و...

(٢) پەڕتەو: تیشك، نوور. حوسن: جوانی.
واتە: ئەی کەسێ کە تیشکی جوانیت وەك ڕەنگی گوڵی باغان وایە لە تەماشاکردنتدا نەشەیی و شادییەکی تێدایە بۆ دڵ و مایەی خۆشییە و بۆ مێشك و دەماخ ڕووناکییە.

(٣) ئەسما: نێوەکان. سیفات: کردار و سیفەتەکان. تەجەللی: نیشاندان.
واتە: ئەرێ ئەوە نێو و سیفەتەکانی تۆیە لە وجوودتدا خۆی پیشانداوە یان لەکاتی شەودا ئەتۆ هاتی و ڕووناکیت خستە وڵات و دونیا بوو بە چراغان.

(٤) واتە: کاتێ کە تۆ بە سەر و زولفی پەرێشان هاتی گوڵشەن زۆری نەخایاند، گوڵی لالە لە حەیبەت و حەسرەتی زولفی تۆ چەمەنی بە جێ هێشت.
تەشبیهی تەفزیلی زولفە بە لالەوە.

**زولفت بـــە هـــەناسەم گـــەییيە سينەيی بـازت**

**زستانە گـولّستان بـووە پـا بـەستەيی زاغـان(٥)**

**ئـەو کـولّمـە کـە ئـارايشـی سـەد دايـرە زولفـە**

**گولّ شەوقی بە شەو داوە چراغـانە لە بـاغان(٦)**

**لەو ڕاســـتەيی بـــازاڕە چ نـــادەن بـــە دڵی مـن**

**هەر مەرحەمەتی تۆيـە خـرِيـداری ئـەياغان(٧)**

**سەد نەشتەری غەمزەت لە دڵم دا، کەرەمت کرد**

**قـــانوونی تـــەبيبانە بـــپرسن لە نـــەساغان(٨)**

**سووتاوە دەروونم، وەرن ئەی موتريب و ساقی**

**تـۆ لێدە لە تـەنبوور و ئـەتۆ پـڕکـە ئـەياغان(٩)**

---

(٥) واتە: هەناسەی من وەك بايەك زولفتی خستە سەر سنگی ئاوەڵات، سپيەتی سينەت وەك بەفری زستان، زولفانی وەك قەلەڕەشە ئەسير کرد.

(٦) واتە: کولّمت حەڵقەی زولفانتی ئارايش داوە. کولّمت وەك گولّ ڕۆژی ڕوخسارتی ڕووناك کردووە و لە باغی جوانی ڕوخساری تۆ چرا هەڵکراوە.

(٧) ئەياغ: بێ ئەرزش، کەم‌قيمەت.

واتە: عەشقی تۆ وەك ڕاستە بازاڕێکە جێی خرِيد و فرۆشە کە هيچ کەس هيچ نادا بە دڵی من، بەڵام تۆ لوتفت دەرحەق بە من زۆرە کە کڕياری دڵی منی بێ‌بايەخ و بێ قيمەتی.

لە نێوان ڕاستە، بازاڕ، خريدار و ئەياغدا موراعاتی نەزير هەيە.

(٨) نەساغ: نەخۆش. نەشتەر: چەقۆی نووك‌تيژی حەجامەت.

واتە: ئەو کاتەی بە برژانگی سەد نەشتەری لە دڵم دا، ئەوە مەرحەمەت و بەخشينی تۆ بوو، بەڵی ياسای دوکتۆران وايە دەبێ لە نەخۆش بپرسن.

ئەمە تەنزی تێدايە يانی: نەشتەر لێدانی تۆ بۆ چاری نەخۆشينە و خەسار نابێ.

(٩) موتريب: سازلێدەر. ساقی: تێکەری شەراب. ئەياغ: پيالەی شەراب.

واتە: دەروونم سووتاوە ئەی موتريب و ساقی وەرن بۆ عيلاجی دەردی دەروونم تۆ ساز لێدە و تۆش پيالەی شەراب پڕکە.

**چارەی نــیيه دێوانــەيی ڕووی تـۆيـە «وەفـايی»**
**سەد ساڵ ئەگەر بیبەنە سەر پیر و وەجاغان(١٠)**

**[ ٤٨ ](١)**

**ئــــەو چـــــاوانــــەی وا خــــوماری نــــازن**
**بـــــە ئـــــیما ئـــیمانم لێ دەخــــوازن(٢)**
**هـــــاتەدەر وەك ڕۆژ شـــــای شــــەكــــەر لێوان**
**غــــەمزەكــە و ڕەمــزەی تـوركی پـێش تـازن(٣)**
**دەســـــتی هــــێنـــــادەر پــێی لە ســەما دا**
**چـــاو مـــەستی چـاوبەستن یـا سـيحربازن؟(٤)**

---

(١٠) پیر و وەجاغ: پیاوچاك، مەرقەد و شەخس.
واتە: وەفایی عیلاجی نییە و شێتی ڕوخساری تۆ بووە، هەزار جار بیبەنە سەر پیر و پیاوچاك و شەخسان بێ سوودە.

**[ ٤٨ ]**

(١) كێشی شیعر: «فعلن فعولن فعلن فعولن» بەحری موتەقاریبی موسەممەنی ئەسلەم.
ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: نازن، دەخوازن، بازن، و...
**تێبینی:** ئەم شیعرە مەقامی تایبەتی خۆی هەیە.
(٢) خومار: مەست. ئیما: ئیشارە.
واتە: ئەو چاوانەی یار كە خومار و مەستی نازن بە ئیشارە داوای ئیمانم لێ دەكەن.
(٣) واتە: یار كە وەك شای لێو شیرینانە هاتە دەرێ، دەتگوت ڕۆژە هەڵهاتووە. غەمزەكەی دەڵێی ڕەمز و تاكتیكی شەڕی توركانە كە لە شەڕدا سەف دەشكێنن.
(٤) چاو بەست: دز و ساحیر. سەما: ڕەقس و هەڵپەڕكێ.
واتە: دەستێكی هێنا دەرێ و لاقی وە سەما خست، یار دەڵەی ساحیر و جادووگەر و سیحربازە. دەشكرێ سەما بە مانای ئاسمان بێ.

**زوهـــرەی یـــەغما کـــرد مـــوشتەری کـــێشــا**
**خـــرینگەی خـــڕخـــاڵ، جـــرینگەی بــازن[٥]**
**نـــــەوبەهار نـــــۆبـــەی شکــۆفــە و گـــوڵن**
**یــا غـونچەی دوگــمەی سینەکــەی وازن؟[٦]**
**بــە نـەسیم دەپشکــووت بــاغچۆڵەی سێوان**
**یــــا بــــە ئــاهی مـــن دوگـــمە دەتـــرازن[٧]**
**نـــــازانـــــم بـــۆچ وا ڕۆح و دڵ کـــەوتوون**
**غـــەرقی خـــوێنـاون جـێی داغ و گــازن؟![٨]**
**یــا کـوشتەی غـەمزەی ئـەو [دوو] چـاوانـەن**
**یــا ڕەنـــجەی پــەنجەی شـەهێن و بـازن؟[٩]**
**ســـیرڕی زاری تـــۆ مـــن بـــە کـــەس نـــاڵێم**
**ڕەنگی زەرد ئەشکی ئاڵ، هەردوو غەممازن[١٠]**

---

(٥) زوهرە و موشتەری: دوو ئەستێرەی ئاسمانن.
واتە: خرینگەی خرخاڵ و بازنی یار، دوو ئەستێرەی ئاسمانی کێشا بۆ خۆی و تالانی کردن.
(٦) واتە: ئەرێ زەمان کاتی بەهارە و گوڵ شکۆفەی داوە، یان یـار دوگـمەی سـوخمەکـەی کردۆتەوە و لە سینەیدا بەهار دێتە بەرچاو؟
«تەجاهولولعاریف» و تەشبیهی تێدایە.
(٧) واتە: باغی سێوانە بە نەسیم پشکووت، یان ئاهی منە و دوگمەی سینەی ترازاند؟
هەر عەینی بەیتی پێشوو «تەجاهولولعاریف» و تەشبیهی تێدایە.
(٨) داغ: سووتاندن. گاز: قەپ یان کەرەسەی بزمار و شتیوا دەرهێنان، مقاش.
واتە: نازانم ڕۆح و دڵم بۆ وایان لێهاتووە، دەڵەی داغکراون یان وەبەرگازیان داون.
(٩) هەروەك بەیتی سەرەوەیە. واتە: ڕۆح و دڵ، یان بە غەمزەی دوو چاوی یار کوژراون، یان شاهێن و باز بە چنگ ئەسیری کردوون.
(١٠) غەمماز: فیتنە، سوخەن چین، قسە دروستکەر.
واتە: من ڕازی دەمی تۆ قەت ئاشکرا ناکەم، بەڵام ڕەنگی زەرد و فرمێسکی ئاڵم ڕازم ئاشکرا دەکەن.

ئــــەوانــــەی عـــاشقن بــە چــاو و زارت
تــا ئــەبەد ســـەرخـۆش مـەحرەمی ڕازن[١١]
مــوتريبان، مــوقريبان دەم بــەدەم گــۆيــان
بــولبولان، قــومرييان نــەغمە پــەردازن[١٢]
دڵ دەنـــــــاڵێنـــــــێ ڕۆح لە شـــيوەندا
قودسيان ئينسييان چەند خـۆش ئـاوازن؟[١٣]
دەنگی من، سەوتی تـۆ، بـۆ بـەزمی خـوسرەو
چەنگ و نەی، عوود و دەف، تار و شەهنازن[١٤]
ئــەمن و تـۆيـن بـۆ ڕوخ و گـەنجی پـەنهانی
تــەليسم و تــەوق و گــوڵبــرين و بـازن[١٥]

---

☞

حافيز دەڵێ:

سرّ سوادی تو در سينه بماندی پنهان　　　چشم تر دامن اگر فاش نكردی رازم

(١١) واتە: ئەو كەسانەی عاشقی چاو و دەمی تۆن تـا قـيامەت مـەست و ڕازدارن، چـاوت مەيخانە و دەمت چكۆلەيە.

(١٢) موتريب: تارنەواز، تارژەن. موقريب: ڕەفيق، نزيك.

واتە: تار لێدەر و هاوەڵانی دەنگبێژ هەر دەڵێن و لێ دەدەن، بولبول و قومريش هەر خەريكی ئاوازە خوانين.

(١٣) قودسی: مەلايەكە. ئينسی: بەشەر.

واتە: دڵ لە ناڵەيە و ڕۆح دەگری و فريشتە و ئينسان وێكڕا بە ئاوازی خۆش دەيلێن.

(١٤) بەزمی خوسرەو: مەجليسی خوسرەو پەرويزی ساسانی كە مۆسيقای تێدابووە. چەنگ و نەی و عوود و دەف و تار: ئامێری مۆسيقان. شەهناز: ناوی گۆشەيەكی موسيقايە.

واتە: دەنگی من و تۆ لە مەجليسی خوسرەودا وەك ئامێری مۆسيقايە و شـياوی مـەجليسی شاهانە.

(١٥) ڕوخ: قەڵا، كۆشك. واتە: من و تۆ وەك نەقشەی گەنجی شاردراوەين، يان تەوق و بازنە و ☜

کـــــەمەندی ئـــاسکان، هـــاتوچۆی بـــازان
هـــەموو بـــۆ خـــاتر چـــاوەکـــەی بـــازن(١٦)
قـــــەفەسی بـــــەدەنم تـــــەنگ و تـــــاریکە
بازی دڵ و مورغی جان، هەر دوو پەروازن(١٧)
«وەفـــــایی» نـــــاژی بـــــە تـــــاری زولفت
ســــــەرتا پـــــای ئـــازای مـــاران گـــازن(١٨)

# [ ٤٩ ](١)

ئـــــەریٚ خـــــەندەی دەمت ئـــارامـــی دڵ، کـــانی حـــەیاتی مـــن
لەســـــەرچـــی زیـــز دەبـــی؟ ڕۆحت دەویٚ؟ هـــانیٚ حـــەیاتی مـــن!(٢)

---

☞

کەرەسەی ڕازاوەیی و جوانین. یان: من و تۆ بۆ کۆشك و گەنجی شاردراوە، وەك ئـەفسوون پەرژین و لەمپەرین.

(١٦) کەمەند: ئامێری گرتنی نەچیر. باز: باڵندەی ڕاو.

واتە: هەموو ڕاویٚ بۆ خاتری چاوی جوانی یارە.

(١٧) واتە: بەدەنم وەك قەفەسێکە تەنگ و تاریك و دڵ و گیانم وەك بازێکـی ڕاوچـی وایـە خەریکە هەڵفڕیٚ. یانی: خەریکە بمرم.

(١٨) مارانگاز: گەستەی مار، برینی جیٚ دەمی مار.

واتە: وەفایی بیٚ تاڵی زولفی تۆ ناژی، تەواوی ئەعزای گیانی وەك جیٚ برینی ماران گەستەیە.

**[ ٤٩ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیف: من. واژەی قافیە: حەیاتی، نەهاتی، زاتی، و...

(٢) کانی: سەرچاوە. حەیات: ژیان. کانی حەیات: سەرچاوەی ژیان لە زوڵمەت (ئـەفسانە و دیرۆکەیە). زیز: توورە، تۆراو. هانیٚ: بگرە، فەرموو وەریگرە. حەیات: ژیان، ڕۆح.

واتە: ئەی یاریٚ کە پێکەنینت وەك چەشمەی ئاوی ژین وایە بۆ من، بـۆ لە خـۆڕایـی لە مـن تۆراوی؟ ژیانی منت دەویٚ فەرموو ئەوە ڕۆحم و ژیانم پێشکەشت.

کـــوتت: دێم و نـــەهاتیە ســـەر گـــرفتاری ســـەری زولفت
لەگـــەڵ بـەختی سـیا چبکـەم؟ دیـارە خـۆ نـەهاتی مـن![٣]
مـن و سـەودای سـەری زولفت لەسـەر تـاقی بـرۆت؟! حـاشا
عـــەزیزم ئـــەهلی قـــیبلەم! کـــافری دوورە لە زاتـی مـن[٤]
بەخەندەی زار و عەکسی زولف و ڕووت خۆش بوو دڵم، سەد حەیف
دەقـیقە شـماری خـۆشـی چـوو شـەو و ڕۆژی سـەعاتی مـن[٥]
لەلایـــێ ڕۆح دەبـــا عـــیشوەت، لەلایـــێ دڵ دەدا خـــەندەت
عـەزیزم هـەر بـە دەست خـۆتـە حـەیاتی مـن مـەماتی مـن[٦]

---

(٣) نەهاتی (یەکەم): نەهاتن و سەر لێ‌نەدان. نەهاتی (دووەم): بەدبەختی (جیناسی تەواو لە نێوان ئەم دوو وشەدا هەیە).
واتە: قەولت دا بێی و بمبینی کەچی نەهاتی تا بزانی گرفتاری زولفت حاڵی چۆنە، بەڵێ مـن بەختم وەك زولفت ڕەشە بەدبەختی من ئاشکرایە.
(٤) من و سەوداسەری زولفت: واوەکە واوی ئیستیبعادە واتە غیرە مومکینە. حاشا: ناکرێ، شتی‌وا نابێ.
واتە: هەتا تاقی ئەبرۆت کە وەك کابەتوڵلایە شك بـەرم، مـوعامەلەی زولفت لە سـەرم نـادا؛ چونکا من موسوڵمانم کافری لە زاتمدا نییە کابەی برۆت بەردەم و زونناری زولفت لە مل کەم.
(٥) دەقیقە شماری: چاوەڕێیی.
واتە: دڵم بە پێکەنینی دەم و شکڵی زولف و ڕوخساری تۆ خۆش بوو بەڵام سەد ئەفسووس کە زەمانی ئینتیزاری بەسەر چوو و لە خۆڕا چاوەڕێ بووم.
لە نێوان شەو و ڕۆژ و سەعات و دەقیقە و شماریدا تەناسوب هەیە.
(٦) حەیات: ژین. مەمات: مەرگ. عیشوە: ناز و کرێشمە. خەندە: پێکەنین.
واتە: خەندە و پێکەنینت لەگەڵ ناز و کرێشمەت هەر یەك لەلایێ دڵ و ڕۆح دەبەن، عەزیزم مەرگ و ژینی من بە دەستی خۆتە.
لە نێوان حەیات و مەماتدا تەزاد هەیە.

**لە دووری تــــۆ بــە دفــتەر نــایێ شــەرحــی مــاجەرای چــاوم**
**ئــەگــەر دەریــای ئـەعزەم بـێ هـەموو سـورخـی دەواتـی مـن(٧)**
**دەســـــووتێم تـــەرزی پــەروانــە، دەنــاڵێنــم وەکــوو بــولبول**
**سەراسەر بـۆتـە مـیجمەر، بـۆتـە گـوڵشـەم، شـەش جـیهاتی مـن(٨)**
**چ خــۆش ڕووی دادەهــێنــا زولفــی ئــەفشان کــرد بـە دڵداریـم!**
**ئــیلاهی قــەت نـــەکـەی ڕۆژ بـێ شـەوی قـەدر و بـەراتـی مـن(٩)**
**ئــــەمن کــــەوتووم لەبــەر گــریان دەڵێ: دەســتی مــن و دامــان**
**ســەبا گــەر بــوویە خــوێن دامــانی یـار، بگـری لە بـاتی مـن(١٠)**

---

(٧) دەریای ئەعزەم: ئوقیانووسی کەبیر. دەوات: مەرەکەبدان. سورخی دەوات: جەوهەری سوور، ئیستیعارەیە لە خوێنی چاو.

واتە: چاوم لە دووریت هێندە گریاوە بۆتە دەریایێ لە خوێن بە نووسین و دەفتەر عیلاجی نایە، ئەگەر مەرەکبدان و جەوهەرەکەی بە قەد ئوقیانووسی کەبیر بێ هێشتا ڕووداوی دووری تۆی بۆ ئینشا ناکرێ.

(٨) تەرزی: وەکوو. میجمەر: ئاگردان. گوڵشەم: ئاگری شەمع، گڕی مۆم. شەش جیهات: هەموو لایێ سەرێ، خوارێ، ڕاست، چەپ، پێش و پاش.

واتە: وەکوو پەپوولە دەسووتێم و وەکوو بولبول دەناڵم و گوڵزارم بۆتە ئاگردان و هەموو لایەکم لێ بۆتە شۆڵە چرا.

(٩) ئەفشان: بڵاو. بەدڵداریم: لەبەر دڵدانەوەم. قەدر: شەوانی قەدر، شەوانی ٢١ی تا ٢٩ی مانگی ڕەمەزان. بەرات: شەوی بەرات شەوی پانزدەی مانگی شەعبان.

واتە: چەندە خۆش بوو یار زولفی شانە دەکرد لەبەر ئەوەی دڵداری من بداتەوە، خۆزگە ئەو شەوەی کە ئەو لوتفەی لەگەڵ من کرد کە وەك شەوی لەیلەتولقەدر و جەژنی بەرات وابوو، قەت ڕۆژ نەبوو بایەتەوە.

(١٠) سەبا: بای سەبا کە گوڵ و گیا دەشێوێنێ.

واتە: من لەبەر گریان کەوتووم و چم لە دەستنایە، ئەی بای سەبا دەستی من و داوێنت ئەگەر دامانی یار لە خوێنی چاوی من سوور بوو ئەو جار تۆ داوێنی یارم بۆ بگرە و لە باتی من ئاه و ناڵەکە.

دڵم جــەزبی نــیگاهت خســتیە زولفــان، ئــەی خــودا ڕوحـمێ
بــە بــەندی جــادووان وا کــەوت غــەریبی دوور وڵاتــی مــن(١١)
بـــڵا مـــەعلووم بــبێ کــوژراوی کــێم یــاران وەســییەت بــێ:
چــراغــی تــوربەتم هــەر دەستەگــوڵ بــێ پاش وەفـاتی مـن(١٢)
ئــەمن چـــی و زوهــدی ســۆفـیانە! مــن و گـۆشـێکـی مـەیخانە
بـــە قـــوربانی نــیگاهێکت هــەموو ســەوم و ســەلاتی مــن(١٣)
بــە خــەندە ڕووی لە زولفـان خسـتە ڕوو فـەرمووی: وەرە یـەعنی
«وەفـــایی»! شــەوچراغــی پــێ دەوێ ئــابی حــەیاتی مــن(١٤)

---

(١١) جادووان: ئیستیعارەیە لە زولفی یار. غەریب: دوور وڵات، ئیستیعارەیە لە دڵی.
واتە: دڵی من کە جەزبی تەماشای بووبوو کەوتە داوی زولفان، ئەو دڵەم وەك غـەریبی دوور وڵات کەوتە داوی جادووگەران.
(١٢) توربەت: خاك، چراغی توربەت: چرایەك کە لەسەر قەبری دادەنێن. گوڵ: ئیستیعارەیە لە یار.
واتە: یاران وەسیەت بێ کە مردم گوڵ لە جێی چرا لەسـەر قـەبرم دانـێن تـا مـەعلووم بـێ لە دونیاشدا کوژراوی دەستی گوڵێ (واتە: گوڵەندام) بووم.
(١٣) زوهد: دونیا نەویستن. سەوم: ڕۆژوو. سەلات: نوێژ.
واتە: من چ کارم داوە لە تەرکی دونیا و زوهدی سۆفیانە، من ئیدی دەچمە گۆشێکی مەیخانە هەرچی نوێژ و ڕۆژووی من هەیە فیدای تەماشایەکی تۆ بێ.
(١٤) شەوچراغ: ئیستیعارە لە ڕوخساری یار. ئابی حەیات: ئیستیعارە لە خەندەو دەمی یارە.
واتە: کاتێ پێکەنی زولفی خستە سەر ڕوخساری، ئـەوە بـەو مـانایەبوو کـە ڕوخسـاری وەك شەوچرایە، زولفی زوڵمەتە و دەمی چەشمەی حەیوانە. ئەو سەرچەشمەی حەیوانەی وەفایی شەوچرای ڕوخساری یاری لازمە.

[ ٥٠ ][١]

لەو ڕۆژە کە دوور بۆتەوە سایەت لەسەری من
سووتاوە لە تاوت هەموو جان و جگەری من[٢]

جەرگم هەموو لەت‌لەت بوو بە سێڵاوی سروشکم
چبکەم کە بە دەریا چووە لەعل و گوهەری من[٣]

دەیفەرموو لەسەر خاکی دەری خۆی کە منی کوشت:
جەننەت بەسە بۆ خوێنی شەهیدی نەزەری من[٤]

قەد وا دەبێ خاکی دەری تۆ تاجی سەرم بێ؟
ئەو دەوڵەتە بۆ من نییە، هەی خاك بە سەری من![٥]

زولفت کە وەکوو شامی غەریبانە لەوێدا
حاڵی چییە داخۆ دڵەکەی دەربەدەری من؟![٦]

---

[ ٥٠ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی مەکفووفی مەحزووفی ئەخرەب. ڕەدیف: من. واژەی قافیە: سەری، جگەری، گوهەری، و...

(٢) واتە: لەو ڕۆژەوە سێبەری تۆ لەسەری من کەم بۆتەوە و لێم‌ناپرسی، لە حەیبەتی تۆدا گیان و جگەری من ئاوری گرتووە.

لە نێوان تاو و سێبەردا تەزاد هەیە. وە لە نێوان سووتان و تاو و جگەردا موراعاتی نەزیر هەیە.

(٣) واتە: لەبەر سێڵاوی فرمێسکم جەرگم لەت بووە و عیلاجم چییە لەعل و گەوهەری من ـ واتە: یار و خۆشەویست ـ چووە بۆ دەریا.

لە نێوان لەعل و دەریا و گەوهەردا موراعاتی نەزیر هەیە.

(٤) واتە: ئەو کاتەی لەسەر خاکی دەرکەکەی ئەمنی کوشت دەیفەرموو پاداشی تۆ ئەوەیە بچیە بەهەشت چونکا شەهیدی تەمەشای منی و شەهیدیش جێی بەهەشتە.

(٥) دەوڵەت: شانس.

واتە: بڵێی ڕۆژێ وا هەڵکەوێ خۆڵی بەردەرکەی تۆ وەك تاجی سەری من بەسەری خۆمدا بکەم، بەڵام خاك بەسەرم ئەوە شانسی من نییە و شتی وا نەگونجاوە.

(٦) شامی غەریبان: ئێوارەی ڕۆژی عاشوورا، یان یەکەم ئێوارەی غەریب، یان یەکەم ☞

**وەك بــولبولی شــەیدا بـە هـەزار نـەغمە دەنـاڵێم**
**جارێکی گوڵم گوێ بـدە نـاڵەی سـەحەری مـن[٧]**
**دیم هاتە عەیادەت دەمی پـڕ خـەندە بـوو یـەعنی**
**ڕۆح و دڵی بـیمارە دەوای گـوڵشـەکـەری مـن[٨]**
**بـێ نـۆرە دڵم هـێنـدە لەسـەر یـەك مـەشکێنە**
**ڕوو وا بکــە شــەوقێکـی بـدا تـا فـەنەری مـن[٩]**
**زولفت ســەبەبی جـەزبی دڵم بـوو، بـە بـرۆی تـۆ**
**کــافر بــووە بــۆ قـیبلەیی مـن ڕاهـبەری مـن[١٠]**
**خۆش بەو دەمە ساقی لە دەری مەیکەدە فەرمووی:**
**ئەو جامە لە من بگرە «وەفـایی» بـەسەری مـن[١١]**

---

☞

ئێوارەی ئازیز مردوو.
واتە: زولفت کە بە ڕەشیدا لە شامی غەریبان دەچێ بلێی ئاخۆ دڵە دەربەدەرەکەی من لەوێدا لە چ حاڵ دابێ.
دڵ هەمیشە لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا لە نێو زولفی مەعشووق گرفتارە.
(٧) واتە: وێنەی بولبوڵ بە هەزار ئاواز دەناڵێنم ئەی گوڵی من تاقە جارێ گوێ بدە بە ئاه و ناڵەی دەمبەیانانی من.
(٨) واتە: کاتێ یار هاتە عەیادەتی من دەمی بە پێکەنین بوو، ئەوە بەو مەعنایە بوو کە دەمی من وەك گوڵشەکەر وایە دەرمانی دڵی نەخۆشانە.
(٩) بێ‌نۆرە: لەسەریەك، زووزوو. فەنەر: چرا.
واتە: هێندە لەسەر یەك دڵم مەشکێنە ڕووت وا لێ بکە تا چرای منیش نوورێکی هەبێ.
(١٠) واتە: زولفت باعیس بوو کە دڵم جەزبی ئەبرۆت بووە، تـەماشاکـە وەك کـافرە بـووەتە ڕێنوێنی من بۆ سەر قیبلەی موسوڵمانان کە وەك برۆی تۆ وایە.
(١١) واتە: خۆزگە بەو ڕۆژەی ساقی لە دەرکەی مەیخانە فەرمووی تۆ مەرگی من ئەو جامەش لە دەستی من وەرگرە و بیخۆوە.

[ ٥١ ](١)

خـــەتی ئــازادی ئــەو ڕۆژە بـــە مـــن دا دڵســـتانی مـــن
که ســەروی قـامەتی تـەشریفی هـێنـا بـاغی جـانی مـن(٢)
ئـــەریٚ ئـەی وەسـلی گـوڵزارت حـەیاتی جـاویدانــی مـن
ئـــەریٚ ئـــەی چـاوی بـیمارت تـەبیبی مـیهرەبانی مـن(٣)
کە سەیری حیکمەتی زاری بە عەکسی زولف و چاوی کەوت
چ زوو شێوا بە جـامێك بـادە، عـەقڵی نـوکتەزانـی مـن؟(٤)
دوعای ڕەد و قەبووڵ دەر حەق بە زولفی کـرد و گـیرا بـوو
ئــیلاهی تــێكنـــەچیٚ عـومری درێژی بـاغەبانی مـن!(٥)

---

[ ٥١ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیف: من. قافیە: دڵستانی، جانی، میهرەبانی، و...
(٢) خەت: ئیمزا، گریٚبەست، قەرارداد. دڵستان: یار، دڵبەر.
واتە: لەو ڕۆژە کە سەوڵی قامەتی یار هاتە نێو باغی ڕۆحی منەوە، بـڕیـاری ئـازادی بـە مـن بەخشی.
لە نێوان سەرو، ئازاد، باغ و قامەتدا موراعاتی نەزیر هەیە.
(٣) واتە: ئەی یاریٚ کە هاتنە گوڵزاری تۆ بۆ من ژیانی هەمیشەییە و چاوە نەخۆشەکانت بۆ من وەك دوکتۆرێکی دڵسۆز وان.
(٤) سەیر: تەماشا. زار: دەم.
واتە: کاتیٚ ڕەمزی بچووکی دەمی یار لەگەڵ شکڵی زولف و چاوی ئەودا تێکەڵ بوو، من کە بە نوکتەزان و باریکئەندیش مەشهوور بووم، عەقڵم سـەری لیٚشـێوا، دەڵەی جـامێك بـادەی خواردووەتەوە.
تەشبیهی دەمی یارە بە جامی مەی.
(٥) دوعا: نووشتە. ڕەد و قەبووڵ: دوو وشەی دژ بە یەکن واتە: گیرابوون یان گیرانەبوون.
واتە: دوعام لە زولفی یار کرد و گیرا و قەبووڵ بوو، بۆیە وا درێژە. خودایە عومری یار کە وەك خەوانی من وایە هەر درێژ بیٚ وەك زولفی.

**بە عیشوەی زولفەکەی تۆم دا هەموو سەبر و قـەراری خـۆم**
**بە نەشئەی چاوەکەی تۆ چوو هەموو تاب و تەوانی مـن[٦]**
**ســەری زولفت چــییە؟ عــومری درێژم، تـوولی ئـامالم!**
**قەدی بەرزت چییە؟ سەروی چەمەن، ڕۆحی ڕەوانی من![٧]**
**لە کن تـۆ هـات لە چـەرخـی هـەفتەمین ڕابـرد و نـەتزانـی**
**عـەجەبمام بـۆچ نـەگـەییە عـالەمی بـاڵا فـوغانی مـن![٨]**
**ئەگەر مەجنوونی تۆ نیم لەیلەکەی بـێمـەیلەکـەم بـۆچـی:**
**لە هــەر کــووچێك و بــازاڕێکــیدایـە داسـتانی مـن؟[٩]**
**لە سەر چاهی زەنەخدان دێ و دەچێ ڕوحمی نییە زولفت**
**فــەرەنگی ڕۆژ پــەرەستە، کــافرە زیـندانـەوانـی مـن[١٠]**

---

(٦) دا: دام، فرۆشتم.
واتە: هەموو ئارام و قەراری خۆم دا بە زولفی تۆ کە هەمیشە بێقەرارە تەواوی تاب و تەوانای خۆم دا بە نەشە و مەستی چاوی مەستی تۆ. واتە: زولفت بێقەرارە و چاوت خومارە.
(٧) واتە: زولفت دەزانی وەك چی وایە؟ وەك تەمەنی من و درێژی ئاواتەکـانم وایـە. قـەدی تۆش بە بڵندی لە داری سەوڵی نێو چەمەن و ڕۆحی ڕەوانی من دەچێ.
ئەم بەیتە ئارایەی تەشبیه (ڕازەی وێچواندن) و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.
(٨) عالەمی باڵا: ئاسمان. فوغان: ئاه و زاری.
واتە: ئاه و فوغانی من لە کن تۆ هات و گەییە ئاسمانی حەوتەم، سەرم سوڕماوە ئەی بۆچی نەگەیشتە کن فەڵەك.
(٩) واتە: ئەی لەیلی بێمەیلی من ئەگەر من شێت و مەجنوونی تۆ نیم بۆچی لە هەر کووچە و بازاڕێکدا باسی دڵداری من و تۆ دەگێڕنەوە؟
تەلمیح و تەشبیهی بە لەیلی و مەجنوونی تێدایە.
(١٠) چاهی زەنەخ: چاڵی چەناکە. فەڕەنگی ڕۆژپەرەست: بێدین، ئیستیعارە لە زولفی یارە.
واتە: زولفت وەك زیندانەوانێکی بێڕەحمە بە سەر چاهی زەنەخدانتدا دێت و دەچێ، منیش بەندی ئەو چاڵەم، خودایە ئەو کافرە بێدینە بۆچ بۆتە زیندانەوانی من؟.

**بە داغی زولف و خاڵی تۆ قەتارەی بەسووە فرمێسکم**
**خەیاڵی چین و ماچینی لەسەردا کاروانی من(١١)**
**کوتم: کوا حوسنەکەت؟ عەنبەر فرۆشی زولفەکەی فەرمووی:**
**حەبەش ئیسلامی داگرت، تێکچووە دەور و دوکانی من(١٢)**
**لەگەڵ ئابی حەیات چبکەم؟ بە تۆیە زیندەگی ڕۆحم**
**مەسیحا بۆچی بێ؟ قوربان ئەتۆی ئارامی جانی من!(١٣)**

---

(١١) قەتارە: یەك لە دووی یەك وەك کاروان قەتاری وشتر و شتیوا. بەسووە: بەستووە لەبەر کێشی شیعر. چین و ماچین: وڵاتی چین و ژاپۆنی ئێستا، ئیستیعارە لە درێژایی و دووری و خاڵی یارە.

واتە: فرمێسکی من لە حەسرەت زولف و خاڵی تۆ قەتارەی بەستووە و یەك لە دووی یەکدا دێ، دەڵەی خەیاڵی هەیە بچێ بۆ شاری چین و ماچین ئەوکاروانەی فرمێسکی من.

چین ئیستیعارە لە زولفی یارە کە درێژە. حافیز دەڵێ:

تا دل هرزەگرد من رفت بە چین زلف او　　زان سفر دراز خود عزم وطن نمی‌کند

تەشبیهی چین و ماچین بە زولف و خاڵ ئیهامێکی زەریفی تێدا شاراوەتەوە، زولف هەم درێژە هەم چین و شکەنی هەیە، خاڵ بۆ ماچ کردن دەبێ جوانە پێی بڵێن ماچین.

(١٢) حوسن: جوانی. عەنبەر فرۆش: ئەو کەسەی شتی بۆنخۆش ئەفرۆشێ، ئیستیعارە لە زولفی یارە.

واتە: لە یارم پرسی کوا جوانییەکەت؟ زولفی وەك عەنبەرفرۆش جوابی داوە: من وەکوو ئەشکری ڕەشەکانی حەبەش کەعبەی جەماڵی یارم گرتووە ئیدی دەور و دووکانی جوانی یار کە ڕوخساری بێ، تێکچووە.

دەبێ «من» بگەڕێتەوە بۆ یار دەنا ئەگەر بۆ زولف بگەڕێتەوە تەشبیهەکە غەڵەتە؛ چونکا زولف خۆی حەبەشییە.

[یان دەبێ بەیتەکە بەم شێوەیە بێت: گوتم کوا حوسنەکەی عەنبەر فرۆشی زولفەکەت؟ فەرمووی... ـ«ع.ح.ن»].

(١٣) ئابی حەیات: ئاوی ژیان و نەمری. مەسیحا: پێغەمبەری مردوو زیندووکەرەوە.

واتە: من ئاوی حەیات و فووی مەسیحیم ناوێ تا زیندووم ڕاگرن، تو وەك ئاوی حەیات و فووی مەسیحی هۆی زیندوو ڕاگرتنی منی.

**له داغــی خــاڵی سـەر لێوت دڵم پـڕ خـوێن و خـوێنـاوه**

**کــه هــیندووزاده بـۆتـه مـەحرەمی ڕازی نـیهانی مـن[١٤]**

**نەخۆشی چاوەکـەت، خـوێنـی «وەفـایی» بـۆتـه دەرمـانی**

**فیدات بم، زیز مەبە، ها بـمکوژه دەردت له گـیانی مـن[١٥]**

**[ ٥٢ ][١]**

**جیلوەی سەبا لەنجەی شـەماڵ، بـۆی زولف و خـاڵی یـاردەدەن؟**

**یـا نـەوبەهار دێنـێ بـه بـار، مـیشکی تـەتار بـۆی نـەستەرەن؟[٢]**

---

(١٤) هیندووزاده: ڕەش پێست، ئیستیعاره له خاڵی یاره.

واته: دڵم له داخی خاڵی لێوت پڕ خوێنه بۆچی ئەوکافره ڕەش پێسته بۆته مەحرەمی دەمی تۆ که هۆی ئارامی گیانی منه.

(١٥) واته: ئه و چاوه نەخۆشەت دەرمانەکەی خوێنی وەفائییه، دەوەره بمکوژه ڕۆحم فیدات بێ با نەخۆشیی چاوت عیلاجی بێت.

**[ ٥٢ ]**

تێبینی: ئەم قەسیدەی وەفـاییه کـه جـارجـار بـێ مـولاحەزەی وەزنـی گـوتراوه و تـوولانی بوونەکەی چەندانی کردووه، سروشتی و ئەوینی له ئاکامدا عیرفانییه، قەسیدەیەکی قەوی نییه زۆر کۆششی گوتوویه جگه له وەزنی سواری ڕەجەزەکەی و قافیه دەروونییەکەی شتیوای تێدا نییه. دیاره به ئاوازی دەفیش گوتوویه بۆیه جارجار وەزن دەشکێ، بەم بۆنەوه شەرحی نادەم، ئەوەش مانای وشەکان.

(١) کێشی شیعر: «مستفعلن مستفعلن مستفعلن مسـتفعلن» بـەحری ڕەجـزی مـوسەممەنی سالم. جارجار «مفاعلن مفاعلن مفاعلن مفاعلن» هەزەجی مەقبووز، یا ڕەجـزی مـەخبوون. ڕەدیفی نیه. واژەی قافیه: دەدەن، نەستەرەن و... قافیەی میانی و دەروونی تێدایه.

(٢) به بار: قەیدی میقداره واته به زۆر. نەستەرەن: گوڵه شیلان.

واته: ئەرێ بای سەبا و لەنجەی شەماڵ بۆنی خاڵ و زولفی یار دەدەن، یان بەهاری تازەیه بۆنی موشکی تاتار و گوڵه شیلان به بار دەهێنێ؟.

**ڕەنگی وەنەوشەی دەشت و ڕاغ، عەکسی گـوڵ و سـەحرا و بـاغ**
**عـالەمیان کـردە شـەوچراغ، وەك زولف و ڕووی دڵداری مـەن(٣)**
**بەکەسك و سوور، باغ دەر و ژوور، پڕ بوو لە نوور، وەك کێوی توور**
**لەبەر زوهوور کەوتە حوزوور، نـزیك و دوور دەشت و دەمـەن(٤)**
**بورقەع بەسەر، ئـەتڵەس لەبـەر، گـوڵ هـاتەدەر، وەك بـووکی تـەڕ**
**کاکۆڵ بە دۆش، عەنبەر فرۆش، پێم‌گوت: ئەتۆش؟ دیم غەفلەتەن(٥)**
**گێسـوو بـڵاو بـە نـازی چـاو، هـات لە نـەکـاو، بـە قـەسدی ڕاو**
**ڕۆژ بوو بە شەو، ژیـن بـوو بـە خـەو، بـڕۆ بـڕۆ کـەوتە زەمـەن(٦)**
**جـــیلوێکـــی دا، هـات لێکـی دا، خـۆش تـێکـی دا، ئـارامـی دڵ**
**جـوغد و هـوما هـۆشـی نـەما، کـەوتنە سـەما، چـوونە عـدەن(٧)**

---

(٣) ڕاغ: دەشت. مەن: بە فارسی واتە «من» لەبەر کێشی شیعر.
واتە: وەنەوشە و گوڵ سەحراو باغی کردووە چراخان وەك زولف و ڕووی یاری من.
قافیەی میانی و تەشبیهی تێدایە.
(٤) کەسك: سەوزی چەمەن. زهوور: ئاشکرا بوون. دەمەن: دەشت و سەحرا.
واتە: بە ڕەنگی سەوز و سوور، باغ و دەشت وەك کێوی توور پڕبووە لە نوور، لەبەر ئاشکرابوونی جیلوەی خودا نزیك و دوور هەمووجێ ڕووون بووەتەوە.
(٥) بورقەع: ڕووسەری، ڕووبەند، تاج. ئەتڵەس: نەوعێ پارچەیە ئەکرێ بە عـابا، گـوڵێکـە. غەفڵەتەن: بە بێ ئاگایی. کاکۆڵ بە دۆش: ئیستیعارە لە گوڵە.
(٦) گێسوو بڵاو: زڵف شێواو. قەسد: نیەت. بڕۆ بڕۆ: لاچن لاچن لە کـاتی هـاتنی شـادا. زەمەن: دەشت و دونیا.
واتە: کاتێ گوڵ بە زولفی پەرێشان و چاوی پڕ لە نازەوە بە مەبەستی ڕاوکردن هاتە مەیدانەوە، ئەو کاتە ڕۆژ بوو بە شەو و ژیان و بێدار بوو بە خەو، وەکوو شا هـاتبێتە دەرەوە، بـانگی دوورکەوە، دوورکەوە، کەوتە دونیاوە.
(٧) جوغد: کوندەبوو. هوما: باڵندەی بەخت، دژی جوغدە. عەدەن: هەرمان، بەهەشت.
واتە: یار خۆی نواند ئارامی تەنی تێکدا و کوندە و هوما دوو مەلی دژی یەکتر هەردوو وەشایی کەوتن و چوونە باغەوە. (تەزادی تێدایە).

**زولفی وەشاند، ڕووی خۆی نواند، عەتری وەراند، پێمی نـوانـد**
**کەسی نەهێشت، بانگی دەهێشت: بۆ کێیە وا وەجهی حـەسەن؟[٨]**
**ئەو زولف و ڕووی مـانگەشەوە، خـۆش دەیگـوت و دەیـبیستەوە**
**وێم مــەکــەوە، دەتــوێمــەوە؛ ئـاسك چـاوم، نـاسك بـەدەن[٩]**
**ئــەو دولبــەری مــوعەنبەری، ئــەو مشــتەری هــەروەك پـەری**
**خۆی پێم نواند، دڵمی ستاند، هۆشمی ڕفاند، بە مەکر و فـەن[١٠]**
**ئەو خاڵ و خەت هیندوو فەرەنگ، وەسڵ و هیجران شەهدو شەرەنگ**
**پڕ شۆر و جەنگ، لێمهاتەدەنگ، غەمزەم خەدەنگ، زولفم ڕەسەن[١١]**
**چین چین لەسەر ڕووی وەك شەکەر، زولفی عەنبەر بەستیان چەمەر**
**تابووری چین، هاتن بە قین، خـۆش داوەریـن، بـاغی سـەمەن[١٢]**
**زولف و نـووری، ڕووی بـلووری، بـخووری شـەمعی کـافووری**
**خاڵی سیای، چاوی شەهلای، نافەی خەتای، ئاهووی خوتەن[١٣]**

---

(٨) پێمی نواند: پیشانی دام. وەجهی حەسەن: ڕوخساری جوان. بۆکێیە: کێ هەیەتی.
واتە: یار جوانی خۆی پیشاندا و گوتی کێ ئەوەندەی من جوانە.
(٩) وێم مەکەوە: لێم مەکەوە. ئاسك چاو: چاو قەوی وەك مامز.
واتە: ئەو یارە کە زولف و ڕووی وەك مانگەشەوە چەندە خۆش دەیگوت نزیکم مەکەوە با نەتوێمەوە، چونکە لەشم ناسکە و چاوم وەك چاوی مامز وایە.
(١٠) فەن: فێڵ.
واتە: ئەو یارە بەو هەموو سیفەتە جوانانەوە کە خۆی پێ نواندم بە مەکر و فەن دڵمی ڕفاند.
(١١) شەهد: هەنگوێن. شەرەنگ: زەهر، تەزادن لەگەڵ شەهد. ڕەسەن: تەناف، گوریس.
واتە: ئەو یارە خاڵ و خەت ڕەش و فەرەنگییە بە شەڕەوە پێی گوتم زولفی من تەنافە و غەمزەم تیرە.
(١٢) چەمەر: حەڵقەی شینی گێڕی. تابوور: ڕێژەی نیزامی، لەشکر، مەبەست سەوزەزارە. سەمەن: گوڵێکە.
واتە: لەگەڵ گوڵزاری سەمەن هەموو هاتنە دەر و ڕیزیان بەست.
(١٣) بخوور: مادەیەکی بۆنخۆشە کە بسووتێ. کافوور: مادەیەکی بۆنخۆشی سپییە. شەهلا: جوان. نافە: نێوك. خەتا و خوتەن: دوو وڵاتن لە فەلاتی تەبەت.

**خەندەی دەمی، بۆی پەرچەمی، چاوی بازی، نازی کەمی**
**شەهد و شەکەر، میشك و عەنبەر، یەغمایی تین، تاراجی تەن[(١٤)]**
**بە غەمزەکان، بە ڕەمزەکان، بە قەوسی ئەبرۆی چاوەکان**
**تیروکەمانی تورکەمان، سەیدی دڵان بە جان دەکەن[(١٥)]**
**نرخ و بەهای میشکین هەودای، نافەی هەر تای زولفی سیای**
**بازاڕی چین، موڵکی سەبا، خیتتەی خەتا، شاری «دەکەن»[(١٦)]**
**لەعلی لەبی خۆش مەشرەبی، زولفی شەبی، گۆی غەبغەبی**
**قووتی ڕەوان، ئارامی جان، ئابی حەیاتی مەرد و زەن[(١٧)]**
**ئەبرۆی کەمان، گێسووی کەمەند، زاری بە خەند، باڵا بڵەند**
**هەم سایەبان، هەم سوورەجان، هەم نارەوان دوو نارەوەن[(١٨)]**

---

(١٤) بۆ: بۆن، بێن. یەغما: تاڵان. تاراج: تاڵان. تەن: لەش.
واتە: پێکەنینی و نازی چاوی دڵ و تین و تاو بە تاراج دەبەن.
(١٥) غەمزە: ئیشارە و نازی چاو. ڕەمزە: بە چاو یەك حاڵی کردن. قەوس: هیلالی، برۆ. جان: ڕۆح. سەید: شکار.
واتە: بە غەمزە و ڕەمزە و قەوسی برۆی وەك تیروکەمانی شەڕکەر دڵ و جان تاڵان دەکەن.
(١٦) نرخ: قیمەت. مشکین هەودا: زولفی یار. خیتتە: سەرزەوی. دەکەن: ئەیالەتێکی هیندوستانە.
واتە: قیمەتی زولفی میشکین و بۆنخۆش و ڕەشی یار بازاڕی چین و مەملەکەتی سەبا و سەرزەوی خەتا و خوتەن و شاری دەکەنی هیندوستان دێنی.
(١٧) خۆش مەشرەب: خوێن شیرین، بەتام. غەبغەب: ژێر چەناکە. قووت: خۆراك. مەردو زەن: ژن و پیاو.
واتە: لێو و زولف و ژێر چەنەی یار وەك خۆراکی ڕۆح و ئارامی گیان و ئاوی ژیانن بۆ هەموو کەس.
لەف و نەشری تێدایە.
(١٨) سایەبان: کەپر. سوورەجان: ناوی درختێکی هەمیشە سەوزە. نارەوەن: دارێکی

**ڕەقس و ســـەمای زولفــی دوتــای، لەبــەر هــەوای بــاڵای بــەڵای**
**هەروەك بــولبول بــە ڕۆح و دڵ، بــۆ دارە گــوڵ کــەوتە شــیوەن(١٩)**
**یـــەغما دەکـــەن وەك تـــورکەمان، دەرمـــان دەکـــەن وەك تـــەبیبان**
**وەقتێ دەڕوا ئـارامـی جـان، وەخـتێ کـە دێ تـەسکینی تـەن(٢٠)**
**حـەڵقـەی گـێسـوو تــا تــا لاچـوو، لەسـەر سـینە و عـاریز و ڕوو**
**شەو چوو سەحەر، دیم هاتەدەر، شەمس و قەمەر، سەرو و سەمەن(٢١)**
**لە هــەناسەی ئــەو دڵبــەندەی، فــرقە خــەندەی ئــەو دەم قــەندەی**
**بە بای بەهار دەتگوت بە بار، گوڵ دێنــەخوار بــۆ نــێو چــەمەن(٢٢)**

---

☜
جەنگەڵییە. نارەوان: خاوەن هەنار.
واتە: برۆ و پەلکە و دەم و باڵای وەك سایەبان و درەختی هەمیشە سەوز و داری نارەوەنن.
لەف و نەشر و تەشبیهی تێدایە.
(١٩) ڕەقس و سەما: هەڵپەڕین. دوتا: دوو لا پەلکە. باڵا بەڵا: قەدێ کە بۆ ئەویندارانی بەڵا دەهێنێ.
واتە: سەمای زولفی یار لەسەر باڵای بەرزی وەك بولبول وایە کە بۆ داری گوڵ کەوتبێتە شین و واوەیلا.
(٢٠) یەغما: تاڵان. تورکەمان: قەومی تاڵانچی تورك. دەرمان دەکەن: عیلاج دەکەن. تەسکین: ئارامش. تەن: لەش.
واتە: زولفانی یار وەك تورکان تاڵان کەرن، وەك حەکیم نەخۆش چاك دەکەنەوە کاتێ دێن و دەچن ئارامی بە لەش و گیان دەدەن.
(٢١) تا تا: تاڵ تاڵ، هەودا هەودا. عاریز: ڕوخسار.
واتە:کاتێ زولفی لە سینگ و ڕوخساری لاچوو وەك ڕۆشنی شەو و هاتنی ڕۆژ دەچوو و مانگ و ڕۆژ دەرکەوێ و سەوڵ و سەمەن دیاربێ.
(٢٢) فرقەی خەندە: تریقەی پێکەنین. دەمقەند: ئیستیعارە لە یارە. بە بار: زۆر، بە کۆڵ.
واتە: لە هەناسە و خەندەی یار دەتگوت بای بۆنخۆشی بەهار دێتە نێو چەمەن.

**گێسوو دراز، وەك تێلی ساز، بە چاوی باز، دەیگوت بە ناز:**
**چاوی پڕاو، جەرگی بڕاو، سینەی سووتاو پەیدا دەکەن**[٢٣]
**ئەتۆ چ ڕەنگی ئاوری؟ دەمێکی گوڵ دەمێك شەمی**
**هاوار لە یاری دەمدەمی! فەریاد لە دۆستی ڕیشەکەن!**[٢٤]
**ئەتۆ نە نوور نە ئادەمی! دەمێك دێوی دەمێك پەری**
**هاوار لە یاری سەرسەری! فەریاد لە دۆستی دڵشکەن!**[٢٥]
**ئەی شەوچرای زیندوودڵان! ئەی ڕەنگ و بۆی باغی گوڵان!**
**ناژیم تۆ خۆش، دەمرم، بەڵان، هێندەم بەسە تۆم بێیە کەن**[٢٦]
**جارێك وەرە بەر پەنجەرە، ڕۆحم بەرە یا دڵ بەرە**
**تۆ پادشای موشکل گوشا، من بێ نەوا «یا ذَا المِنَن»**[٢٧]

---

(٢٣) تێلی ساز: سیمی ساز.
واتە: زولفی درێژی وەك سیمی ساز و چاوی بازی دەیانگوت چاوی پڕ گریان و جەرگی بە خوێن و سینگی سووتاو بەرهەم دێنن.
(٢٤) دەمدەمی: بێ‌مەجاز، هەرتاوێ لەسەر حاڵێ. فەریاد: هاوار.
واتە: تۆ چ بەشەرێکی تاوێ گوڵی تاوێك شەمعی، داد لە دەست یاری دەمدەمی کە ڕیشە دەردەهێنێ.
(٢٥) دێو: دژی پەری، ئەجندە. سەرسەری: شێت.
واتە: تۆ چ بەشەرێکی هەم دێوی هەم فریشتە، داد لە دەست یاری شێت و بێ‌مەجاز و دڵشکێن. (لەگەڵ بەیتی پێشدا موساوات هەیە).
(٢٦) بەڵان: بەڵام. بێیە کەن: بێیە لام.
واتە: ئەی یارێ کە شەو چرای زیندووانی، ئەگەر قەرار بێ بشمرم تۆ خۆش، بەڵام کافییە تۆ بێیتە لام.
(٢٧) «یاذا المنن»: ئەی خاوەنی منەت و نیعمەت، سیفەتی خودایە.
واتە: جارێك لە پەنجەرەوە خۆتم پیشاندە، دڵ و ڕۆح هەرکامت پێ‌خۆشە ئەتدەمێ، تۆ موشکل حەل دەکەی ئەی خاوەن منەت.

**دڵ پـــارەیە، ئـــاوارەیـــە، بـــێ چـــارەیە، مـــەیخوارەیـــە**
**مـــوتریب بـــڵێ: ســـاقی وەرە! جـامێك بـدەن، تـارێك لێدەن**[٢٨]

**خـــاکـــی دەری مـــەیخانەتم، تـــەشنەی دوو ســـێ پـــەیمانەتم**
**جـــانانمی، پـــەروانـــەتم، تـــۆ شـــەوچراغـــی ئـــەنجومەن**[٢٩]

**«أنتَ الذي بِـــــجَمالِكَ، بِكَـــــمالكَ، بِـــــجَلالِكَ**
**كَشَـــفَ القِـــدم، وَصَـــفَ العَـــدم، نَشـــفَ الوجـــود للـــوَثن»**[٣٠]

**بـــێ مـــوحتەسیب وەختێ خـــۆشـــە، بـــێ گـــفتوگۆیـــی بـــێ غـــەشە**
**لەو ســـاغیرە وا دڵکـــەشە، کـــامێ بـــە دڵ، جـــامێ بـــە مـــەن**[٣١]

**تـــاری دەمـــادەم خـــۆشـــترە، جـــامی پـــەیاپەی بـــێهـــتەرە**
**کوا جامی جەم؟ کوا تاجی کەی؟ هەی مەی بدە، هەی نەی بزەن**[٣٢]

---

(٢٨) پارە: دڕاو، لەت لەت.
واتە: دڵ پارەیە و بێچارە و ئاوارەیە، ئەی موتریب بڵێ ساقی وەرە و جامێ بێنە و تۆش تارێ لێدە.

(٢٩) تەشنە: تینوو. پەیمانە: جامی شەراب. جانان: مەعشووق. پەروانە: نمادی عاشقە.
واتە: ئەی ساقی من کە وەك خاکی دەری مەیخانەتم (واتە: هەمیشە لەوێم) و تینووی دوو سێ پیاڵەی بادەم، تۆ جانان و من شەمی عاشقی تۆم.

(٣٠) لە نێوان «کشف و نشف و قدم و عدم»دا جیناس هەیە.
تۆ ئەو کەسەی کە بە هۆی جمال و جوانیتەوە ئەزەل دەرکەوت، وە بە کەمال و بێ نەقسی تۆ نەبوون هاتە بوون و بە هۆی جەلال و گەورەیی تۆوە ڕیشـەی بت و بتپەرستی وشك بـوو. مەبەست پێغەمبەرە.

(٣١) موحتەسیب: داڕۆغە. ساغیر: جامی شەراب. کام: ئارەزوو. جام: پیاڵە. مەن: من.
واتە: کاتێکی خۆشە موحتەسیب دیار نییە جامێ بدە و کامێ بدە بە من.

(٣٢) جامی پەیاپەی: جامی شەراب یەك لە دوای یەك. بێهتەرە: چاکترە. جامی جەم: ئاوێنە ئەفسانەکەی جەمشید. کەی: لەقەبی سیلسیلەی ساسانیانە واتە پادشا. نەی‌بزن: شمشاڵ لێدە.
واتە: کاتێ جامی جەم و موڵکی کەی هەموو دیـار نـین دونـیا پـووچە، تـۆش جـامێ بـدە و شمشاڵێ، یان دەمادەم و یەك لە دوای یەك تار لێدە.

ئــــاخر زەمـــــانی هــــیجرەتە، دەورو دووکـــــانی فــــیترەتە
وەقت و ئــەییامی غــیرەتە، تــۆ دڵگــوشا، مـن مـوحتەجەن(٣٣)

خۆزگەم بەوەی بە نەشئەی مەی، بە بانگی دەف، بـە دەنگـی نـەی
دەگرێ هاموون، هەروەك مەجنوون، دڵ غەرقی خوون، ڕووت و ڕەبەن(٣٤)

خۆزگەم بـەوەی سـەودا سـەرە، سـەر تـا پـا زەخـمی خـەنجەرە
ئاو بێ ئاور، بێخـەبەرە، «فـاني فـي‌الله» بـێجـێ و مـەسکەن(٣٥)

گریە و خـەندەی زۆر و کـەم بـێ، سـۆزی سـینەی دەمـادەم بـێ
شادیی شیوەن، خۆشیی غەم بێ، ساغ و کوێری سیرڕ و عەلەن(٣٦)

جەرگی هەموو جێی نەشتەر بێ، خوێنی جـەرگی کـە بـێ دەربـێ
هەتا حەشرێ خوێنی هەر بێ، سەوداسەر و خـوێنـین کـەفەن(٣٧)

---

(٣٣) ئاخر: قەیدە واتە ئاخر دەوری کۆچکردنە. فیترەتە: سستی. موحتەجەن: گووشراو، غەمناك.

واتە: ئاخر ئێستا کە زەمانی دووری و ڕاوەستانە کاتی غیرەتمە، تۆ شادو دڵخۆش و ئەمن غەمبار.

(٣٤) هاموون: دەشت. ڕەبەن: سەڵت و بێ‌کەس.

واتە: خۆزگەم بەوەی بە ئاوازی نەی و نەشئەی مەی وەك مەجنوون دڵ بە خوێن و عاشق ڕوو لە کێوەکان دەکا.

(٣٥) «فاني في اللّه»: پلەیەکە لە مەقاماتی عیرفانداکە جگە لە خودا هیچ شتێکی‌تر مەبەست نییە.

واتە: خۆزگەم بەو کەسەی کە لە مەقامی فەنادا لە ئاو و ئاور ناترسێ و جێ و مەکان بۆ خۆی ئیختیار ناکات.

(٣٦) واتە: ئەو کەسە دەگاتە مەقامی «فنا في اللّه» هەموو ئەم حاڵانەی بەلاوە موهیم نییە. سیفەتی تەزاد هەیە یانی لە مەقامی فەنادا «ضدیت» نییە.

(٣٧) واتە: ئەو کەسەی لە فەنادایە جەرگی هەموو برینداز بێ، خوێنی جەرگی وەك دەرگای بێ دەر بێ هەتا مەحشەر هەر کفنەکەی خوێناوی بێ.

سـەیری ئـافاق و ئـەنفوسی، بـەحسی لە سـەفحەی دڵ نـووسی
گا بەتحایی گا قوددووسی، ڕەهڕەو بێ‌پێ، خۆش‌خوو بێ‌تـەن(۳۸)
«فـــي ضـــيقة أَشــباحنا ســـارَتْ يَـــهوي أرواحُـــنا
لا يَـــــفْتَرِق أَجْـــــناحُنا كـــالطيرِ يَشـــوي للـــوَطن»
خـــۆزگــەم بـــەوەی سـەودایییە، سـەرخـۆشـی شـین و شـاییە
پــیر و شـێخ و وەفــاییە ســـاکــن ســـاڵێك لەهـەر وەتـەن(۳۹)
«یـــــاصاحِ فَـــانظر حـــالك مِـــن مـــالك مـــمّا لَكَ
تَـــــقویٰ و إلّا والك و أبـــــــی لك مـــــــن العـــــدن
أفـــــتحسنوا بـــــمفاعل و فـــــاعل بـــــالظلمات؟
أفـــــتؤمِنوا بِـــــخوارق و خـــالق الفـــلق الألســـن»
شـــێخـــێ کـەوابــێ «مــاسویٰ»، «مــانعتویٰ» لە «مــاغویٰ»
«مـــا یَـــنطِقُ عَـــنِ الهَـــویٰ، فـــاغتنم بـالقلب الحـزن»
شـێخـێکـی ئـاشنایی بـێ، خـودایـی بـێ، «وەفـایی» بـێ
«تـــوجه فَأیـــنما» بـــێتـــە ســـەما دار و دەوەن(٤٠)

•••••••━━●━━•••••••

---

(۳۸) سەیری ئافاق و ئەنفوس:گەڕان بە دونیادا بە دوای نیشانەکانی خوداداکاری عورەفایە بە ئایەتی «قل سیروا في الأرض فانظروا...». ڕەهڕەو: سالیك، عاریف.
واتە: ئەو سەیرەی لە دڵدا نووسیبێ و هەر تاوێ خەڵکی شارێ بێ بەتحایی یا قودسی، ڕەهڕەو بێ لاقی نەوێ، خۆش ئەخلاق بێ جیسمی نەوێ، یانی: خەریکی بڕینی ڕێی تەریقەت بێت.
(۳۹) واتە: خۆزگەم بەوەی شێتە و سەرخۆش لە غەم و شادیدا و مورشید و پیر و بە وەفایە و هەر ساڵێك لە وەتەنێك ساکنە.
(٤٠) واتە: ئەو شێخە کە ئاشنا بە ڕێگەی عیرفان بێ و خودایی بێ و وەفاداری بێ و لە هەر شوێنێ ڕوو یان تەوەججوه بکا، دار و دەوەن (گیاندار و بێ‌گیان) بێنێتە سەما و هەڵخستنەوە (وەجد و جەزبە).

## [ ٥٣ ][(١)]

ئـــەی دڵ وەرە هــۆشــیار بــبە «هــذا طــریق العــاشقین»
مــەحوی جــەماڵی یــار ببە «هــذا طــریق العــاشقین»[(٢)]
لەملاوە گــریەی نـای و نـەی، لەولاوە خـەندەی جـامی مـەی
ئـــاگــر لە عــالەم بــەربدەی، «هــذا طــریق العــاشقین»[(٣)]
جــاریَ لە چــاوان بگــرە خـەو، بگـری بـە نـاڵەی نـیوەشەو
تــا بــێتــەدەر خــورشیدی نـەو، «هـذا طـریق العـاشقین»[(٤)]
شۆری دڵ و سۆزی دەروون، زووخاوی جەرگ و مەوجی خوون
خوێنی گەش و فـرمێسکـی ڕوون، «هـذا طـریق العـاشقین»[(٥)]

---

**[ ٥٣ ]**

(١) کێشی شیعر: «مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن» بـەحری ڕەجـزی مـوسەممەنی سالم. ڕەدیف: «هذا طریق العاشقین». قافیەی میانی لە هەر بەیتیدا دەگۆڕێ. ئەم شێوە غەزەل و قافیە داهێنەرەکەی مەولەوی فارسە.

[تێبینی: مامۆستا گیو موکریانی ڕواڵەتی سەرلەبەری ئەم غەزەلەی بە مەبەستی خزمەت بـە بەشەی کوردی گۆڕیوە و لە باتی «هذا طریق العاشقین» نووسیویە «ئاوایە ڕێگای عاشقان» و لەسەر ئەم شێوەی مامۆستا گیو ئەم غەزەلە ڕێگەی «ئستۆدیۆ»ی گرتووەتە بەر و بە گۆرانـی تۆمار کراوە. «م.ع.ق»].

(٢) واتە: ئەی دڵ وەرە ئاگات لە خۆبێ ئاوایە ڕێگەی عاشقان. لە جـوانـی یـاردا بـتوێرەوە ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(٣) واتە: دەبێ وابژی لەملاوە جامی مەی پێبکەنێ و لەولاوە نای و نەی ناڵەی بێ تا عالەم ئاگری تێبەربێ، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(٤) واتە: دەبێ خەو لە چاوانت بگریەوە و نەخەوی، نیوەشەوان بـناڵی تـا هـەتاوی تـازەت لێ دەرکەوێ، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(٥) واتە: شۆر و شەیدایی دڵ، و دەروون پڕ هەست و شەیدایی بێ و جەرگت زوخاوی لێ بێ و خوێنی گەش مەوج بدا لەگەڵ فرمێسکی ڕوون، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

تــا دڵ نــەسووتێ دەم بــەدەم، فــانی نــەبێ ســەر تــا قــەدەم
پــەروانــە قــەت نــاگــاتە شــەم، «هــذا طــریق العــاشقین»[٦]
تا چاو و دڵ خوێنبار نەکەی، قەتعی هــەموو ئــەغیار نــەکــەی
فــیکری ویســاڵی یــار نــەکــەی، «هــذا طــریق العــاشقین»[٧]
عــاشق دەبــێ مــەستانە بــێ، خــاکــی دەری مــەیخانە بــێ
ســاقی لە کــن پــەیمانە بــێ، «هــذا طــریق العــاشقین»[٨]
گــەر دڵگــوشا بــادی ســەبا، شــەرحــی دڵم بــۆ گــوڵ نــەبا
عــومری عــەزیزم چــوو بــە بــا، «هــذا طــریق العــاشقین»[٩]
ســووتا دەروونــم ســەربەسەر، خــوێنــین دڵە جــان و جگــەر
جــیسمێکــە بــێ ئــیسم و ئــەسەر، «هــذا طــریق العــاشقین»[١٠]
دیسان لەسەر عەهدی ئەلەست، جامێ لە جــانان بگــرە دەست
هەر تا ئەبەد مەخموور و مەست، «هــذا طــریق العــاشقین»[١١]

---

(٦) واتە: دەبێ دڵ خێرا خێرا بسووتێ لە سەر تا پای و بتوێتەوە و لەبەین بچێ دەنا پەروانە ناگا بە دیداری شەم، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(٧) واتە: دەبێ چاو و دڵت بەگریان بکەیتە خوێناو و پەیوەندی لەگەڵ هەموو کەس جگە لە یار بپچڕی، جا ئەوکاتە بە وەسڵی ئەو دەگەی، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(٨) واتە: عاشق ئەوکەسەیە دایم مەست بێ لە دەرکەی مـەیخانە وەك خـاك و خـۆڵ وابـێ لەکن پەیمانەی شەراب بێتە ساقی، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(٩) واتە: ئەگەر بێت بای سەبا کە دڵ ئەکاتەوە شەرحی حاڵی من بۆ یار نەبا عومرم لەبـەین دەچێ، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(١٠) واتە: دەروونم هەموو سووتاوە و ڕۆح و جگەرم بۆتە خوێن و بە زاهیر جیسمم ئەمما شوێنەوارم نییە، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

(١١) ئەلەست: ڕۆژی پەیمانی ڕۆح لەگەڵ خودادا. تەلمیحە بە ئایەی «أَلَسْتُ بِـرَبِّکم قـالوا بلیٰ». دەشکرێ لەجێی «جامێ لە جانان» بوترێ «جامێ لە جامان».

واتە: وەرە لەسەر پەیمانی ئەلەستی خودایی جامێ لە یار وەرگرە و بینۆشە جا تا ئەبەد مەست و مەخموور دەبی، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

**دێوانــــە و ســـەودا ســـەرم، کــوژراوی غــەمزەی دڵبــەرم**
**دڵ پــڕ لە ئــێشــێ نــەشتەرم، «هــذا طـریق العـاشقین»(١٢)**
**چـــاوم بـــە ســـۆزی دڵ تــەڕە، دەریـــایی ئـــاو و ئـــاورە**
**مـــوتریب بــڵێ ســـاقی وەرە، «هــذا طــریق العــاشقین»(١٣)**
**پەروانە خۆی ئاویتە بەست، فەرمووی چرا مەخموور و مەست**
**وەسڵم بە ســووتان دێتــە دەست، «هـذا طـریق العـاشقین»(١٤)**
**بــولبول دەنــاڵێنــێ حــەزین، گــوڵ دێتــە عـیشوە و پـێکـەنین**
**بگـــری بــە ســـۆزی ئـــاتەشین، «هـذا طـریق العـاشقین»(١٥)**
**چــی وەك «وەفــایی» بـەندەیە؟ لەو بـاغی دڵ گــوڵ خــەندەیە؟**
**بـــەو جـــامە خـــزری زیـندەیە؟ «هـذا طـریق العـاشقین»(١٦)**

---

(١٢) واتە: شێت و دێوانەم و بە غەمزەی یار کوژراوم، دڵم پڕ لە دەردی نەشتەری ناز و مژۆڵی ـزە، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.
(١٣) واتە: چاوم بە سۆزی دڵم تەڕ بووە و دەریایەك لە ئاو و ئاگرم کۆکردووەتەوە، موتریب ـنگ بکە بڵێ ساقی مەی بگێڕە، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.
ـە نێوان ئاو و ئاوردا تەزاد و لە نێوان موتریب و ساقیدا موراعاتی نەزیر هەیە.
(١٤) واتە: پەروانە خۆی فڕەدایە ناو ئاگرەوە، جا چرا کە بۆ خۆی مەست خومارە پێی وت بۆ ـو دەکەی؟ ئەویش وتی: من کاتێ دەگەمە وەسڵی یار کە بسووتێم، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.
(١٥) واتە: بولبول بە غەمناکی دەناڵێنێ و گوڵ بە عیشوە و پێکەنین دێ تۆش دەبێ بە ئاهی ـورین بگریت، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.
(١٦) واتە: هەرکەس وەك وەفایی لە باغی ئەو یارە پێکەنینی وەك گوڵ وایـە دەبـێ بـەندە و غولامی بێ، بەو جامی دەستی یارە وەك حەزرەتی خزرە قەت نامرێ، ئاوایە ڕێگەی عاشقان.

**[ ٥٤ ]**[1]

**ئـــەی ڕەفـــیقان وەرنـــە یـــاریم زۆر زەلیـــلم دڵشکـــاو**
**جـــان و دڵ مـەحرووقی نـارم، ئـاخ لە بـۆ تـێرێك دراو!**[2]
**ئـــاخ لە بـــۆ تـــێرێك دراوان، نـووری دڵ، بـینایی چـاوان**
**مـــەرهەمی دڵ کـــۆکـــراوان، مـــۆمـــیای پشـتی شکـاو**[3]
**کوا ڕەفیقێکـی تـەواو بـێ، شـێرمـەرد و دەستبـڵاو بـێ؟**
**ســـاحیبی چـایی و پـڵاو بـێ، حـاتەمی دەوران بـە نـاو**[4]
**زێڕ و زیو فیکر و خەیاڵمە، دایك و بـاب و مـام و خـاڵمـە**
**دولبـــەری سـەد مـاه و سـاڵمـە، لازم و مـەلزووم کـراو**[5]

---

**[ ٥٤ ]**

تێبینی: ئەم غەزەلە زۆرتر لە تەنز دەچێ و لەگەڵ عیرفانی وەفاییدا یەك ناگرێتەوە.

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فـاعلاتن فـاعلات» بـەحری مـوسەممەنی مـەکفووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: شکاو، دراو، بەناو، و...

(٢) مەحرووق: سووتاو. نار: ئاگر. تێر: توورەکە، هەمانە، خورجین. دراو: پووڵ و پارە.
واتە: ئەی هاوڕێیان وەرنە کۆمەکیم زۆر زەلیل و دڵشکاوم گیان و دڵم بە ئاور سووتاوە، ئاخ بریا توورەکەیەك پارەم هەبایە.

(٣) کۆکراو: گووشراو، «منقبض»، وێكهاتوو. مۆمیا: بە مێو پێچراو، مادەیەکـە لە ئـەندامـی شکاوی دەگرن.
واتە: ئاخ بۆ خورجینێك پووڵ کـە وەك نـووری دڵ و بـینایی چـاوان وایـە بـۆ دڵە گـوشراو و غەمگینەکان مەرهەمە و بۆ پشتی شکاو وەك مۆمیایی وایە.

(٤) واتە: کوا ڕەفیقێکی وا مەرد و ئازا وەك شێر وابێ و خاوەنی چایی و پڵاوبـێ لە زەمـانی خۆیدا وەك حاتەمی تایی بەخشەندە بێ.

(٥) واتە: زێڕ و زیو وەك خاڵ و مامی من وایە و شەو و ڕۆژ و مانگ و ساڵ لە بیرمدایە بۆ من لازم و مەلزوومە هەردەبێ پێم بێ.

**زێڕ و زیو بـابی هـەتیوان، غـەوس و قـوتبی هـیچ نـەدیوان**
**ئاخ کە لە مـنیش بـۆتـە مـیوان، دیـن و دڵ بـۆی دانـراو(٦)**
**هــەر کــە پــارێکـی دەبـینم، دێتـە کـوڵ جـۆشـی گـرینم**
**دادەنـــێم ئــیمان و دیـــنم، دێمــە ئــیکلام و ســڵاو(٧)**
**دێمــە ئــیکلام و ســڵاوان، زێڕ و زیــو بــینایی چــاوان**
**ڕاحەتی جـەرگ و هـەناوان، گـەر بـە «سـیها»بـێ تـەواو(٨)**
**چا و زێڕم بـۆ وەدەرنـێن، سـوێنـد و مـوسحافم لە بـەرنێن**
**خــەنجەر و شــیرم لەسـەر نـێن، عـاشقم عـاشقی دراو(٩)**
**عــاشقم عــاشق بــە زێڕم، ئــەی خـودا چـاوان دەگـێڕم**
**پــڕبکــەی خــورجـین و تـێرم، دا مـنیش بـبمە پـیاو(١٠)**

---

(٦) غەوس: نەجاتدەر. هیچ نەدیو: فەقیر. دانراو: دۆڕاو.
واتە: زێڕ و زیو بابی هەتیوە و نەجاتدەری فەقیرانە، ئاخ بۆچ نـایە بـۆ لای مـن وەك مـیوان جارجارێ کە من دڵ و دینم بەو دۆڕاندووە.
(٧) ئیکلام: کڕنووش
واتە: هەر پووڵێ دەبینم ئیمان و دین فیدا دەکەم و کڕنووشی لەبەر دەبەم.
دیارە ئەم شیعرە بە تەوسی گوتراوە دەنا وەفایی ئەم ئاواتانەی نەبووە.
(٨) سیها: تەغار.
واتە: سڵاوی دەکەم و ڕێزی لێ‌دادەنێم وەك بینایی چاوم وایـە و هـۆی ڕەحـەتی جـەرگ و هەناومە ئەگەر بە تەغار و بە زۆری دەسکەوێ.
(٩) سوێند: قەسەم. موسحەف: قورئان. خنجەر و شیر لە سـەرنان: کینایەیە لە هـەڕەشـە و تەهدید کە ئەو کارە مەکە.
واتە: ئەگەر چایی و زێڕم لێ دەرکەوێ و سوێند و قورئان بهێننە ڕێم و خنجەر و شمشێر لە سەرم ڕاگرن کە کاری وا مەکە، هێمان هەر عاشقی پووڵم.
(١٠) واتە: من عاشقی زێڕم هەر چاو بە پووڵ دەگێڕم خودایا کیسە و خورجینی من پـڕ بـێ تاکوو منیش ببمە پیاو.

**قەد کەست دی تەرزی من بێ! ساحیبی منداڵ و ژن بێ**
**دەستمایەی کێر وگون بێ! ڕووت و قووت وکەس نەماو؟**(١١)
**غەرقی دەریایی ڕیا بێ، مەستی تۆبەی دوو هەوا بێ**
**عاشقی میسکین «وەفا»بێ ئەی خودا بیخەی لە داو!**(١٢)

**[ ٥٥ ]**(١)

**بۆچی هەودای زولف و دڵ حاکم لە ڕووی جانانە بوو**
**ئەو پەرێشانییە هەموو تەقسیر و سووچی شانە بوو**(٢)

---

(١١) دەستمایە: سەروەت، پاشکەوت.
واتە: قەت دیوتە کەس وەك من دەستمایە هەر دەعباکانی نێوگەڵی بێ، یانی هیچم نییە هەرچەن خاوەنی ژن و منداڵیشم ڕووت و قوت و بێ کەسم.
ئەم شیعرە لە ئەوپەڕی نەبوونیدا گوتراوە، من شکم بۆ ئەوە دەچی شیعری شێخ ئەحمەدی کۆر بێ.
(١٢) واتە: یانی کەس هەیە وەك من لە دەریای ڕیادا نوقم بووبێ تۆبەکەی دوو هەوایی بێ، یانی درۆیی بێ بەڵام وەفاداریش بێ، یاخودا خودایە پووڵ و ماڵێکی زۆرم بۆ لە داوخەی یا من بخەیتە داوی پووڵ و ماڵ.

**[ ٥٥ ]**

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف.
ڕەدیف: بوو. واژەی قافیە: جانا، شا، وا، و...
(٢) واتە: تا هەودای زولفی یار و دڵی ئەسیری دەستی ئەو زولفە لە سەر ڕوخساری یار حاکم بێ، ئەوگرفتاریيانە هەموو خەتای شانەیە ئەو زولفەی لەسەر ڕوخساری یار حاکم کرد.
ئەمە لێدانەوە و بۆچوونی من بوو، بەڵام لە چاپە پشووەکەدا نیوە بەیتی یەکەم بەمجۆرە نووسراوە:

بۆ هەوایی زولف و دڵ چاکم لە ڕووی جانانە بوو.

کە پێم وایە لە نووسینەوەیدا هەڵەی تیاکراوە.

**مووددەتێك بوو نووری چاوم چـوو بـوو، ڕۆژم بـبوە شـەو**
**ڕووی درەخشـانی لەبـەر زولفـی پـەرێشـان وا نـەبوو**(٣)
**زولفــی لادا هــەر بــە ئـوممێد بـووم کـە ڕۆژ ئـاوا بـبێ**
**ماڵی من وێران بوو عومری من چـوو، ڕۆژ ئـاوا نـەبوو**(٤)
**قــەترە قــەترە خــوێنــی چـاوم یـەك دەم ئـارامـی نـییە**
**ڕۆژێکـــی بــۆ کــاروانــی عــاشقان ئــاوا نــەبوو؟**(٥)
**وەك چرا سـووتام و ڕوحـمێکـی بـە حـاڵی مـن نـەکـرد**
**جــارێکــی لوتـفێ لەلای ئـەو یـارە بـێ‌پـەروا نـەبوو**(٦)
**زولفی لادا خاڵی ڕووی دەرکەوت و هیچ ڕووی پێ نەدام**
**شەو چوو ئەستێرەی بەیان هات، ڕۆژی من پەیدا نەبوو**(٧)

---

(٣) واتە: ماوەیەك بوو یارەکەم، یان نووری چاوم ڕۆیشتبوو، ڕۆژ لە من گـەڕابـوو بـە شـەو. ڕوخساری یار لەبەر تاریکی زولفی پەرێشانی ئاوا بەم چەشنە ڕووناك نەبوو. یان: ڕوخساری نەکرابووەوە و گەش نەبوو.

(٤) واتە: یارم زولفی لادا من چاوەڕێی ئەوەم دەکرد ڕۆژ ئاوابێ و لەبەر تاریکی زولفی یـار ڕۆژ بێتە شەو، کەچی من ماڵ وێران بووم و تەمەنم تەواو بوو کەچی ڕۆژ هەر ئاوا نەبوو.
ئەم بەیتە تەسویرەکەی لەگەڵ ماناکەی یەك ناگرێتەوە، لەگەڵ زولف لادان کوڵم دەردەکەوێ ڕۆژ هەڵدێ نەك ئاوا دەبێ. نازانم وەفایی مەبەستی چی‌بووە؟

(٥) واتە: فرمێسکم قەترە قەترە وەك کاروان بە ڕووی یەکدا دێ و ڕاناوەستێ، زەمانێ هەبوو کە کاروانی عاشقان ئاوا نەبوون. یان: ڕۆژێك بۆ کاروانی عاشقان غرووبی نەکرد.
فرمێسکەکانی بە عاشق تەشبیه کردووە.

(٦) واتە: من وەك چرا سووتام و ئەو یارە بێ‌ترسە ڕەحمێکی بە سووتانی من نەکرد.

(٧) ڕوو پێدان: دەرخستنی خۆشەویستی. شەو: لە میسرەعی دووهەم ئیستیعارە لە زولفی یارە. ئەستێرەی بەیان: ئیستیعارە لە خاڵی یارە.
واتە: یار زولفی لە سەر ڕووی لادا و موحەببەتی لەگەڵ نەکردم، ڕۆژ هەڵات و ئەستێرەی بەیان هات و ڕۆژی من نەهات.

لەوحی مەحفووزم لەبەر چاوی بە سەد دڵ خوێندەوە
غەیری بیماری نەسیبی عاشقی شەیدا نەبوو[٨]
بەستەیی زنجیری زولفی تۆم نیگاهێ! ڕەحمەتێ!
ئەی تەبیبی میهرەبان! ئامان دڵم دێوانە بوو[٩]
یا نەخۆشی چاوی تۆم یا بێقەراری زولفی تۆ
عاشقی بێچارە قەت بێدەرد و واوەیلا نەبوو[١٠]
وا بە دەردی چاو و داغی زولفی تۆ حالم نییە
وەك نەخۆشێکی پەرێشان چی کوتم هیچ وا نەبوو[١١]
پەڕپەڕی ئەوراقی دڵ پڕ خوێنی وەك گوڵ کردووە
دەفتەرێکە پڕ لە خوێن هەر ئەو بوو چی تێدا نەبوو[١٢]

---

(٨) لەوحی مەحفووز: لیستی ناوی هەموو کەس لە کن خودا، خوێندنەوەی لەوحی مەحفووز و قورئان و شتی وا نومادی پاڕانەوەیە.
واتە: لەبەر چاوی پاڕامەوە و قورئان و لەوحی مەحفووزم هێنایە تکا کەچی چاوی هەر نەخۆشیی نەسیبی من کرد.
سیفەتی ئیغراق و تەشبیهی موزمەری تێدایە.
(٩) واتە: ئەی تەبیبی دڵسۆزم ڕەحمێ بە حالم بکە دڵم شێت بوو و بەستراوی زنجیری زولفی تۆم ڕەحمێ بە حالم بکە.
(١٠) نەخۆش: ناساغ، سیفەتی چاو. بێقەرار: نائارام، سیفەتی زولفە لە فارسیدا پێی دەڵێن: «جا بە جایی سیفات». واوەیلا: هاوار.
واتە: من یا وەك چاوت نەخۆشم یا بێقەراری زولفتم، عاشقی بێچارە هەر وایە قەت بێدەرد و هاوار نییە.
(١١) واتە: چاوی تۆ دەردێکی داومێ و زولفت وای داغ کردووم دەڵێی نەخۆشی تەبدارم دەڕاوێنم، هەر قسەیەکی دەیکەم هیچی وانییە، وڕێنە دەکەم.
موراعاتی نەزیر لە نێوان دەرد و داغ و نەخۆشی و قسەی بێجێ کردن هەیە.
(١٢) پەڕپەڕ: هەموو لاپەڕەکان. ئەوراق: سەفەحات. دەفتەر: ئیستیعارەیە لە دڵ.

**قەت بە چاوی سووك تەماشای ڕەند و ڕووتێکی مەکە**
**ئەی بەسا ئاوری نیهانی موهلیکی سەد خانە بوو(١٣)**
**هەر دەمێکی مەزهەری دیداری وادی «أیمن»ە**
**خۆ تەجەللا مونحەسیر بۆ سینەیی سینا نەبوو(١٤)**
**باغەبان بۆ خۆی کە هات ئارایشی گوڵزاری دا**
**خاری میسکین تۆ بڵێی چبکا گوڵی ڕەعنا نەبوو؟!(١٥)**
**ئەی فرووغی زوڵمەت و نوورا تۆ و چراغی دین و دڵ!**
**ڕەحمەتێ، وەبزانە ئەم وێرانە هەر ئاوا نەبوو(١٦)**

---

☜

واتە: یار باعیس بووە کە وا دڵم کە وەك دەفتەرێکە هەموو لاپەڕەکانی خوێنی تێدابێت، دڵی من جگە لە خوێن هیچی تری تێدا نییە.

جیناس لە نێوان پەڕ و پڕدا هەیە و موراعاتی نەزیریش لە نێوان پەڕ ئەوراق و دەفتەردا هەیە.

١٣) ڕەند: پیاوی ئازادی ئازا. چاوی سووك: کەمی و بێهیممەتی. ڕووت: فەقیر، نەدار. ئەی بەسا: زۆر جار بووە. موهلیك: کوشندە.

واتە: قەت بە سووکایەتی چاو لە پیاوی فەقیر مەکە، جاری وایە ئاورێکی داپۆشراو سەدان خانی ئاگر داوە.

سیفەتی ئەسلووبی موعادەلەی تێدایە.

١٤) دەم: لەحزە. تەجەللا: خۆنیشاندانی خودا. وادی ئەیمەن: شوێنی دیداری مووسا و خودا لە کێوی تووری سینا. مونحەسیر: تایبەتی.

واتە: هەر لەحزەیەکی دیداری سەد دیداری وادی ئەیمەن دێنێ بۆ پێت وایە خۆپیشاندانی خودا بە عەبد هەر تایبەتی کێوی تووری سینایە؟

١٥) واتە: کاتێ باغەوان بۆ خۆی ئارایشی گوڵزاری داوە دڕك چ گوناحێکی هەیە وەك گوڵ جوان دروست نەکراوە.

ئەم بەیتە جەبری خیلقەت دەگەیەنێ، خواجە عەبدوڵڵای ئەنساری دەفەرموێ: «الهی اگر کسنی تلخ است از بوستان است».

١٦) فرووغ: ڕووناکی. تۆ و چراغی: واو واوی قەسەمە.

☜

**گوڵ بەبا سـونبوول بـە تـاراجـی خـەزان چـوو عـاقیبەت**
**هەچ گوڵێك لافی لە ڕەنگ و بۆت نـەدا ڕیسـوا نـەبوو[١٧]**
**گـــەر ئـــەتۆ لوتــفێك بـفەرمووی بـێزوبـانی مـن بـەسە**
**مـەیلی تـۆ بـوو وەرنـە ئـادەم عـالمی ئـەسما نـەبوو[١٨]**
**تا بە ئـاه و نـاڵە نـەگـریت فـەیزی ڕەحـمەت زەحـمەتە**
**بێ نـەسیمی بـەرق و بـاران جـۆششـی دەریـا نـەبوو[١٩]**
**شای گوڵان، سولتانی خووبان، ئەوشۆ هات دامەن کـەشان**
**ڕۆژ و شەو، خورشید و زوڵمەت، گەنجی نێو وێرانە بوو[٢٠]**

---

☞

واتە: ئەی کەسێ کە نووری تاریکی و ڕووناکیت، قەسەمت ئەدەم بە چرای ڕۆشنی دین و دڵ وابزانە ئەم دڵەی من قەت ڕۆشنی تێدانەبووە وەرە و ڕۆشن و ئاوەدانی کەوە.

(١٧) تاراج: تاڵان. لاف لێدان: خۆهەڵکێشان.

واتە: گوڵ و سونبوڵ بە تاراجی بای پاییز چوون و نەمان هەر گـوڵێ خـۆی لەبـەرانـبەر تـۆدا ڕانەگرت ڕیسوایی بەسەردا نەهات، واتە تۆ لە گوڵ جوانتری گوڵ نامێنێ تۆ دەمێنی.

(١٨) ئادەم: بابا ئادەم. عالمی ئەسما: زانیاری ناوەکان، تەلمیحە بە ئایەتی: «و علّم آدم الأسماء کلها».

واتە: ئەی خودا! من ئەگەر بێزوبانم و نازانم لەگەڵ تۆدا بدوێم سەیر نییە، لوتفی تۆ هـەبێ زوبان لازم نییە، ئەوە نییە ئادەمیش هیچی نەدەزانی خۆت فێری کەلام و قسەت کرد؟

(١٩) فەیز: ڕەحمەت، بەخشش.

واتە: هەتا تۆ نەگریت بە ئاه و ناڵەوە ڕەحمەت زۆر بە زەحمەت شامیلی حاڵت دەبێ، ئەوە نییە هەتا بەرق و بریسکە و بارانیش نەبێ دەریا ئاوی لێ هەڵناقوڵێ!.

ئەم پەیامە عیرفانییە ئەوەیە قازانجی تەمەننا و داواکردن لە خودا دەگەیەنێ «أدعوني أستجب لکم»، سیفەتی ئوسلووبی موعادەلەی تێدایە.

(٢٠) شای گوڵان و سوڵتانی خووبان: ئیستیعارە لە یارە. ئەوشۆ: ئەمشەو. دامەن کەشان: بە ناز و عیشوەوە.

واتە: ئەو شەو یار بە نازەوە هات لە حەیبەت جوانی ئەو، ڕۆژ و شەو هەتاو و تـاریکی وەك گەنجێکی نێو کەلاوە وابوون ئەو لە هەموویان جوانتر بوو.

**بانگی نۆشانۆشی ساقی، دەنگی موتریب، سەوتی تار**
**قووتی جان، ڕۆحی ڕەوان، ئارامی دڵ قەت وانەبوو(٢١)**
**دڵ بە دڵبەر، جان بە جانان، شاد و خوڕڕەم کەف زەنان**
**وەسڵی بولبول، بەزمی گوڵ، شایی شەم و پەروانە بوو(٢٢)**
**خاڵی گۆشەی چاوەکەی فەرمووی، «وەفایی» پێت بڵێم**
**«تا نەبوومە خادیمی مەیخانە کارم چا نەبوو!»(٢٣)**

## [ ٥٦ ](١)

**شەهیدی خەنجەرت ئەو ڕۆژە عومری جاویدانی بوو**
**مەڵێ پەروانە خۆ سووتاوە، مەرگی زیندەگانی بوو(٢)**

---

(٢١) واتە: دەنگی موتریب و تار و هەرای نۆشا نۆشی ساقی بە هاتنی یار هێندە بڵند بووەوە کە خۆراکی ڕۆح و ئارامشی گیان قەت بە قەت ئەو بەزمە نەبووە، واتە مەجلیسەکە لە قووتی ڕۆحیش خۆشتر بوو.

(٢٢) واتە: ئەو مەجلیسە وەها مەجلیسێ بوو دڵ بە دەست دڵبەرەوە بوو جان لە کن یار بوو، هەموو شاد بوون و چەپڵەیان لێدەدا دەتگوت دەعوەتی پێکگەیشتنی گوڵ و بولبول و شەم و پەروانەیە. واتە گەیشتنی عاشق و مەعشووق.

(٢٣) مەیخانە: ئیستیعارە لە چاوی یارە.

واتە: خاڵی قەراخی چاوی یار بە منی گوت وەفایی بە دزییەوە پێت بڵێم هەتا نەبوومە خزمەتکاری مەیخانەی چاوی یار کارم چاك نەبوو. واتە هەتا غولامی نەکەی بە سەروەری ناگەی.

[ ٥٦ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیف: بوو. واژەی قافیە: جاویدانی، زیندگانی، ناتەوانی، و...

(٢) واتە: کەسێ شەهیدی عەشقی تۆ بێ ئەو ڕۆژە تەمەنی هەرمانی ئەدرێ، قەت مەڵێن پەپوولە سووتاوە، ژیانی پەپوولە وا لە مەرگەکەیدا، واتە تا نەمری بە ویسالی یاری ڕاستەقینە ناگەی.

**بــە تــیرێ خــۆ لە عــالەم بــۆوە چــاوت، ئــەی شــەهیدیبم**
**لە کــن خــۆ ئــەو فــەرەنگــیزادە عــەینی نــاتەوانــی بــوو؟![٣]**
**سەر و ماڵی بە بێدادی حەبەش پــاماڵە، ئــەی ســەد حــەیف!**
**شەهی حوسنت کە دایم چەتری ســونبول ســایەبانی بــوو[٤]**
**لەبەر تەئسیری خەندەت مــن کــە ســووتام ئــەو دەمــە زانــیم**
**بەڵایی خەرمەنی مــن هــەرچــی بــوو بــەرقی نــیهانی بــوو[٥]**
**بــەخۆڕایــی وەکـــوو پـــەروانـــە مــن ســووتام و نــەمزانــی**
**ئەوەی ئێمەی لە داو خست، ئــیلتیفاتی ســەر زمــانی بــوو[٦]**

---

(٣) فەرەنگیزادە: ئیستیعارە لە چاوی یارە.
واتە: چاوت کە وەك فەرەنگیزادەیە تاقە تیرێکی هاویشت و عالەمێکی ئەسیر ئەکرد و ئیدی دەستبەردار بوو، یارەبی من شەهیدی ئەو تیرە بم لای خۆی چاوت عەینی نەخۆشی ناتەوانی بوو ئەدی بۆچ وای کرد؟
نەخۆشی سیفەتی چاوی جوانە (چشم بیمار).
(٤) بێداد: زوڵم. حەبەش: ئیستیعارە لە زولفی یارە. پاماڵ: غارەت. شەهی حوسن: ئیزافەی تەشبیهییە واتە ڕوخساری جوانی یار. چەتری سونبوڵ: ئیستیعارە لە زولفی یارە.
واتە: ڕوخساری جوانی تۆ کە لای خۆی زولفت وەك سێبەرێ وابوو بۆی، چۆن بوو سپای حەبەشی زولفت هات و ڕوخسارت سەرو ماڵی خۆی لە دەست دا. واتە: بۆچی پەرچەمت شێواوە.
(٥) واتە: کاتێ لەبەر شوێندانانی پێکەنینت من ئاگرم گرت زانیم خەرمانی مــن کــە ســووتا لەبەر هەورەتریشقەی لەپڕدا بوو.
حوسنی تەعلیلی تێدایە، واتە پێکەنینت وەك بریسکە، ئاگر لە ئینسان بەردەدا.
(٦) ئیلتیفاتی سەرزمان: مەرحەبایی و لوتفی بێکردەوە.
واتە: ئەو کاتەی وەك پەپوولە سووتام لەسەر هیچ و خۆڕایی جا بەو واقیعیەتە گەیشتم کە ئەو شتەی منی لە داوی عەشقی تۆ هاویشت مەرحەبایی سەر زارەکی بوو.

**بـــە بـــەدمەستی دەتـــرسێم بـــێتـــە دیـوانـی خـــودا فـــەریاد!**
**کـــەسێ وەك مـــن شـــەهیدی چـــاوەکـــانی نـــیکتەزانـــی بـــوو[(٧)]**
**ئەمن ئەو ڕۆژە لێم مـەعلووم بـوو کـەعبەی دیـن و دڵ گـیرا**
**کە وەك تابووری هیندوو لەشکری ئەگـریجە، سـانی بـوو[(٨)]**
**لەبی گوڵ، زاری گوڵ، ئەندامی گوڵ، ڕوخساری گوڵ، بەر گوڵ**
**هـەتا کـەی مـن بـڵێم سـەربەستە جـەللادم فـلانـی بـوو؟[(٩)]**
**بە هەر سیحرێکی بوو هەر وەك «وەفـایی» کـوشتمت، ئـاخر**
**ئـــەگـــەر ئـەندازەیـی نـازت، ئـەگـەر نـامیهرەبانی بـوو[(١٠)]**

(٧) واتە: چاوی یار وەك مەیخانە وایە هەر کەس شەهیدی بێ بـەدمەستی دەکـا، دەتـرسم ڕۆژی قیامەت بە بەدمەستی داد و فریاد بەرێ بۆ لای خودا، ئەو دەمە شەهیدەکەی چاوی تۆ برووی دەچێ.
تەشبیهی موزمەری تێدایە.
(٨) تابوور: ڕێژە و سەفی نیزامی و سەربازی. ئەگریجە: زولفی بناگوێی یار. سان: ئارایشـی لەشکر.
وتە: من ئەو ڕۆژەی بۆم سەلما کە ماڵی کەعبەی دین و دڵ بە دەست کافران گیرا کە لەشکری هیندوو و ڕەشی زولفی یار لەشکری خۆی ئارایش دابوو، واتە زولفی یـار دیـن و ئـیمان لە ئینسـان ئەسێنێ.
(٩) سەربەستە: پەنهانی.
وتە: تا کەنگێ بە دزییەوە بڵێم قاتڵی من فلانکەسە، قاتڵی من لێو و دەم و ئەندام و سەمەرەی هەر گوڵە، یانی «گوڵەندام»ە.
ئەم گوڵەندامە زۆر لە شیعری وەفاییدا هاتووە دیارە مەحبووبی نێو شیعرەکانیەتی.
(١٠) واتە: بە هەر جۆر بێ ئاخر وەکوو وەفایی منیشت کوشت، جا ئەگەر لە ڕووی نـازەوە بووە، یان لە ڕووی نامیهرەبانییەوە.

**[ ٥٧ ]**[١]

**ئەی لە سایەی سەری زولفت بە نیگا و خـەت و ڕوو**
**بـەستەیی داوە، چ تـاووسە، چ شـەهبازە، چ قـوو**[٢]
**مـەستی ئـەو نـێرگسـە کـاڵەم دەگـریم بـۆ لەبـی تـۆ**
**شیشە بۆ جامی شـەرابـم، کـوڵی گـریەم لە گـەروو**[٣]
**مەمدە بەر حەڵقەیی ئەو زولفـە لەسـەر مـاچی دەمت**
**لە تـەنافم مـەدە مـەمکوژە لە سـەر هـیچ و نـەبوو**[٤]
**تێك‌نەچوو قەت سەری زولفت لە هەناسەی دڵی مـن**
**دووکەڵی ئەو شەمە هەرگیز بە نەفەس واوە نـەچوو**[٥]

---

**[ ٥٧ ]**

(١) کێشی شیعر: «فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن» بەحری ڕەمـەلی مـوسەممەنی مـەخبوونی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: ڕوو، قوو، گەروو، و...

(٢) شەهباز: باڵندەیەکی ڕاوچییە. شـاهین: سـەقر، ئـەویش هـەروەك شـابازە. قـوو: جـۆرە قازێکی سپی و جوانی ئاوییە.

واتە: ئەی کەسێ کە بە زولف و تەماشا و ڕوخسـارت بـاڵـندەکـانی شـاهین و سـەقر و قـوو دەبەستیتەوە.

موراعاتی نەزیر هەیە لە نێوان باڵندەکاندا و بەجۆرێکیش لەف و نەشری غەیرە مـورەتتەبی تێدایە.

(٣) نێرگس: ئیستیعارە لە چاوی یارە.

واتە: مەستی چاوی تۆم و بۆ لێوت دەگریم، لێوت وەك شیشەی شەرابە و منیش وەك مەست گریان لە گەروومدایە. چونکە مەست زوو دەگری. دڵناسك دەبێتەوە. یان قوڵقوڵەی گەرووی گۆزەکە بە قوڵی گریان دەشوبهێنێ.

(٤) واتە: لەسەر ماچێکی دەمت بە ئەڵقەی زولفانت مەمکوژە و لەسەر دەمێکی چکۆلە کە هیچ نییە و دیار نییە، ئیعدامم مەکە.

(٥) واتـە: بـە هـەناسەی مـن زولفت لەسـەر ڕوخسـارت لانـەچوو و ئـەمە وەك ئـەوە وایـە دووکەڵی شەم فووی لێ کەی بەڵام فووەکە نەتوانێ دووکەڵەکە واوەبەرێ.

تەشبیهی مورەککەبی تێدایە.

**لە دوو زولف و سەری کوڵمانی عەجەب ماوم ئـەمن!**
**راستە ئەو نوورە بەڵام نوور نـییە دوو سـایە لە ڕوو**[٦]
**وەرە بـــەو نـــێرگســـە ســـاقی بـــە فـیدای گـەردشتم**
**نەفەسێ بێنەوە گەردش بـە وەفـای جـام و سـەبوو**[٧]
**عـاریز و زولفـی بـە خـەندە بـە «وەفـایی» دەفـرۆت**
**گوڵ بە تا، نافە بە خەرمەن، دوڕڕ و شەکەر بە قوتوو**[٨]

•••••••━━●━━•••••••

٦) واتە: عەجایەب زولفەکانی لەسەر ڕوخساری یارە دەڵەی سێبەرن لەسـەر نـوور، ئـاخر ـوور سەیرە سێبەری هەبێ.
«تەجاهولولعاریف»ی تێدایە، کوڵمی یار نوورە و زولفی یار سایە.

(٧) نێرگس: ئیستیعارە لە چاوی یارە. گەردش: خۆبادان. چەرخ: دەوری مەیگوساری. جام: ـ نە. سەبوو: کووپەی شەراب.
ـ تە: ساقی بە فیدای چەرخ و خولی خۆت بم لەکاتی مەی تێکردن و سەمادا وەرە دووبارە بۆ سەنماندنی وەفاداری لەگەڵ پیاڵەی شەراب و کووپە، ئەمجارەش دەورێك شەرابمان بۆ تێکە ـ خولێك بە دەوری مەیخۆراندا بخۆرەوە.

٨) عـاریز: ڕوخسـار. زولف: مـوو، قژ. خـەندە: پێکـەنین. دەفـرۆت: دەفـرۆشت. نـافە: ـددەیەکی بۆنخۆشە. قوتوو: سندووق، جەعبە.
ـ تە: ڕوخساری یار گوڵی بە تا و جەواڵ بە وەفایی دەفرۆشت، زولفی یار میشکی بە خەرمان بە وەفایی دەفرۆشت، خەندەی دەمی شـەکـر و قـەندی بـە سـندووق و قـوتوو بـە وەفـایی دەفرۆشت.
ـەف و نەشری موڕەتتەب و ئیستیعارە و تەشبیهی تێدایە.

## [ ٥٨ ][1]

بـە چـاوان غـەمزە و ئـیما مـەفەرموو / بە قەتڵی عاشقی شـەیدا مـەفەرموو[2]
کەمن کوشتەی جەمالی تـۆم عـەزیزم، / لە بـاغی «جـنة المأویٰ» مـەفەرموو[3]
ئـەتۆ مـوو سـونبوڵ و ڕووو ئـافتابی / لە حوسنی تەلعەتی لەیلا مەفەرموو[4]
دەڵێن: فەرمووتە بمکوژی بـە نـاحەق / کە تۆ سوڵتانی حوسنی وامەفەرموو[5]
دوو چاوم، دوور لە تۆ، تۆفانی خوێنە / لە مەوج و جۆششی دەریا مەفەرموو[6]
دەمت وابـێنـە، قـیبلەم، تـۆی تـەبیبم / بە تەشریفی دەمی عیسا مـەفەرموو[7]

---

### [ ٥٨ ]

(١)کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن فعولن» بـەحری هـەزەجی مـوسەددەسی مـەحزووف (تایبەتی دوو بەیتییە). ڕەدیف: مەفەرموو. واژەی قافیە: ئیما، شەیدا، «جنة المأویٰ»، و...

(٢) ئیما: ئیشارە. مەفەرموو: دەستوور مەدە.

واتە: بە چاوانت غەمزە و ئیشارە مەکە و ئەم کارەت وەك دەستوورێك وایە بۆ کوشتنی عاشقی شەیدا، وا مەکە.

(٣) «جنة المأویٰ»: بەهەشتی شوێنی پیاوچاکان.

واتە: ئەی عەزیزم کە من کوژراوی ڕوخساری تۆم لە ڕوخساری خۆت کە وەك بەهەشت وایە بێ بەشم مەفەرموو.

(٤) مەفەرموو: باسی مەکە.

واتە: ئەتۆ مووت وەك گوڵی سونبوڵە و ڕووت وەك هەتاو وایە ئیدی باسی ڕوخساری لەیلا مەکە ئەتۆ لەو جوانتری.

(٥) سوڵتانی حوسن: پادشای جوانی.

واتە: دەڵێن دەستوورت داوە بە ناحەق بمکوژن، ئێستا کە تۆ پادشای جوانیت دەستووری وامەدە.

ئەمە ئیهامێکی لەتیفی تێدایە یانی پادشاکان بە ناحەق خەڵك دەکوژن.

(٦) جۆشش: هەڵقوڵین.

واتە: لە دووری تۆ چاوەکانم تۆفان و لەنگێزەیەکی لە خوێنە، ئیدی تۆ بـاسی هـەڵقـوڵیـن و شەپۆلی دەریام بۆ مەکە.

(٧) دەم: زار. تەشریف: گەورەیەك کە بێت بۆ جێیەك. دەمی عیسا: نەفەسی مەسیح.

من و یەك لەحزە شەو ئارام و تاقەت؟! | لە دووری ماهی شەوئارا؟ مەفەرموو[٨]
بە خۆت بمکوژە نەك بەو چـاوە بـازە | بە جەللادانی بـێپـەروا مـەفەرموو[٩]
«وەفـــایی» عــاشقی ئـەندامـی تـۆیـە | شەهیدی قامەتی تووبا مـەفەرموو[١٠]

### [ ٥٩ ][١]

ئەی مایەیی سەد فیتنە بە دوو نێرگسـی جـادوو
ئەی حەڵقەیی زولفت ڕەسەنی گەردەنی ئاهوو[٢]

---

☞

واتە: ئەی یاری وەك قیبلەم دەمت بەلای منەوە بهێنە و تۆ تەبیبی نەخۆشی منی ئیدی لازم نییە عیسا تەشریف بێنێ و بە هەناسەی لاشەی مردووم زیندووکاتەوە، ماچی دەمی تۆ لەو چاترە.
لە نێو (دەم)ەکاندا جیناس هەیە، هەروەها تەلمیحیشی تێدایە.
(٨) واتە: بڕوات هەبێ لە دووری ماهی شەو جوانکەری تـۆ شـەوانـە یـەك لەحـزە ئـارام و تاقەتم، نییە دوورە لە من سەبرو تاقەت.
(٩) جەللاد: سەربڕ، مەئمووری کوشتن، ئیستیعارە لە چاوی یارە. بێپەروا: نەترس.
واتە: بۆ خۆت بمکوژی باشترە نەك دەستوور بەو چاوە بازانەت بدەی، چـونکا ئـەوان وەك جەللادی نەترسن.
تەشبیهی موزمەری چاو بە جەللادەوەی تێدایە.
(١٠) تووبا: دارێکە لە بەهەشت، ئیستیعارە لە قەدی یارە.
واتە: وەفایی عاشقی بەژن و هەموو جێگەی تۆیە ئیدی بە بەژن و باڵاکەت کە وەك داری تووبا وایە شەهیدی مەکە.

**[ ٥٩ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبـی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: جادوو، ئاهوو، و...
(٢) ڕەسەن: گوریس، تەناف. نێرگسی جادوو: ئیستیعارە لە چاوی یارە. ئاهوو: ئاسك، مامز.
واتە: ئەی یارێ کە بە دوو چاوت سەد شەڕ و هەڵا و فیتنە هەڵدەگرسێنـی و هـەر ئـەڵقـەی زولفت دەڵەی تەناف و کەمەندە ملی ئاسکی پێ لە بەند دەکەی.

**ئەی دەستە گوڵی باغی بەهەشتی بـە مـەلاحەت**

**ئەی پستە دەم و سەرو قەد و سیلسیلە گێسوو(٣)**

**خەت سەرشکەنی زولفی لە ئـازاری دڵان کـرد**

**گەر تەربیەتی داوە فەڕەنگ چین بە خەتا چوو(٤)**

**ڕۆژ بــۆوە کــزەی بــا لە خــەیابانی گـوڵانـدا**

**زولفی بە هەناسەم کە لەسەر عاریزی لاچـوو(٥)**

**فەرمووی: وەڕەزم لەو غەرەزی پڕ مەرەزی ئەو**

**ڕازی مەرەزی چاوی کە پرسیم لە ئەرەستوو(٦)**

---

(٣) مەلاحەت: خوێن شیرینی.

واتە: ئەی کەسێ کە لە باری خوێن‌شیرینییەوە دەڵەی دەستەی گوڵی باغی بەهەشتی، دەمت وەك پستە وایە، قەدت دەڵەی داری سەوڵە و پەلکەکانت وەك زنجیرن.

سیفەتی تەشبیهی تێدایە.

(٤) خەت: خەتی ڕوخسار. فەڕەنگ: ئیستیعارە لە زولفی یارە. بە خەتا چوو: هـەڵەی کـرد، سەهوی کرد.

واتە: خەتی ڕوخسارت هات و ڕیـزی زولفـانی لەسـەر ڕوخسـارت پێچ و شکـەن دا و لەم کارەشدا بە هەڵەدا چوو.

لە نێوان فەڕەنگ و چین و خەتادا موراعاتی نەزیر و ئیهامی تەناسوب و ئیستیعارە هەیە.

(٥) خیابان گوڵان: ئیستیعارە لە ڕوخساری یارە. عاریز: ڕوخسار.

واتە: کاتێ زولفی یار بە هەناسەی من لەسەر ڕوخساری لاچوو دەتگوت لە پارکی گوڵان ڕۆژ هەڵاتووە.

تەشبیهی موڕەککەبی تێدایە.

(٦) وەڕەز: بێزاری. مەرەز: نەخۆشی. غەرەز: هەدەف، مەقسوود. ئەرەستوو: فـەیلەسووفێکـی کۆنی یوونانە.

واتە: کاتێ ڕازی نەخۆشی چاوی یارم لە ئەرەستوو پرسی فەرمووی ڕازێکە منیش وەڕەزم لێی و تێ ناگەم.

لە نێوان مەرەز و غەرەز و وەڕەزدا جیناسی ئیخلافی هەیە.

**خەندەی دەمی تۆ بـۆیـە شـیفای دەردی دڵانـە**
**پەروەردە لەگەڵ گوڵشەکەرە گەوهەر و لوئلوو[٧]**
**ئەو خـاڵە چ شـیرینە لە نـێو حـەڵقـەیی زولفت**
**نـەمدیوە سـوهەیلی یـەمەنی بـێتـە تـەرازوو[٨]**
**تـــۆ ڕەنـــجە مـەبە کـوشتنی ئـاسانە «وەفـایی»**
**بەو غەمزە ئیشارەت بکە، بەو چاوە بفەرموو[٩]**

**[ ٦٠ ][١]**

**عـــەزیزم ڕۆحـــی شـیرینم لە مـن بـۆچـی کـەناری تـۆ؟**
**وەرە سەر هەردوو چاوی من کە سەروی جۆیـباری تـۆ[٢]**

---

(٧) گوڵشەکەر: گوڵقەند، ئیستیعارە لە دەم و لێوی یارە. گەوهەر و لوئلوو: دوڕ و مەرجان، ئیستیعارە لە ددانی یارە.
واتە: بۆیە پێکەنینی تۆ شیفای دەردی دڵی عاشقە دەمت وەك گوڵقەندە لەگـەڵ گـەوهەر و مەرجان دروستکراوە. گوڵقەند قەدیم دەرمان بووە.
ئەم بەیتە حوسنی تەعلیل و تەشبیه و ئیستیعارەی تێدایە.
(٨) سوهەیلی یەمەنی: ئـەستێرەی سـیوەیل. تـەرازوو: کـۆ و تـەرازوو، ئـەستێرە خـۆشـەی پەروین.
واتە: خاڵەکەی تۆ لە نێو ئەڵقەی زولفت داکە وەك ئەستێرەی کۆ و تەرازووە زۆر جوانە، من پێم سەیرە خاڵت وەك ئەستێرەی سوهەیلە چی دەکا لە مزڵگەی کۆمەڵە ئەستێرەی ترازوودا.
(٩) واتە: تۆ نارەحەت مەبە کوشتنی وەفایی ئاسانە دەستوور بدە بە غەمزە و چاوت ئـیدی ئەو بۆ خۆی بەو نیگایەت دەمرێ عەزیەتی ناوێ.

**[ ٦٠ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیف: تۆ. واژەی قافیە: کەناری، جۆیباری، هەناری، و...
(٢) کەنار: دوورە پەرێز، واتە زیز.

**لە سەر چاکی گریبانت سەبا شێت بوو وەکێوان کەوت**

**کە ڕێی کەوتە خەیابانی گوڵ و باغی هەناری تۆ**[٣]

**نەخۆشی چاوەکانت بووم و خەندەی تۆ سەبووری دام**

**شیفای بیماری خۆت دا، گوڵشەکەر باری لە زاری تۆ**[٤]

**لەلایێ تارە داوی دڵ، لەلایێ مارە قەسدی سەر**

**چ سیحرێکە؟ عەجەب ماوم لە زولفی تار و ماری تۆ**[٥]

**خەتت هێنا جەمالت پێ نوما، کوا ڕەونەقی خاڵت؟**

**فەڕەنگی هات وکەعبەی گرت و مەندی چوو لە شاری تۆ**[٦]

---

☞

واتە: یارەکەم، ڕۆحی شیرینی من، بۆچی لە من دووری دەکەی وەرە سەرچاوی من، چونکا تۆ وەك داری سەوڵی قەراغی جۆگەی.

داری سەوڵ ئیستیعارە لە یارە، جۆبار: ئیستیعارەیە لە چاوی خۆی، جگە لە ڕازە (ئارایە)ی ئیستیعارە، تەشبیهی موڕەککەبیشی تێدایە.

(٣) چاك: دڕاو، درز. گریبان: یەخە.

واتە: کاتێ بای سەبا لە درزی یەخەی تۆوە چاوی بە سینگ و مەمکی تۆ کەوت وەك شێت هەڵات و دایەکێوان چونکا سینەی تۆ وەك باغی هەنار و سێوان وایە.

ڕازە (ئارایە)ی ئیستیعارەی تێدایە.

(٤) سەبووری: دڵدانەوە. گوڵشەکەر: دەرمانی نەخۆشی و لەرز و تایە.

واتە: من نەخۆشی چاوت بووم پێکەنینی تۆ کە وەك گوڵقەند شیرین بوو دەرمانی دەردی من بوو چاکی کردمەوە.

(٥) واتە: لەلایەك تاری زولفت خەیاڵی هەیە دڵم بڕفێنێ، لەلایەك ماری زولفت خەیاڵی هەیە دڵ هەڵلووشێ، من سەرم لێ شێواوە چ بکەم بە دەستی ئەم ئەگریجە تار و مارەی تۆوە.

لە نێوان تار و ماردا جیناس و ئیهام هەیە.

(٦) خەت: مووی تازە ڕواوی بناگوێ و لاجانگ و سەرووی لێو کە لە ئەدەبیاتدا نیشانەی جوانی و پێگەیشتووییە. وەفایی لەم واژەی خەتە ـکە ئیهامی تێدایە و نامەی ئازادی و ئیستیشهادی گەورەکانیشە ـ زۆر کەڵکی وەرگرتووە.

☜

**ڕەگ و ڕیشەی دڵم هەر دەنگ وناڵەی عیشقی تۆی لێ دێ**
**بلێ موتریب، وەرە ساقی، سەراپا بوومە تاری تۆ(٧)**
**بە چاوت کەوتووم، بۆ زاری تۆ ئاگر لە من بەر بوو**
**سپەندم هەر بسووتێم چاکە من بۆ چاوەزاری تۆ(٨)**
**کوتم: شێواوی زولفم چاوەکەت بەڵکوو عیلاجم کا!**
**ئیشارەی دایە خاڵ و یانی وایە داغداری تۆ(٩)**
**نەخۆشی چاوی تۆم بێهوودەیە دڵداریی خاڵت**
**بە ئیفلاتوون عیلاجی نایە بیللا دەردەداری تۆ(١٠)**
**جەماڵت ئاهی من گرتی خەتی سەبزت بەسەردا کەوت**
**چەمەن ڕابرد و سەرما هات و تێکچوو نەوبەهاری تۆ(١١)**

---

☞

واتە: خەتی تۆ هات و جوانی تۆ پیشاندرا و نمایش کرا و ڕەونەقی خاڵت نەما، خەتت وەك فەرەنگییە و کابەی دڵی گرت و مەندی و ئارامشی شاری دڵی تێك دا.
ڕەفایی لە ژێر تەئسیری جەنگی سەلیبی هەر پێی وایە فەرەنگ کابە دەگرێ.
(٧) واتە: ڕەگ و ڕیشەی دڵم هەر ئاه و ناڵەی دەنگی تۆی لێ دێ، موتریب بە ساقی بلێ وەرن و بەزمەکە سازکەین تۆ تارت ناوێ چونکا من بوومەتە تاری تۆ.
(٨) بە چاوت: سوێند بە چاوت. کەوتووم: نەخۆشم. زار: دەم. سپەند: ئەسپەنەر، قانگ، ئەو گیایەی ئەیسووتێنن بۆ چاوەزار، دەڵێن ئەسپەنەر بسووتێ بۆ تیری چاوی پیس باشە.
واتە: بە چاوت قەسەم نەخۆشی دەمی تۆم من وەك ئەسپەنەر هەر با بسووتێم بەڵام تۆ چاوی پیست لێ دوور بێ.
(٩) واتە: من بە یارمگوت بە دەستی تۆ شێواو و شێتم بە چاوت بلێ چاکم کاتەوە، ئیشارەی کردە خاڵی ڕوومەتی وگوتی هەر تۆ نیت ئەوەش وەك تۆ داغدارە بۆ ڕوخساری من.
(١٠) دڵداری: سەبووری دانەوە. ئەفلاتوون: حەکیمی یوونانی کۆن.
واتە: من نەخۆشی چاوی تۆم خاڵەکەشت ناتوانێ دڵداریم بداتەوە، دکتۆری وەك ئیفلاتوونیش ناتوانێ کەسێ دەردەداری تۆبی چاك بکاتەوە.
(١١) واتە: جوانیی تۆ لەبەر ئاهی ساردی من تێکچوو خەتی ڕوخسارت فریات کەوت، سەرمای هەناسەی من پاییزی هێنا و چەمەن دەوری نەما و نەوبەهاری من تەواو بوو.

**نیگاهی کردە من هەستاوە زولفی خستە ڕوو فەرمووی:**
**قیامەت هات و ڕۆژ گیرا، «وەفایی» هەر خوماری تۆ؟!**[١٢]

## [ ٦١ ][١٣]

**ئەی جەننەتی عەیشی ئەبەدم ڕێگوزەری تۆ**
**نووری نەزەرم، تاجی سەرم، خاکی دەری تۆ**[١٤]
**بەو قامەتە خاڵ و خەتی ڕووی تۆ کە دەبینم**
**هەر گوڵشەنی فیردەوسە بە نەخلی شەجەری تۆ**[١٥]
**سەروی سەهی، قوربان! ئەگەر ئازادە ئەدی بۆچ**
**بادام و گوڵ و سونبول و نەسرینە بەری تۆ؟**[١٦]

---

(١٢) واتە: هەستایە سەر پێ و چاوێکی لە من کرد و زولفی بە ڕوودا دا و گوتی وەفایی لە هەستانم قیامەت هات و زولفی ڕۆژی ڕوخسارمی گرت کەچی تۆ هێشتا هەر خومار و مەیزەدەی.

لەف و نەشر لە نێوان هەستان و قیامەت و زولف و ڕۆژگیراندا هەیە.

[ ٦١ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیف: تۆ. واژەی قافیە: گوزەری، دەری، شەجەری، و...

(١٤) جەننەتی عەیش: جێگەی خۆشی ڕابواردن. ئەبەد: هەتا هەتایی. نەزەر: تەماشا.

واتە: ڕێی هاتوچۆی تۆ بەهەشتی جاویدانی منە و نووری چاوم و تاجی سەرم خاکی دەرکەی تۆیە.

(١٥) نەخلی شەجەر: داری خورمای بەهەشتی، ئیستیعارە لە بەژنی یارە. فیردەوس: بەهەشت.

واتە: کاتێ چاو لە قەد و باڵای تۆ دەکەم و خەت و خاڵت دەبینم، تۆ وەك باخی بەهەشت دەچی و قامەتت داری خورمای بەهەشتە.

(١٦) سەروی سەهی: داری سەوڵی ڕاست. ئازاد: سیفەتی سەوڵە واتە بێ میوە .

**دەدرەوشێ لە نێو زولفی ڕەشت ئارەقی گەردەن**
**خۆ هەر شەوە پەیدا بوو ستارەی سەحەری تۆ؟(١٧)**
**نازانم ئەتۆ بۆچی بە لەب و قامەتی شیرین؟**
**غونچەی شەجەری، یا نە گوڵی نەیشەکەری تۆ؟(١٨)**
**ئەو چاوە کەوا مەستە بە حوسنی ڕوخی زیبا**
**داخۆ چ بکا فیتنەی دەوری قەمەری تۆ؟(١٩)**
**توخودا دەمەکەت دەرخە لە نێو توڕڕە بزانم**
**تامی چییە ئەو حوققەیی شیر و شەکەری تۆ(٢٠)**

---

☞

واتە: ئەی قوربان! ئەگەر باڵات وەك داری سەوڵ ئازاد و بێ میوەیە بۆچی درەختی باڵات بادام و گوڵ و سونبوڵ و نەسرینی گرتووە؟

"بادام" ئیستیعارە لە چاو و "گوڵ" ئیستیعارە لە ڕوخسار و "سونبوڵ" ئیستیعارە لە زولف و "نەسرین" ئیستیعارە لە ڕوخسار یان ئەگریجەیە.

(١٧) واتە: ئارەقی گەردەنی تۆ لە نێو زولفانتدا دەبریسکێتەوە هێشتا ڕۆژ نییە وکات هەر شەوە ئەی بۆ ئەستێرەی بەیان دەرکەوتووە. کە ئیستیعارە لە قەترەی ئارەقی گەردنی یارە. «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

(١٨) واتە: نازنم تۆ چیت و سەرم لێ شێواوە کە بە لێوتدا غونچەی داری یان بە قامەتتدا وەك گوڵی قامیشی شەکرینی؟. نەیشەکەر گوڵی نییە دەکرێ مەبەستی شەکرەکەی ناوی بێت. «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

(١٩) فیتنەی دەوری قەمەر: ئیستیلاحێکە نجوومی کە دەوری قەمەر لە عەقرەبدا ئاژاوە سازی دەبێ.

واتە: چاوی تۆ مەستە و ڕووت ئەوەندە جوانە وەك دەوری قەمەر وایە، بڵێی چ بەلایێ بەدی بهێنێ؟.

(٢٠) توڕڕە: کاکۆڵ و زولفی نێو چاوان. حوققە: سندووقچە. ئیستیعارە لە دەمە.

واتە: تۆبی و خودا دەمت کە زولفت داپۆشیوە دەرخە بزانم دەمت کە وەك سندووقی شیر و شەکەرە تامی چی دەدات؟

ڕازە (ئارایە)ی حوسنی تەعلیلی تێدایە.

خۆ سەیدی حەرەم قەتڵی حەرامە! ئەدی زولفت
کافر کە نەبوو بۆچی منی کوشت لە دەری تۆ؟[٢١]
ئەو ڕۆژە بە زوننارەوە من چوومە خەرابات
زولفت منی کێشا بە ئیشارەی نەزەری تۆ[٢٢]
بۆ من کە نەبێ وەعدەیی دیداری جەماڵت
چبکەم لە بەهەشت و نەزەری حوور و پەری تۆ؟[٢٣]
قەت گوڵ بە ڕوخی تۆ نەبووە، سەرو بە باڵات
سەروێکە ڕەوانبەخشە گوڵی سیمبەری تۆ[٢٤]
بۆ قیبلەیی لای ڕووتە هەموو سەعیی «وەفایی»
عومرەم بە خودا عەینی سەفا وا لە دەری تۆ[٢٥]

---

(٢١) سەیدی حەرەم: نەچیری کابە.
واتە: دەڵێن حەرامە نەچیر لە ماڵی کابە بکوژرێ، ئەدی بۆچی زولفت وەك ڕاوچی لەبەر دەرکەت کە وەك کابەتوڵڵایە ئەمنی کوشت؟
(٢٢) زوننار: پشتوێن یان پەتی خاچی مەسیحییەکان. خەرابات: مەیخانە.
واتە: ئەگەر وەك خاچپەرست بە زوننارەوە چوومە کلیسا خەتای زولفت بوو کە وەك زوننارە و چاوت وەك خەرابات ئیشارەیان کرد و منیان لە ڕێگە بە دەر برد.
(٢٣) واتە: ئەگەر جوانیت کە وەك بەهەشتە نەسیبی من نەبێ، وادەی حۆری و پەری قەرزم لە قیامەتدا بۆ چییە؟. یان دەشکرێ بڵێن تەلمیحە بە ئایەتی: ﴿وُجوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێ ڕوخسار نوورانین کاتێ کە سەیری خودای پێ دەکەن. بەم ڕەنگە مانای بەیتەکە وای لێ دێ: ئەگەر لە قیامەتدا بینینی جەمالت ـکە لە قورئاندا وەعدەت داوە ـبۆم دەست نەدا، من چی لە خۆشییەکانی بەهەشت و حۆری و پەری بکەم هیچیم ناوێ.
(٢٤) واتە: قەت گوڵ وەك ڕوخساری تۆ جوان نییە و سەوڵیش لە باڵای تۆ بەرزتر نییە، بەژنی وەك زێوی گوڵینی تۆ ڕۆح دەبەخشێ.
(٢٥) سەعی: تەلاش و تێکۆشان. سەفا: خۆشی. لە نێوان سەعی و سەفا دا موراعاتی نەزیر و ئیهام هەیە چونکە دوو مەناسیکی حەجیشن.
واتە: تەواوی هەوڵ و خۆشی من بۆ گەیشتن بە قیبلەی ڕوخساری تۆیە کە تەمەنم لە دەرکەی تۆدا ڕابرد.

[ ٦٢ ][١]

پـەنجەی لە حـەنا بـەستووە ئـایا گـوڵم ئـەمڕۆ؟
دەستی لە دڵی کوشتەیی خۆی خستووە یا خۆ؟[٢]
باکـم دڵ و ڕۆحـم نـییە تـۆ زیـز مـەبە قـوربان!
ئەو ڕۆحە بە سەرگەردی سەرت بێ وەرەوە تۆ[٣]
پـــەیوەستە غـــەریقی ئـــەسەری ئـاتەش و ئـابم
بۆ ئابی ڕوخت سینەمە وەك مەجمەری پشکۆ[٤]
تۆ بیو سەری خۆت مەمخەرە زیندانی جودایی
خوێنم نییە، ها! بمکوژە بەم خەنجەری ئـەبرۆ[٥]

---

[ ٦٢ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعولن مفاعل مفاعل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئـەخرەبـی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: ئەمڕۆ، خۆ، تۆ، و...

(٢) حەنا: خەنە، «خضاب».

واتە: ئایا یارم خەنەی لە دەستی داوە ئەوڕۆ یا خۆ پەنجەی بە خوێنی عاشقانی سوورە؟

من پێم وایە فەلسەفەی لێو سوورکردن و دەست لە خەنەدانـی ژنـان هـەر ئـەوەیە کـە یـانی مەعشـووقەمان کوشتووە و خوێنەکەی بە دەم و چنگمانەوەیە.

(٣) واتە: ئەی یاری ئازیزم تۆ وەرەوە ئەمجارەش من لە ڕۆح و دڵ ناترسێم و بە قوربانی تۆی دەکەم.

(٤) پەیوەستە: بەردەوام، هەمیشە. مەجمەر: ئاوردان. پشکۆ: سکڵی ئاور.

واتە: من دایمە نوقوم بووی نێو ئاو و ئاگرم، سینەم بۆ ئاوی ڕوخساری تۆ وەك سکـڵی نـێو ئاگردانی لێ هاتووە.

(٥) خوێن: دییە، خوێنبایی، پارە یا ماڵێك کە لەبری کوشتنی کەسێ بە بنەماڵەی دەدرێ.

واتە: تۆبیو سەری خۆت لە بەندیخانەی دووری خۆتم مەخە، ئەگەریش دەمکوژی بە تیغی ئەبرۆت کە وەك خەنجەرە، فەرموو ها ئامادەم، چونکە من خوێنم بۆتۆ حەڵاڵە و تاوانم نییە. سنعەتی تەشبیهی تێدایە.

**بولبول سیفەت هەر لەحزە لە دەوری گوڵی زارت**
**ناڵینمە هەی ڕۆ! گوڵەکەم ڕۆ! دڵەکەم ڕۆ!(٦)**
**بۆچی نەگریم هەر دەمە بۆ حاڵی «وەفایی»**
**جان خەستە و دڵ عاشق و دڵدار جەفاجۆ(٧)**

**[ ٦٣ ](١)**

**سەرابستان خەرابستانە ئیمڕۆ بەهاری عەیشی مە زستانە ئیمڕۆ(٢)**

---

(٦) بولبول سیفەت: وەکوو بولبول.
واتە: هەروەك بولبولان لە دەوری گوڵی دەمی تۆ دەناڵێم و دەڵێم وای بە حاڵی من گوڵەکەشم ڕۆیی دڵەکەشم ڕۆیی.
(٧) جەفاجۆ: ستەمکار.
واتە: بۆچی بۆ حاڵی وەفایی دایمە نەگریم خۆی دایمە بریندار و بێ‌حاڵە و یارەکەشی جەفاکار و زاڵمە.

**[ ٦٣ ]**

**تێبینی**: لەسەر ئەم غەزەلە هەردوو مامۆستایان (قەرەداغی و هێمن) وە شك کەوتوون کە هینی وەفایی بێ. تەنانەت مامۆستای گەورەی خۆم ـهێمن ـ پێی وایە هی مامۆستا عومەری وەفایە. من خۆم شایەتم و ڕەفیقی مامۆستا عومەری وەفاش بووم هی ئەو نییە و نەبووە، جگە لەمە بە بۆنەی واژەگەلی (بێرووت و ڕووتی و کوردستان) وشەی «وەفایی» وەزنەکەی دەشکا بۆیە مەرحوومی میرزا عەبدولڕەحیم (وەفایی) وای کردووە (لە جێی «وەفایی» «وەفا»ی نووسیوە). بە دڵنیاییەوە هی وەفاییە و هەر غەزەلێکی مامناوەندیش حەیفە دەرباوێژرێ، هەموو شاعیرێ شیعری کز و بەقەوەتی هەیە تەنانەت سەعدی و حافزی فارسانیش شیعری لاوازیان هەیە.
(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن فعولن» بەحری هەزەجی موسەددەسی مەحزووف. ڕەدیف: ئیمڕۆ. واژەی قافیە: خەرابستانە، سەرابستانە، تابستانە، و...
(٢) سەرابستان: سووك کراوەی سەراو و بێستان، واتە جێی خۆش و بەسەفا. خەرابستان: ☜

بـــە زەردی پـــاییزی ڕەنگـــم دیـــارە    بە خـالّی ڕووتـە تـابوستانە ئـیمڕۆ[٣]
ژیـــانی عـــومرەکـــەم بـــێ‌تـۆ زیـانە    گوڵستان بۆم بـە خـارستانە ئـیمڕۆ[٤]
تەواوی زیـندەگـانیت بـێ‌وجـوودت    ســـەراپـــا وەك قـومارستانە ئـیمڕۆ[٥]
کە نارستانی عیشقت بـۆ تـەجەممول    ئەوێستا نـەوعی شـارستانە ئـیمڕۆ[٦]
هەتاوی خاکی گەرمێنت بە من چی؟!    لە بۆ من هەر وەکوو کوێستانە ئیمڕۆ[٧]
گـــوڵی مـــن بـێ‌نـەزیرە، تـۆ تـەماشا    ویـلایەت پـاکـی بـاغستانە ئـیمڕۆ[٨]
خەدەنگت کاری ئەژماری بە مـیقیاس    هەموو مێشـە و چـنارستانە ئـیمڕۆ[٩]

---

☞

ویرانە، کاولکراوە.

واتە: دەشت و بێستان و سەراو بۆ ئێمە ئەمڕۆ کاول بووە و بەهاری شادیمان لێ بۆتە زستان.

(٣) واتە: بە زەردی ڕوخسارمدا دیارە پاییزە و لە خاڵی ڕەشی سووتاوی تۆشدا فەسڵ وەك هاوین دەچێ، ئەمڕۆ.

لە نێوان پاییز و هاویندا موراعاتی نەزیر هەیە.

(٤) ژیان: زیندەگی. زیان: زەرەر. خار: دڕوو، دڕك. جیناسی خەت هەیە لە نێو ئەم دوو وشەیەدا.

واتە: زیندەگی من بێ‌تۆ زەرەرە، گوڵستان بۆم بێ‌تۆ وەك دڕکستان وایە.

لە نێوان گوڵستان و خارستاندا تەزاد هەیە.

(٥) واتە: بێ‌وجوودی تۆ سەراسەر ژینم دەڵەی قومارستان و ڕابواردن بە کایەو گەنجەفەیە.

(٦) کەنارستان: قەراخی شار. شارستان: ناوەڕاستی شار. تەجەممول: جوانی.

واتە: قەراغی عیشقی تۆ بە جوانی دەڵەی ناوەڕاستی شارە، هێندە جوان و پڕ زرق و برقە.

(٧) گەرمێن: قشلاق، ئێلاخ. کوێستان: هەوار، هاوینەهەوار، یەیلاق، لەیلاخ.

واتە: بە من چی تۆ لە هەتاو و وڵاتی گەرمدای کە من بە بێ تۆ لە وڵاتی ساردەسێردا دەژیم.

(٨) واتە: ئەی گوڵی من تۆ گوڵێکی بێ‌وێنەی تەمەشای ئەم وڵاتەکە هەموو لە شەوقی تۆ بۆتە باغ و باغات.

دەکرێ لە واژەی «ویلایەت»دا ئیهامیش هەبێ بە دوو مانای وڵات و جێ‌نشینی.

(٩) مێشە: بێشە، دارستان. خەدەنگ: تیر. ژمارە و میقیاس: ڕادە و درێژە.

واتە: تیری تۆ ئەگەر ئەندازە بگیرێ بە قەد تەواوی چنار و داری نێو جەنگەڵ و لێڕەوارە.

«وەفا» مەزلوومی بەیرووتە بە ڕووتـی    هەتیوی شاری کـوردستانە ئـیمڕۆ[(۱۰)]

[ ٦٤ ][(۱)]

لەسەر ڕووت کـازیبەی زولفت وەلابـە    کــە ســادیق بــێ تـولوعی ئـافتابە[(۲)]
دڵ و دین هەرچی بوو قوربانی تۆ بوون    هەتاکەی ئیدی ئـەم نـاز و عـیتابە؟[(۳)]
بــڵا بــەو ڕۆژە نــیلووفەڕ نــەسووتێ    بە مەرگی من سـەری زولفت وەلابـە[(٤)]

(۱۰) وەفا: نێوی شاعیرە و بە مانای وەفاداریشـە. مـەزڵووم: فـەقیر، سـواڵکـەر. بـەیرووت: شارێکی وڵاتی شام، پێتەختی لوبنان. ڕووتی: هەژاری، فەقیری.
واتە: وەفایی وەك خودی وەفا بە هەژاری لە شاری بێرووت سـواڵ دەکـا کـەچی لە ئـەسڵا هەتیوێکی بێباب و دایکی وڵاتی کوردەوارییە.
دەبێ ئەم شیعرەی لە کاتی هیجرەتەکەیدا وتبێ.

[ ٦٤ ]

(۱) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن فـعولن» بـەحری هـەزەجی مـوسەممەنی مـەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: لابە، ئافتابە، عیتابە، و...
(۲) کازیبە: درۆزنە، فەجری کازیب کاتی هەڵهاتنی ئەستێرەی کاروان کوژە کە هێشتا شەوە و ڕۆژ نەبووەتەوە. سادیق: ڕاستگۆ. فەجری سادیق: کـازیوە، کـاتێ کـە شـەو نـەماوە و بـەیان هەڵدێ.
واتە: زولفت کە فەجری درۆزنە، واتە تاریکە، لە سەر ڕۆژی ڕوخسـارت لابـەرە بـا بـەیانی ڕاستی (فەجری سادیق) دەرکەوێ و خۆری ڕوخسارت هەڵبێ و دەرکەوێ.
لە نێوان کازیبە و سادیق و تولووع و ئافتابدا موراعاتی نەزیر هەیە.
(۳) عیتاب: تووڕەیی.
واتە: هەتا کەی ئەم ناز و تووڕەیییەت بە سەر مندا دەکەی، دڵ و دینم هەرچی هـەمبوو بـە فیدای تۆم کردن.
(٤) بلاّ: بهێڵە. ڕۆژ: ئیستیعارە لە ڕوخساری یارە. نیلووفەڕ: لاولاو، ئیستیعارە لە زولفی یارە.
واتە: تو مەرگی من زولفت لە سەر ڕوخسارت لابە و مەهێڵە ڕوخسارت نیلووفەڕی زولفەکەت بسووتێنێ.
ڕازە (ئارایە)ی حوسنی تەڵەب هەیە.

لە عەکسی عاریزت فرمێسکی چاوم گوڵاوی ڕووتە هەم خوونابی نابە[٥]
وەرە بنوێنە خۆت بمکووژە قوربان بە دینێك کوشتنی عاشق سەوابە[٦]
وەرە بنوارە بەزمی عالەمی دڵ چ خۆش دەورێکە هۆشیاری خەرابە[٧]
ئەگەرچی ناڵەیە هەر زەوق و شەوقە ئەگەرچی گریەیە عەینی سەوابە[٨]
بە ناڵینی دڵی سووتاوی عاشق هەموو هەر نەغمەیی چەنگ و ڕوبابە[٩]
بەچاو و گەردەن و ڕوخساری ساقی هەموو هەر شاهید و شەمع و شەرابە[١٠]

---

(٥) عارز: ڕوخسار. ڕووت: پاك، خالیس. ناب: بێ غەش و پاك.
واتە: لەبەر شەوقدانەوەی ڕوخسارت فرمێسکی چاوی من وەك گوڵاوی خالیس و خوێناوی خالیس وایە.
لە واژەی «ڕووت»دا ئیهام هەیە.
(٦) بنوێنە: نیشان بدە. بە دینێك: بە یەك چاوپێکەوتن، هەم بە مانای بە «مەزهەبێك»یش ئەبێ، ئیهامی تێدایە. سەواب =«صَواب»: مەسڵەحەت.
واتە: ئەی یار! ڕوخسارت نیشان دە و من بکوژە بە خاتری تاقە جارێ چاولێ کردن، کوشتنی عاشق نامەسڵەحەت نییە. یان: خۆت بنوێنە و من بکوژە بە مەزهەبێك کوشتنی عاشق ئەجر و سەوابی هەیە.
(٧) واتە: وەرە تەماشاکە مەجلیسی عالەمی دڵ چ دەورەیەکی خۆشە لەوێدا هۆشیاری باش نییە.
لە نێوان بەزم و دەور و هۆشیار و خەرابدا موراعاتی نەزیر هەیە. ئەم بەیتە زۆر پڕ مانایە دەکرێ بوترێ: لەوێدا دڵ هۆشیارێکی خەرابە، واتە سنعەتی «تەناقوز» بەکار هێنراوە.
(٨) سەواب = «صَواب»: حەق و ڕاستی.
واتە: لەو بەزمەدا ناڵە هەیە بەڵام ناڵەکە هی شەوق و زەوق و شادییە، لەوێدا گریان هەیە بەڵام گریانەکە گریانێکی ڕاست و بەجێیە.
(٩) نەغمە: ئاواز، ئاهەنگ. چەنگ و ڕوباب: دوو ئامرازی مۆسیقان.
واتە: هەر کاتێ عاشق کە دڵی سووتاوە و دەناڵێنێ هەر ئاهەنگ و ئاهێکی بە قەت ئاوازی چەنگ و ڕوباب دڵکێشە.
(١٠) شاهید: دولبەر، ئینسانی جوان. شەمع: مۆم، چرا.

کوتم: بـا قـیمەتی وەسـلت بـە دڵ بـێ    بە ماچێکیش لە زاری خۆت ڕەزابـە[11]
کەچی فەرمووی: دڵت نەشکێ «وەفایی»    ئەوە سەودایە، زەڕڕێکیش حـیسابە[12]

[ ٦٥ ][1]

بە لێوی تۆ و بە چاوی تۆ کەوا هەر مـەست و سـەرمەستە
عەزیزم تا بەکەی ئەم خەستەیە هەر مەست و سەربەستە؟[2]
لە قـوبەی سـینە سـووتاوە دڵم بـەو نـارە پـڕ نـارە
بڕۆی پەیوەستی خستوومی مـنی وا خـەستە پـەیوەستە[3]

---

☞

واتە: ساقی بە چاوی وەك شاهید وایە بەگەردنیدا وەك شەمع وایە و ڕوخسار و لێوی هـەر عەینی شەرابە.
سیفەتی تەشبیهی و لەف و نەشری مورەتەبی تێدایە.
(١١) واتە: گوتم ئەی یار با قیمەتی ویساڵ و بەیەکەوە بوونمان و ماچێکی دەمت لە بەرانبەری دڵەوە بێت، یانی دڵم ئەدەم تۆش ماچێکی زارت بدە.
(١٢) واتە: کەچی فەرمووی ئەی وەفایی دڵت نەئێشـی ئـەوە مـوعامەلەیە و لە مـوعامەلەدا زەڕرەیەکیش دێتە حیساب. واتە دەمی من هێندە بچووکە ماچێکی دەبێ قیمەتی لەوە گرانتر بێت.

[ ٦٥ ]

(١) کـێشـی شـیعر: «مـفاعیلن مـفاعیلن مفاعیلن مـفاعیلن» بـەحری ڕەمـەلی مـوسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: مەستە، بەستە، پەیوەستە، و...
(٢) سـەرمەست: مـەست و بێهـۆش. خـەستە: بـریندار، مـەبەست وەفـاییە. سـەربەست: زینداني و دەست بەسەر.
واتە: ئەی یار! لێو و چاوی تۆ کە دایم مەستن تاکەی منی بریندار بەو دوانە مەست و دەست بەسەر بم؟
(٣) قوببە: دایرە. نار: هەنار، ئیستیعارە لە مەمکە. پڕ نار: پڕ ئاگر. برۆ پەیوەستە: برۆی تێکەڵ. خەستە: بریندار. پەیوەستە: هەمیشە.

☜

بە ئاه و گـریەیی مـن پـێکـەنی، وەك بـەرق و بـاران بـێ!
بەهاران پسته خەندان بـێ بـە نـاز ئـاهێسـته ئـاهێسـتە![٤]
هــەتا زنــجیری زولفـی تـۆم هـەبێ هـەر شـاد و ئـازادم
سـەرم هـەر داوە بـەو داوە، دڵم پـا بـەستە بـەو بـەستە[٥]
بەڵێنـم ڕاسـتە مـن گـەردەنکەچم بـێڕسـتی دەسـتی وی
قەلادە و ڕستە بۆ من پەرچەمی ئەو سەروە نـەوڕەسـتە[٦]
قــەد و قـامەت قـیامەت، «قـەد قـیامت» تـا بـڵێن قـامەت
بڕۆ ئەی تازە گوڵ دەسـتە، دەمـێکـی هـەستە ڕاوەسـتە[٧]

---

☞

واتە: دڵم لە دایرەی سینەی یار بۆ هەناری سووری مەمی یار کە وەك ئاگرە، سووتاوە و دوو برۆی تێکەڵاوی هەمیشە منی نەخۆش خستووە.

لە نێوان پەیوەست و پەیوەستەدا جیناس هەیە هەروەها نار و نار جیناسی تامە.

(٤) ئاهێستە ئاهێستە: وردە وردە. پستەی خەندان: میوەی پستە لە هـەوەڵەوە نـەقەڵەشـیوە دوایی کە دێت بگات وردە وردە دەمی دەکرێتەوە.

واتە: دەمی یار بە ئاه و گریە و زاری مـن وەکـوو پسـتەی بـەهاران، کـە هـێدی هـێدی دەم دەکاتەوە، پێدەکەنێ.

(٥) واتە: هەتا زنجیری زولفی تۆ شك بەرم خۆم بە ئەسیر نازانم و ئازادم و سەرم بەخشیوە بە داوی زولفت و دڵم بە دەستی زولفا پابەست بووە کەچی هەر ئازادم.

بەست: ئامرازی بەستن، ڕازە (ئارایە)ی پارادۆکس یا «متناقض نما»ی تێدایە.

(٦) بەڵێن: شەرت و عەهد و قەرار. گەردن کەچ: لارەمل، مەحکووم. ڕست: پەتێ کە تانجی و سەگ و شتی وای بۆ ڕاو پێ ڕادەکێشن. قەلادە: قەڵەنگ، ئەڵقەیەکە کە لە ملی تانجی دەکەن و ڕستەکەی تێ دەخەن.

واتە: من قەولم موحکەمە ئەسیری پەتی زولفی ئەو یارەم کە دەڵەی سەوڵی تازە ڕواوە بەبێ ئەوەی ڕستی لە مل کردبێتم بۆ خۆم زولفی ئەو لە ملمدا بە ڕست و قەلادە دەزانم.

لە نێوان ڕاستە و ڕستی و ڕستە دا ڕازە (ئارایە)ی جیناسی هەیە.

(٧) قەد و قامەت: بەژن و باڵا. «قەد قیامت»: بە دروستی هەستە سەر پێ. قامەت: هەستان بۆ نوێژ کردن.

☜

**بـــــبارێنـــە گـــوڵ و نـــافە بـــە خـــەندە داغـــی بـــاغانە**
**سەری زولفت کە دەم بەستە لە دەم بـەستە ئـەمە بـەستە**[٨]
**«وەفایی» مەجلیسێ گـەرمە چ خـۆشـە بـێی و سـاقی بـێ**
**وەکوو گوڵدەستە بتگێڕێ بە دڵ لەو دەستە بـەو دەسـتە**[٩]

**[ ٦٦ ]**[١]

**ســەرگەشتە و شـێواوە وەکـوو سـایە لە دووتـە**
**گۆیا سەری زولفت وەکوو من عاشقی ڕووتە**[٢]

---

☞

واتە: تۆ قەد و باڵات قیامەتە هێندە جوانە، هەستە سەرپێ تا خەڵك بە هاتنی قیامەت کـە لە هەستانی تۆ وەدی دێ نوێژەکەیان دابەستن، ئەی گوڵی تازە دەستەکراوکەمێ برۆ و ڕاوەستە. لێرەدا وەفایی یاری بە وشە دەکات، لە نێوان قامەت و قیامەت و قـەد قـامەت و هـەستە و ڕاوەستە و گوڵدەستەدا جیناسی بەکار بردووە کە کەمێ ماناکەی دژوار دەکا.

(٨) دیسان لەم بەیتەشدا یاری بە وشە دەست پێدەکاتەوە و دەفەرموێ:
ئەتۆ پێکەنە تا گوڵ و موشك بباریێ چونکا پێکەنینی تۆ حەسرەت و داخ دەخاتە دڵی باغانەوە. دەم بەست: واتە پەرژینکراو، مەحدوود. لە دەم بەستە: لە دەمتی ببەستە، یان بـە شـێوەی گشتی (بەطور کلّی). ئەمە بەستە: ئەمە بۆ تۆ کافیە. مانای میسرەعی دووەمیش ئاوای لێدێ: سەری زولفت کە دەمی بێگانەی لێ بەستراوە ببەستە بە دەمی خۆتەوە ئـەمە بـۆ تـۆ کـافیە. هەرچی بێ ئەم یاری بە وشەیە ماناکەی دژوار و ناخۆش کردووە، ڕەنگە لێکدانەوەکەی منیش وانەبێ.

(٩) واتە: وەفایی مەجلیسێکی خۆشت هەیە چەندە خۆشە ساقی بێت و وەکوو چەپکە گوڵ لەم دەستەوە بتدا بەو دەستەوە.

**[ ٦٦ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی ئەخرەبـی مـەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: دووتە، ڕووتە، جووتە، و...

(٢) سەرگەشتە: پەرێشان. ڕووت: ڕووی تۆ، بێکەس و ماڵ.

☜

**زەنگی و فەرەنگـی سـەفی کـێشـاوە بـە قـەتڵم**
**غەمزە و موژە دێن بۆ دڵی دێوانە بـە جـووتە**[٣]
**یـاقووتی لەبـانت بـە کـەرەم بـێنـە تـەبەسسوم**
**بۆ تەن ئەوەیە قووەت و بـۆ دڵ ئـەوە قـووتە**[٤]
**نوورانییە عـالەم کـە لە سـایەی سـەری زولفت**
**سایەی سەری تۆ سایەیی مولك و مەلەکووتە**[٥]
**هەرچی هەیە جەننەت بە گـوڵ و نـافە نـەنازێ!**
**عەکسی ڕوخ و عەتری شکەن و تایەکی مووتە**[٦]

---

☞

واتە: زولفت گۆیا وەکوو من عاشقێکی هەژاری ڕوخسارتە و پەرێشان هەروەکوو سێبەر بە ڕووتا دێ.
ڕازەی وێچواندن (ئارایەی تەشبیهـ) و ئیهام و تەشخیسی تێدایە.
(٣) زەنگی: ڕەشپێست، ئیستیعارە لە زولفە. فەرەنگی سوورپێست، ئیستیعارە لە کوڵمی یار یا غەمزەی یارە.
واتە: مژۆڵی یار وەك زەنگی و غەمزەکەی وەك فەرەنگی هەردوو بە جووتە سەفئارایییان کردووە من بکوژن.
ڕازە (ئارایە)ی ئیستیعارە و موراعاتی نەزیر و لەف و نەشری تێدایە.
(٤) قووەت: هێز، قودرەت. قووت: خۆراك، خواردەمەنی.
واتە: ئەگەر لێوت کە وەك یاقووتی سوور وایە لە ڕووی لوتف و مەرحەمەتەوە کەمێ بزەی بێ، بۆ لەش دەبێتە هێز و بۆ دڵیش دەبێتە خۆراك.
لە نێوان یاقووت و قووەت و قووتدا جیناسی ناقیس هەیە.
(٥) مولك: پادشایی. مەلەکووت: عالەمی مەعنا.
واتە: عالەم لە ژێر سێبەری زولفی تۆ ڕووناك بووە، سێبەری سەری تۆ سێبەری ماددی و مەعنەوییە.
(٦) واتە: بەهەشت با هێندە بە بۆنخۆشی و گوڵزاری خۆیەوە فەخر نەکات، جوانییەکەی شەوقدانەوەی ڕوخساری تۆ و بۆنخۆشی زولفی تۆیە.
دەگونجێ لەم بەیتەدا مەعشووق خودا بێ، یان وەك حافز دوو پەهلوو بێ.

[ ٨٠ ][1]

ئــەو زولفــە دووتــایە چ تــەلیسمێکــە چ دامــە؟
سووتاوە ئــەوی پــوختەیە بــەو عــەنبەرە خــامە[2]
دڵ کەوتە سەری زولفــی لەبــەر جــەزبەیی خــاڵی
وەحشـــی ســـەبەبی دانـــەیە پــابەستەیی دامــە[3]
دەستم بگــری تــۆ کــە بــە جــامێکــی ســەبووحی
بەو چاوە، ئــەگــەر پــادشەهی شــامە، گــەدامــە[4]

---

☞

غەزەل بەڵام توولانی و درێژ کە لە بیست و سێ بەیت نابێ کەمتر بێت و شـەرحـم داوە لە قەسیدە چاکەکەی وەفاییدا بۆ شێخ عوبەیدیللاکە داوای تووتنی لێ کردووە. سەلام: دەکرێ بە مانا سلاو بێ و دەشکرێ ناوی کەسێك بێ، ئیهامی تێدایە.

واتە: مەبەست ئەوە نییە شیعرەکەم لە کام قاڵبدا بێ مەبەست لەگەڵ کاك سەلاممە، یان کـە سەلام لە کاکم دەکەم.

[ ٨٠ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعل مفاعل فعولن» بەحری هەزەجی مـوسەممەنی ئـەخرەبـی مەکفووفی مەخزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: دامە، خامە، دامە، و...

(٢) تەلیسم: جادوو، گێژاو. دام: داو، تەپکە. سووتاو: ئاگرگرتوو. پوختە: کوڵاو و بە تەجرەبە. عەنبەری خام: ئیستیعارەیە لە زولف.

واتە: دوو زولفی تۆ چ تەلیسمێکە کە ئەوەی عاقڵ بێ پێی سووتاوە.

(٣) جەزب: کەشش.

واتە: دڵ بە سەبەبی کەششی خاڵی یار کەوتە داوی زولفییەوە دیـارە دڵ وەك بـاڵنـدەیەکـی وەحشی وایە لەبەر تەماعی دانەیەك دەکەوێتە داو تەپکەوە.

(٤) دەستگرتن: کۆمەك و هەدیە. سەبووحی: شـەرابـی بـەیانی. شـام: سـووریە. گـەدامـە: سواڵکەری منە.

واتە: ئەگەر لە جامی سەبووحی چاوت جامێکم بدەیەی پادشای سوریە بە سواڵکەری خۆم دەزانم. یان: ئەگەر پادشای شاماتیش بم خۆم بە فەقیر و موحتاج ئەزانم.

شـەیدایـیی مـن غـەمزەیی ئـەو چـاوەیە بـاعیس
سەرمەستیی من جوملە لەبـەر نـەشئەیی جـامە[٥]

بۆ قەتڵی دڵم بوونە دوو سەف لەشکـری مـوژگان
ئەو نـێرگسـە فـەرماندەری سـوڵتـانی نـیزامـە[٦]

لەو زولفــــە بــڵاو و ســـەفی مـــوژگانە دەلەرزم
مەعلوومە کە شەو لەشکری بەرگەشتە بە سـامە[٧]

بۆ ماچی دەمی کوڵمە لە نـێو پـەرچـەمی خـاوی
لەو زوڵمــەتە بـۆ ئـابی بـەقا نـووری چـرامـە[٨]

عومرێکە دەناڵم بە دڵ، ئـەو قـەد گـوڵە نـەیکوت:
ئەو بولبولە ـ ئاخر ـ بە تـەمای مـیهر و وەفـامە[٩]

بۆ کوشتن ئەتۆ دەست مەدە خەنجەر لە «وەفایی»
لەو غونچە گوڵەی وەك دەمە یەك خەندە تەمامە[١٠]

---

(٥) واتە: چاوی تۆ باعیسی شەیدایی منە نەشە بوونیشم نۆشینی جامی شەرابی چاوتە.

(٦) ئەم بەیتە تیکرارییە و لە بەیتی ژمارەی (٣) غەزەلی پێشوو شەرح دراوە.

(٧) لەشکری بەرگەشتە: لەشکری گەڕاوە، لەشکەری شکستخواردوو.

واتە: لە سەفی مژۆڵی هەڵگەڕاوەت دەترسم دیارە لەشکرێ شکابێ تووڕەیە و بەتایبەت لە کاتی شەودا وەحشەت و ترسی هەر هەیە.

ئەسلووب و موعادەلەی تێدایە.

(٨) واتە: مـاچی سـەری کـوڵمـی یـار لە نـێو زولفـی ڕەشـیدا دەڵێی نـووری چـرای منە لە تاریکستاندا و ئاوی بەقا دەخۆمەوە.

(٩) میهر و وەفا: عەشق و مەحەببەت، داستانێکی عاشقانەیە.

واتە: عومرێکە من بۆ ئەو باڵا وەکوو گوڵە دەناڵم، بێوەفا نەیگوت ئەو بەد بەختە بە هیوای میهرو وەفای منە وەك بولبول دەناڵێنێ.

(١٠) ئەم بەیتەش جگە لە وشەی «وەفایی» کە بەیتی تەخەللوسە لە بەیتی ژمارە ٨ی غەزەلی پێشوودا شەرح دراوە.

[ ٨١ ](١)

بـــــرینداره دڵم ســــــەودا زەدەی زولفـــــی دڵارامـــــە
مـــەکـــەن مـــەنعی دڵی زارم کـــەوا بـــێ‌ســـەبر و ئـــارامـــە(٢)
بە ناز هات بۆ تەماشای شیوەنی دڵ، پێکـەنی فـەرمووی:
لەگەڵ گریەی سوراحی، نەشئەیی مەی، خەندەیی جامە(٣)
موفەسسیر غەمزەکەی ڕێزە و شکستەی زولفی مەعنا کرد
دەڵێ: چی کەوتە بەرپێم کافریش بێ سەر بـە ئـیسلامە(٤)
خەتی هات و بـەسەرچـوو ڕەونـەقی زولفـی دڵئـاوێزی
لە تازیەی ئەهلی دڵ گیرانـی ڕۆژ مـەشهووری ئـەییامە(٥)

[ ٨١ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: دڵارامە، ئارامە، جامە، و...

(٢) سەودازەدە: شێت.
واتە: دڵم شێتی زولفی یارێکە دڵ پێی قەرار و ئارام دەگرێ، مەنعی دڵی زارم مەکەکە بۆچی بێ‌سەبر و قەرارە.

(٣) سوراحی: شووشەی شەراب.
واتە: یار بە ناز هات بۆ تەماشای گریانی دڵم و بە پێکەنینەوە گوتی ئەگەر شووشەی شەراب بگرییێت، مەی نـەشئە دێنـێ و پیاڵە پێدەکـەنێ. لەوانـەیە مـەبەست لەگـریانی سـوراحـی قوڵپەقوڵپی کاتی داکردنی شەراب بێت.
لەف و نەشری مورەتتەبی تێدایە.

(٤) موفەسسیر: ڕاڤەگەر، شاریح. ڕێزە و شکستە: کەم و زۆر، سەرهەم بەندی.
واتە: کە ڕاڤەگەر تەفسیری زولفی پەرێشانی یاری کرد ئاوای شەرح داگـوتی: زولفـی دەڵێ هەرچی وەبەر پێم کەوێ کافریش بێ وەك ئیسـلام وایە.

(٥) خەت: ڕوخساری یار، نامەش مەعنا دەدا.
واتە: کاتێ خەتی ڕوخـساری یار هات ڕەونەقی بازاڕی زولفـی تـێك شکـا، زۆر مـەشهوورە دەڵێن ئەگەر دڵ تازیەدار بێ ڕۆژ دەگیرێ. مەبەست لەم بەیتە ئەوە نییە کە ئەگەر ئەهلی دڵ

**بــە مــەرگی مــن هــەتا مـاوم سـەرت وابـێنـە بـیزانـم:**
**ڕوخە یا بەرگی نەسرینە؟ لەبە یـا شـەککـەری خـامە؟(٦)**
**بە مـەحزی ڕوئـیەتی زولفت سـەرم دانـا، دەبـێ چبکـەم**
**لەئەم بازاڕە تەرکی سەر کە ئەووەڵ سوود و سـەودامـە(٧)**
**بە غەمزەی چاو و لوتفی ئـەو دەمـە ڕۆحـم وەبـەر بـێنـە**
**دەمی تۆ ڕۆحی شیرین، چاوەکەی مەستت مەسیحامە(٨)**
**لەشەوقی ڕووت دەنـاڵێنـم لە سـایەی گـەردەن و زولفت**
**گوڵستان بێ‌سەدای بولبول نییە، گەر سوبحە، گەر شامە(٩)**

---

☞
(پیاوانی خودا) ناڕەحەت بوون، ڕۆژیش ئەگیرێت؛ چونکە ئەمە باسە بە حەدیسی پێغەمبەر ڕەد کراوەتەوە، ئەوەبوو کاتێك کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر فەوتی کرد ڕۆژ گیرا، هـەندێك پێیان وابوو کە ڕۆژ لەبەر ناڕەحەتی دڵی پێغەمبەر گیراوە، بەڵام پـێغـەمبەر فـەرمووی: ڕۆژ و مانگ گیران دوو نیشانە لە دەسەڵاتی خودای مەزەنن و هیچ پەیوەندییەکـیان بـە کـارەساتی مرۆڤەکانەوە نییە. کەوابوو ئەکرێ بڵێین مەبەستی ئەوەیە کە مرۆڤ ئەگەر دڵی ناڕەحەت بوو، لە ڕوخساریدا کاریگەر دەبێ و ڕوخساری دائەگیرێت.
تەشبیهـ و حوسنی تەعلیل و ئەسلووب و موعادەلەی تێدایە.
(٦) واتە: گیانی من هەتا نەمردووم لێوت واوە بێنە بزانم ڕوومەتە یان گوڵی نەسرین، لێوە یان شەکری کاڵە؟.
تەشبیهـ و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.
(٧) بە مەحزی: ئەوکاتەی. سوود و سەودا: قازانجی موعامەلە.
واتە: هەر ئەوکاتەی زولفتم لێ دەرکەوێ نا عیلاجم دەبێ سەرم پێشکەشت کەم، لەم بازاڕەدا دۆڕاندنی سەر باشترین قازانج و سەودایە.
(٨) واتە: بە غەمزەی چاو و مەرحەمەتی دەمت ڕۆحم بهێنەوە بەر، چونکا چاوت مەسیحای منە و دەمت ڕۆحی منە.
تەلیمح و موراعاتی نەزیری تێدایە.
(٩) واتە: لە شەوقی ڕووی ڕوخسار و گەردنی تۆ ڕۆژ و شەو هەر دەناڵێنم دیارە گەر بەیانی بێ یان شەو بێ گوڵستان بێ‌چریکەی بولبول نابێ.

بە تـاتا زولف و ڕووی کـردە «وەفـایی» پـێکـەنی یەعنی:
شەکەر هەمڕاز و عەنبەر هەمسەر و گوڵ باغی بـاڵامـە(١٠)

[ ٨٢ ](١)

بە ماچێ جان دەبەخشێ، ئەم مەسیحای عەسرە، بیستوومە
ئەوا مـن عـاشقی ڕووتـم دەخـیل دڵ زار و مـەزلوومە(٢)
ئیشارەم کردە زولفی ڕوو بە ئەبرۆ بـۆ چـییە؟ فـەرمووی:
بە قـیبلەم نـۆ مـوسوڵمـانێکـە زەنگـیزادەیـی ڕوومـە(٣)
دڵم تـیفلی دەبسـتانی غـەمە وا مـەیدە بـەر غـەمزە
هەتاکەی تیرە باران؟ ئاخر ئـەو مـەزلوومە مـەعسوومە(٤)

---

(١٠) واتە: زولفی تاڵ تاڵ کرد و ڕووی لە وەفایی کرد و پێکەنی کە مـانای ئـەمەیە هـاوڕازم شـەکرە و هاوژینم عەنبەرە و گوڵ و باغیش قەد و باڵامە.

[ ٨٢ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: بیستوومە، مەزلوومە، ڕوومە، و...

(٢) مەسیحای عەسر: عیسای زەمانە، ئیستیعارە لە یارە.

واتە: بیستوومە ئەو یارەی من، عیسای زەمانە و بە ماچێکی مردوو زیندوو دەکاتەوە. ئەوە من عاشقی ڕوخسارتم و دڵیشـم زار و زوڵم لێکراوە، فەرموو هیممەت بخەگەڕ.

(٣) زەنگـیزادە: ڕەش پـێشت، ئـیستیعارە لە زولفـە. ڕووم: سـوور پـێست، ئـیستیعارە لە ڕوخساری یارە.

واتە: گوتم بۆچ زولفت ڕووی لە برۆت کـردووە؟ بـە ئـیشارە گـوتی زولفـم زەنـیگی تـازەی موسوڵمانە و خەڵکی ڕۆمە و دەیەوێ لە میحرابی برۆدا عیبادەت بکا.

(٤) تیفلی دەبستان: منداڵی قوتابخانە، کینایەیە لە ئینسانی بێ گوناه. مەعسووم: بێ گوناه.

واتە: دڵم منداڵێکی بێ گوناحە لە مەدرەسەی غەم دەخوێنێ، مەیدە بەر غەمزەی چاوەکانت، تاکەی تیرە بارانی دەکەی بە نیگا و مژۆڵەکانت؟ ئەو منداڵە زوڵم لێکراوە بێ گوناحە.

**لەبەر تاقی بڕۆت گریانی دڵ بۆ زولفە بەرپا بوو**
**عەجەب ماوم دەڵێن: شەو ڕوو بە قیبلە ناڵە مەحکوومە**(٥)
**لە سیرڕی حیکمەتی زارت کە نوقتەی جەدوەلی ڕووحە**
**عەجەب ماوم! چ نیکتێکە؟ نە مەوجوودە نە مەعدوومە!**(٦)
**سیەهـ ڕۆژ و نەخۆشی تۆم گوڵم ئاشفتە بوو، یەعنی:**
**بە داوی توڕڕە وایە چی لە دووی دوو چاوی جادوومە**(٧)
**«وەفایی» وا لە کوڵ دەگری، بە دڵ بۆ گوڵ دەناڵێنێ**
**بە سەد غولغول دەڵێ بولبول لە باغی قیبلە مەحروومە**(٨)

---

(٥) واتە: لەبەر تاقی برۆت دا دڵم بۆ زولفت دەگریا هەرچەند دەڵێن شەوانە ڕوو بە قیبلە نابێ ئاهـ و ناڵە بکەی.

ئیستیعارەی تێدایە. قیبلە ئیستیعارەیە لە برۆ و شەو ئیستیعارە لە زولفە.

(٦) سیر: ڕاز. نوقتەی جەدوەلی ڕووح: ئیستیعارە لە دەمی یارە کە چکۆلەیە. نیکتە: مەبەست مەوزووعە. مەوجوود: دیار و قابیلی ڕوئیەت. مەعدووم: نادیار و نەبوو.

واتە: من لە بازاڕی دەمت ناگەم بەم چکۆلەییە دەڵەی نوقتەی نووسراوی ڕووحە، شتێکی سەیرە نە دیارە نە ئەوەیە بڵێی نیشە.

(٧) واتە: من گوتم نەخۆش و ڕۆژە ڕەشی زولفی تۆم، ئەو بە پێکەنینەوە گوتی بەڵێ هەر کەس لە دووی چاوی جادووگەر و زولفی ڕەشی من بگەڕێ ئاوای بەسەر دێ.

(٨) قیبلە: گەڕەکێکی سابڵاغە، دەکرێ گوڵەندام ماڵی لەو گەڕەکە بووبێ، شێخ عوبەیدیللایش کە دوور خرابەوە بۆ «تائیف» دەکرێ مەبەست بێت.

واتە: وەفایی بە کوڵ بۆ گوڵ دەناڵێنێ و دەڵێ بولبول لە باغی قیبلە مەجروومە.

**[ ۸۳ ]**[١]

**دوور لە تۆ بـۆ و زولفـە دڵ حـەققی بـەڵا و وەرهـەمە**
**بۆ عەزیزی خۆی هەموو کەس وا بە شین و مـاتەمە**[٢]
**خــاڵی ســەرچـاهی زەنـەخدانت چ شـیرینە؟ دەڵێی**
**هــیندوێکــی تـەشنەیی جـۆیـایی ئـابی زەمـزەمە**[٣]
**زولفەکـەت گـرتمی، بـەیازی گـەردەنت سـووتاندمی**
**خوێنی پەروانە بە دەستەی شەو لەسەر ئەستۆی شەمە**[٤]
**شەمعی مەجلیس دەرمەکـە پـەروانـەکـەی سـووتاوتە**
**هەر ئەوە سەر تا قەدەم بـۆت ئـاتەشین و مـەحرەمە**[٥]

---

**[ ۸۳ ]**

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف « ە». واژەی قافیە: وەرهەم، ماتەم، زەمزەم، و...

(٢) وەرهەم: ماسینی زگ و شتی وا، نەخۆشی هەڵماسین و وەرەم. بۆ و: بۆ ئەو.
واتە: دوور لە تۆ دڵ بۆ ئەو زولفەت غەرقە لە بەڵاو غەم و ناڕەحەتیدا، دیارە هەرکەس شین بۆ ئازیزی خۆی دەگێڕێ یانی ئازیزی دڵی من زولفی تۆیە.

(٣) هیندوو: ڕەش پێست، ئیستیعارە لە خاڵە. زەنەخدان: چەناکە. تەشنە: تینوو. جۆیا: کەسێ بۆ شتێ بگەڕێ. ئابی زەمزەم: کانیاوی زەمزەم کە لە حەرەمی مەککەدایە، لێرەدا ئیستیعارە لە دەمی یارە.
واتە: خاڵی سەر چەناکەی چەند جوانە دەڵێی ڕەش پێستێکە بۆ چاڵی زەمزەم دەگەڕێ.

(٤) بەیاز: سپییەتی.
واتە: زولفت منی گرت و سپیەتی گەردنت ئاگری دام ئەگەر بە دەستە شەو پەروانە بسووتێ خەتای شەمعە، واتە قەتڵی من بە گەردنی تۆیە.
ڕازە (ئارایە)ی ئەسلووبی موعادەلەی تێدایە.

(٥) شەمعی مەجلیس: جوانی نێو کۆڕ و مەجلیس، ئیستیعارەیە لە خۆی.
واتە: من لە مەجلیسی خۆت دەرمەکە من پەپوولەی ڕووی تۆم سووتاوم و بوومەتە نوور و شەوقی مەجلیسی تۆم، هەر منم لە سەرتا پێم ئاگرم گرتووە و مەحرەمی ڕازی تۆم.

**عوشرەت و عەیشی جیهان خەتمە لەسەر ماچی دەمت**
**هەر سولەیمانە ئەوی دەستی بگا بەو خاتەمە(٦)**
**ساعیدی ئیمدادی پەنجەی دا بە فەتحی دڵ کوتی:**
**سەف شکێنی قۆڵی گورجستانە، فەوجی پێنجەمە(٧)**
**زولف و خاڵی تۆ کەوا شاد بوون بە تۆ عەیبی نییە**
**ئەمڕۆ هەرچی ڕووڕەشە باڵانشین و مەحرەمە(٨)**
**من دڵم بۆ ماچێکی چاوی بە زولفی دا کوتی:**
**ئەی پشیمانم! «وەفایی»! مەستە سەودای بەرهەمە(٩)**

---

(٦) عوشرەت: عەیش و ڕابواردن.
واتە: ڕابواردن و شادی دوو دونیا لە ماچی دەمی تۆدا دەبڕێتەوە بەڵام وەك نقێمی ئەنگوستیلەی سولەیمان وایە مەگەر پیاوی وەك سولەیمان دەنا کەس ناتوانێ بەو عوشرەتە بگا.
ئیهام و تەلمیح و موراعاتی نەزیری تێدایە.
(٧) ساعید: ئانیشك. پەنجە: لەپی دەست. ئیمداد: کۆمەك. سەف شکێنی قۆڵ گورجستان: دیارە لەو عەسرەدا شەڕی ئێران و ڕووس بووە لەسەر گورجستان، واتە کەسێ ئەو لەشکرە نەشکێنێ ئیستیعارە لە قۆڵ و ساعیدی یارە. فەوج: لەشکر.
واتە: ئانیشکی یار کۆمەکی دەستی کرد تا دڵم تاڵان کەن، دەتگوت لەشکری پەنجەی ئەرتەشی ئێرانە گورجستان دەشکێنێ.
(٨) واتە: زولف و خاڵت کە ڕەشن و لەو سەرە شادن بە تۆ، قەیدی ناکا، لەم زەمانەدا هەر کەس تاوانبارە حاکم و باڵانشینە.
ئەسلووب و موعادەلە و تەنزی سیاسی تێدایە.
(٩) سەودای بەرهەم: تێکچوونی موعامەلە.
واتە: من دڵم دایە زولفی بە تاقە ماچێکی لە چاوی، کەچی گوتی وەفایی پەشیمانم لەو موعامەلە چاوم مەستە و موعامەلەش لەگەڵ مەست دەبێ تێك بچێ.
سیفەتی تەشخیسی تێدایە.

[ ٨٤ ][١]

تــا خــەندەیی گــوڵ کـاشیفی ئـەسراری نـیهانە
زارت لە تەبەسسوم نـەکـەوێ قـەت لە زەمـانە![٢]
زولفت چـییە وا تـا بـەری پـێ حـەلقە بـە حـەلقە
یـا نـە شـەوی هـیجرانـە کـە زیـندانـی دڵانـە؟[٣]
تـۆی پـێدەکــەنی زەوقـی دڵانــی بـە هـەناسە؟
یـا عـەترە دەبـارێ؟ ئـەسەری بـاغی گـوڵانـە[٤]
قـوللابی مـوژەت گـرتمی ڕووی کـردمە ئـەبرۆت
یـەعنی کــە ئــەوە قـیبلەنومای ئـەهلی دڵانـە[٥]

---

[ ٨٤ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعل مفاعل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: نیهانە، لە زەمانە، دڵانە، و...

(٢) کاشیف: کەسێ شتێ بدۆزێتەوە بۆ یەکەمجار، ڕۆشنگەر. ئەسراری پەنهان: ڕازی شاردراوە، ئیستیعارە لە دەمی چکۆلەی یارە.
واتە: هەتا پێکەنینت ڕازی بچووکی دەمت کە وەك گوڵ وایە ئاشکرا دەکا یاخودا دەمت هەر لە بزە نەکەوێ.

(٣) واتە: ئەرێ ئەوە زولفتە تا بەر پێت ئەڵقە ئەڵقە بووە و گەییوەتە عەرزێ؟ یان شەوی دووریی و زیندانی دڵانە؟
تەشبیهی موزمەر و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

(٤) واتە: کاتێ تۆ پێدەکەنی هەناسەت خۆشە بۆ دڵان، دەڵەی عەتر دەبارێ و تەئسیری باغی گوڵانە.

(٥) قوللابی موژە: مژۆڵی وەك قولاب، ئیزافەی تەشبیهییە. ئەهلی دڵ: عاشق، سۆفی و عارف.
واتە: مژۆڵت وەك قولاب گرتمی و ڕووی کردمە تاقی برۆت و گوتی ئەو برۆیە قیبلە پیشاندەری عاشقانە. (تەشبیهی تێدایە برۆ بە قیبلە).

**تۆ ڕۆژی درەخشان و ئـەمن شـەو وەکـوو زولفت**
**سەرگەشتە لە دووی تۆ دەگەڕێم: خانە بە خـانە(٦)**
**گــریانی دڵانــە لەســەر ئــەو زولفــە بـە ڕوودا**
**یــا نــاڵەیـی مـورغانی شـەبئاوێزی بـەیانە؟(٧)**
**بــاعیس بــە جـودایـی لە بـەهاری گـوڵی ڕووتـە**
**بێ ڕەنگیی ڕەنگم کە وەکـوو ڕەنگـی خـەزانـە(٨)**
**هـێشــتا دڵی مــن نــادەیەوە هــەر لە جـەفادای**
**بۆ تیری هـەموو دەرد و غـەمت بـوومە نـیشانە(٩)**
**بولبول لە زبان کەوت و بووە خوێن پەڕیگوڵ، گوڵ**
**جـارێکـی نـەپرسی: کـە چ فـریاد و فـوغانە؟(١٠)**

---

(٦) خانە بە خانە: ماڵ بە ماڵ. سەرگەشتە: حەیران و ئاوارە.
واتە: تۆ دەڵەی ڕۆژی ڕووناکی و من وەکوو شەوی زولفت بە سەرگەردانی ماڵ بە ماڵ بە دووی تۆدا دەگەڕێم.
(٧) مورغی شەباوێز: مەلی شەو، تاقتاقەکەرە.
واتە: ئەرێ ئەوە دڵانی ئەسیرن دەناڵێنن لە شەوگاری ڕەشی زولفتدا یان دەنگی مەلی شەوگارە لە بەیانی ڕوخسارت و شەوی زولفتدا دەخوێنێ؟
تەشخیس و تەشبیھ و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.
(٨) ئەگەر دەبینی ڕەنگم بێڕەنگە وەك پاییز وایە، لەبەر ڕووی بەهاری ڕوخساری تۆیە.
تیکراری تەشبیھ و حوسنی تەعلیل و مورعاتی نەزیری تێدایە.
(٩) واتە: من بوومەتە نیشانەی تیری غەمی تۆ و تۆش هێندە جەفاکاری دڵی من کە لای تۆیە نامدەیەوە.
(١٠) بولبول: نەمادی عاشقە. گوڵ: نەمادی مەعشووقە. لە زمانکەوت: هێندە گریا ساکت بوو و زمانی شکا.
واتە: بولبول هێندە گریا و پەڕەی گوڵ لەبەر خوێنی چاوی ئەو سوور بوو، کەچی گوڵ جارێکی لێ نەپرسی ئەو شیوەن و گریانەت لە چییە؟ (تەشخیسی تێدایە).

**حەیرانی بـرۆ و خـاڵی لە ڕووی تـۆیـە «وەفـایی»**
**بۆچی حـەرەم ئـاتەشکەدەیی پـیری مـوغانە؟**(١١)

**[ ٨٥ ]**(١)

**ئەلا ئەی ساقیی مەستان! بـە حـەققی پـیری مـەیخانە**
**بە گەردش بێنە جامی مەی بە یادی چـاوی جـانانە**(٢)
**ئەمان ئەی موتریبی مەجلیس بە حەققی تاری ڕۆحانی**
**بڵا بێ نەغمەکەی سازت کە ئاوی ئاوری هیجرانـە**(٣)
**ئەتۆ ئەی ڕۆحەکەم ساقی، ئەتۆ ئەی عومرەکەم موتریب**
**پەیاپەی لێدە چەنگ و نەی، دەمادەم بـێنـە پـەیمانە**(٤)

---

(١١) حەرەم: ماڵی خودا. ئاتەشکەدە: مزگەوتی زەرتوشتییان. پیری موغان: گەورەی مەسیحیان.
واتە: وەفایی شەیدای برۆ و خاڵی ڕوخساری تۆیە، مەگەر حەرەم بۆتە ئاتەشکەدەی مەلای زەرتوشتییان.
برۆ: حەرەم. ڕوخسار: ئاتەشکەدە.

**[ ٨٥ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: مەیخانە، جانانە، و هیجرانە، و...
(٢) ئەلا: وشەی بانگکرن و سەرنج ڕاکێشانە.
واتە: ئەی ساقیی مەستەکان تۆبی و پیری مەیخانە جامەکەت بخەگەڕ و جامێك بە یادی چاوی یار بدە بە من.
غەزەلی یەکەمی دیوانی حافیزی شیرازی وەبیر دێنێتەوە کە دەڵێ: «ألا یا أیّها الساقي أدر کأساً و ناوِلها....».
(٣) واتە: ئەی ساز لێدەری مەجلیس تۆ بی و ئەو تارە ڕۆحییەت هەوایەك لێدە کە ئەو ئاهەنگەی تۆ وەك ئاو ئاگری دووری یار دەکوژێنێتەوە.
(٤) واتە: ئەی ساقی ئەی ڕۆحی من و ئەی سازلێدەری عومری من، تۆ لێدە ساز و تۆش بێنە ☜

بە تیری غەمزە بملاوێنەوە زولفم لە گەردەن کە
بەسەر هاتوومە مەیدانت، بە دڵ بۆت بوومە نیشانە[٥]
ئەگەر شەوقی جەماڵی تۆ نەبێ من مەست و حەیرانم
لەبەرچی بۆتە بولبول گوڵ، چرا بۆچ بۆتە پەروانە[٦]
لە شەوقی تۆیە سەرمەستە، بە زەوقی تۆیە پا بەستە
ئەگەر عاریف لە کەعبەیدا، ئەگەر کافر لە بوتخانە[٧]
لە شیرینی جەماڵی تۆیە ڕۆژی ڕوونی لەیلایە
ئەگەر فەرهادی سەرگەردان، ئەگەر مەجنوونی دێوانە[٨]
دەمێکی مەست و بیمارم، دەمێك بێهۆش و هۆشیارم
چ کەس نازانی دەردی من، مەگەر ئەو چاوە کاڵانە[٩]

---

☞

جامی شەراب.

لەف و نەشری موشەووەشی تێدایە.

(٥) واتە: ئەی یار بملاوێنەوە و زولفت بخە ئەستۆم، من سەر و دڵم پێشکەش بە تۆیە هاتوومە مەیدانت چم لێ دەکەی بیکە.

(٦) واتە: ئەگەر شەوقی جوانی تۆ نەبێ من مەست و سەرگەردانم، گوڵ لەبەر جوانی تۆ بۆتە بولبول و پێتدا هەڵدەڵێ، چرا لەبەر جوانی تۆ بۆتە پەروانە و بە دەورتدا هەڵدەسووڕێ.

(٧) واتە: ئەگەر عارف لە کەعبەدا و ئەگەر کافرَ لە بوتخانەدا مەستن هەموو لەبەر زەوق و شەوقی تۆیە.

دیارە ئەم بەیتە عیرفانییە و مەعشووق ئاسمانییە.

(٨) واتە: ڕۆژی ڕووناکی لەیلی لە شیرینی جوانی تۆیە، فەرهاد و مەجنوونیش هەر شێتی تۆن.

موراعاتی نەزیری تێدایە. مەولانا دەفەرموێ:

عاشقی گر زین سر و زان سر است　　　عاقبت مارا بدان سر رهبر است.

واتە: عەشقی مەجازی پایەی عەشقی حەقیقییە.

(٩) واتە: مەگەر چاوی کاڵی یار نەبێ دەناکەس نازانێ من بۆچ جاری وایە نەخۆشم و جاری وایە سەرمەستم.

دە هەر حەلقێکیدا سەد دڵ گرفتارە دەناڵێنێ
سەری زولفی پەرێشانت مەگەر زنجیری شاهانە[١٠]
هەناسەی عاشقان بانەدگرێ بێمروەتی تاکەی؟
بترسێ ئەی گوڵی نازکبەدەن لەو بایی زریانە[١١]
ئەگەر زولفت وەکوو من عاشقی ڕووی تۆ نییە بۆچی:
سەراپا تێكچووە کەوتۆتە بەرپێت دەست و دامانە؟[١٢]
ترازا دوگمەکەی سینەی، بە یاریی زولفی هات غەمزە
بەیان بەربوو لەلای چین، باخەبەربن تیرە بارانە[١٣]
«وەفایی» بۆ گوڵێکی سەرو باڵا شێت و شەیدایە
وەکوو قومری دەناڵێنێ وەکوو بولبول غەزەلخوانە[١٤]

---

(١٠) واتە: ئەرێ سەری زولفت زنجیری پادشاهانە وا لە هەر حەڵقەیدا ئەسیرێ هەیە؟.
جگە لە تەشبیهی مورەککەب تەنزێکی سیاسیشی تێدایە واتە شاهان زاڵمن.
(١١) بادی زریان: ئیستیعارە لە هەناسەی عاشقانە.
واتە: با هەناسەی عاشقان تۆکە بەدەنت وەك گوڵ وایە نەگرێ چونکا وەك زریان گوڵ وشك دەکا تۆش ئاوا هەڵدەپڕووکێی.
(١٢) کەوتنە بەر پێ و دەست و دامان: کینایە لە زەلیلییە، کەجی بۆ زولف کینایە لە درێژییە.
واتە: ئەگەر زولفت وەك من عاشقی ڕووت نییە بۆ لەبەر پێی دامانتا زەلیل کەوتووە یانی درێژە.
(١٣) واتە: دوگمەی سینەی ترازا غەمزەی بەربووە تیرهاویشتن لە لای چینی زولفی، سینەی وەك بەیان ڕووناکی دا و گوتی ئاگاداربن بە غەمزە یار خەریکی تیرەبارانە.
ئیستیعارە و کینایە و ئیهامی تێدایە.
(١٤) واتە: وەفایی بۆ گوڵێ دەناڵێ کە باڵای وەك سەوڵە، وەك بولبوڵ بۆ گوڵ و وەك قومری بۆ سەوڵ دەخوێنێ.
لەف و نەشری مورەتتەب هەیە لە نێوان گوڵ و بولبول و قومری و سەرودا.

[ ۸۶ ](۱)

دڵی پــڕ ئــێشــی مــن بــۆیــە وەهــا خــوونابی گــریانە
هەموو سینەم وەکوو نیشانە جێگا نــێشــی مــوژگانە(۲)
بە زاری پێمکوت: ئاخر بوردەباری تابەکەی؟ فەرمووی:
دەسا بیکوژن، ئــەی یــاران، کــە ڕۆژی بــەردەبارانــە(۳)
بەڵاگەردانی تۆم، ئەی مــن بــنازم خــاڵی ڕوخســارت
خەلیلی ئاتەشی نەمروودە، خەتتی سەبزی ڕێحــانە(٤)
کە تۆ سوڵتانی حوسنی بۆ لە حەزرەت ئەبرووت ڕێت دا
لەبەر چاوت کە هیندوو ماڵی کەعبەی کردە مەیخانە(۵)

---

[ ۸۶ ]

(۲) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیف: «ە» واژەی قافیە: گریان، موژگان، باران، و...
(۲) خووناب: خوێناو. جێگا: جێ.
واتە: دڵم بۆیە ڕێش و خوێناوییە چون سینەم نیشانە و جێی پێوەدانی مژۆڵی یارە.
(۳) بوردەباری: سەبر. بەردەباران: سەنگسار کردن، جیناسی ناقیسی تێدایە.
واتە: بە گریانەوە گوتم تاکەی سەبرکەم؟ گوتی: وەرن بیکوژن ڕۆژی سەنگسارییەتی.
(٤) بەڵاگەردان: قەزاوەگێڕ. بنازم: ئافەرین بۆ. نەمروود: پادشای زاڵمــی دەورەی حــەزرەتی ئیبراهیم. ڕەیحان: چەشنێ خەتی نووسین و گیایەکی بۆنخۆشیشە. خێڵ: تایەفە.
واتە: قەزای خاڵت لە من کەوێ دەڵەی تایەفەی ئاگری نەمروودە کە ئیبراهیمی تێ خــرا، یــا وەکوو ڕێحانە بۆنخۆشە یان خەتێکی خۆشە.
ئیهام، تەلمیح و تەشبیهی تێدایە.
(۵) حەزرەت: بەردەرکەی ماڵە شاهان. هیندوو: ئیستیعارە لە خاڵی یــار یــان ڕەشــی بــرۆی چاوی یار. مەیخانە: ئیستیعارە لە چاوی یارە.
واتە: ئەگەر تۆ پادشای جوانیت بۆ هێشتت لەبەر دەرکەتدا کافری ڕەشی خاڵ لە ژێر کەعبەی برۆدا چاوت بکاتە مەیخانە.
سەراپا ئیستیعارە و تەشبیهی جوانە و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

تەبیبی میهرەبان بێهوودە تاکەی دڵنەوازی من؟
وەکوو بۆ خۆم دەزانم هەستە ـ بیللا ـ ڕۆژی گریانە[٦]
دەڵێ حاڵت لە سەیلی دیدە، سۆزی دڵ چییە؟ قوربان
لە دووری تۆ بڵێم چی؟ حاڵی من خنکان و سووتانە[٧]
ئەمن لەو شارە کوژراوی خەدەنگی نازەنینێکم
فەرەنگی تینەتە، کافر دڵە، زاهیر موسوڵمانە[٨]
بە هیچ وەجهێکی ناوێرم کە نێزیکت ببم، قوربان
بە عەینی هەر لە من ڕوویداوە حاڵی شەمع و پەروانە[٩]
دەخیل ئەی مەحرەمی دەردی «وەفایی»! خزمە تەدبیرێ
ئەوا مەحبووبە چارەی نایێ خۆ کوژرانم ئاسانە[١٠]

---

(٦) واتە: ئەی تەبیب لە خۆڕا دەرمانم مەکە هەستە بڕۆ خۆم دەمرم و دەبێ کەس و کارم بۆم بگرین.
ئەم بەیتەدا شەش ڕستەی بەکار بردووە کە ئەمە هونەری گەورەی غەزەلسەراییە.
(٧) واتە: یار دەڵێ حاڵت لە نێو سێڵاوی چاو و سووتانی دڵتدا چۆنە؟ چت عەرز بکەم هەر خەریکی خنکان و سووتانم!
لەنێوان سێڵاو و خنکان، سۆز و سووتاندا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە.
(٨) واتە: من لەم شارەدا عاشقی یارێکم دەروونی وەك فەرەنگی وایە دڵی وەك دڵی کافر ڕەقە بە ڕواڵەتیش موسوڵمانە.
لە نێوان فەرەنگ و کافر و موسوڵماندا موراعاتی نەزیر و تەزاد هەیە.
(٩) واتە: بۆیە ناوێرم نزیکت کەومەوە دەڵەی تۆ شەمی و منیش پەپوولە دەمسووتێنی.
حوسنی تەعلیل و تەشبیهی تێدایە.
(١٠) واتە: ئەی خزمان و کەسانی وەفایی تەگبیرێکم بکەن یار عیلاجی نایە دەناکوژرانی من ئاسانە، کارێ بکەن ئەوم بۆ ڕام کەن یا من بکوژن.

## [ ٨٧ ][١]

حــەریقی ئــاوری دووریــم، داغــداری زولفـی جـانانە
ئــەگــەر بـایێ لە لای قـیبلەم نـەیێ حـاڵم پـەرێشـانە[٢]
نــەسیمی ســوبحدەم قـوربانی نـەشئەی تـۆزی ڕێگـاتم
غــەریبم، بـیٚ کـەسم، ڕۆح و دڵم سـووتاوی هـیجرانـە[٣]
ئــەمن وا لێرەکــە و ڕۆحــم لە خـاکـی پـاکـی بـەتحادا
حــەیاتم بـێنــەوە ڕابـبرە بــەو بــاغ و گــوڵسـتانە[٤]
ئەگەر دەریایی ئاور بێ، ئـەگـەر تـۆفـانی خـوێن هـەستێ
بــە ســۆز و گــریەیی زارم، بــڵێ بــەو مــاهە تــابانە[٥]
بە غەمزەی چاوەکەی مەستت هەموو جێی نەشتەرە جەرگم
بە مـوژگانی سـیات قـەلبم سـەراسـەر جـێگـە پـەیکانە[٦]

---

**[ ٨٧ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیف: «ە». واژەی قافیە: جانان، پەرێشان، هیجران، و...

(٢) حەریق: سووتاو.
واتە: سووتاوی ئاوری دووریم و داخکراوی زولفی یارم، بایێ لە لای قیبلەوە نەیێ لەبەر گەرما دەسووتێم و حاڵم خراپە. دەکرێ بۆ قیبلە ئیشارە بێ بە حەزرەتی شێخ عوبەیدیللاکە لە تائیف تەبعید بووە.

(٣) واتە: ئەی نەسیمی بەیانی بە قوربانی تۆزی ڕێگات بم غەریبم و ڕۆح و دڵم لە دووریدا سووتاوە.

(٤) واتە: من خۆم لێرە ڕۆحـم (مـەبەست شێخ عـوبەیدیللایە) لە خـاکـی پـاکـی «بـەتحا» (حیجاز)دایە، جارێ لەو باخ و گوڵستانەدا ڕابرە ڕۆحەکەم بێنەوە بەرم یانی زیندووم کەوە.
تەلمیح، ئیستیعارە، کینایە و ئیهامی تێدایە.

(٥) مەعنای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی پاشەوەیدا دێ.

(٦) واتە: هەرچی بێ ئەگەر خوێنێ هەستێ یان دونیا بڕووخێ بەو شێخە بڵێ کە وەك مانگی ☜

بە تـاری زولف و گـوڵنـاری جـەماڵی تـۆ بـە ڕۆژ و شـەو
سەرم دەربـەندی سـەودایـە، دڵم سـەرگەرمی سـووتانە(٧)
دڵم سـەوداسـەرە و جـانم «پـر از» غـەوغایە نـازانـم
نـەداغـی تـاری زولفـانە، نـە دەردی وردە خـاڵانـە؟(٨)
نە خاڵت ڕوحمی پێمدا دێ، نە حەڵقـەی دایـرەی زولفت
عـەجەب مـاوم! دەڵێی دەوری فـەڕەنگـی کـافرستانە(٩)
بە شەوقی ڕووت لە حەلقەی زولفەکەت دێ ئاه و ناڵەی دڵ
لە سوبحی کازیبەی شەودا چریکەی مورغی خۆشخانە(١٠)
شەهیدی تیغی ئەبرۆتـم بـە جـەزبەی خـاڵەکـەی چـاوت
مـەقامم قـابەقەوسەینە لە سـایەی پـیری مـەیخانە(١١)

---

☞

ڕووناك وایە، بڵێ بە غەمزەی چاوی مەستی جەرگم هەمووی جێگەی نەشتەرە و بە مژۆڵی ڕەشی قەلبم پڕ لە تیرە.

(٧) واتە: شەو و ڕۆژ سەر و دڵم گرفتاری دووری و بەندی تۆیە.

(٨) «پر از» پوڕ ئەز: فارسییە واتە پڕ لە.

واتە: دڵ شێتە، گیان لە هەردانە، نازانم خەتای تاری زولفتە یان خەتای وردە خاڵەکانە.

لە ئەدەبی عیرفاندا زولف گیروگرفتی ڕێگای گەیشتنە بە یار. خاڵ: هەڵە و لاری لەگەڵ مەعشووق.

(٩) واتە: نە خاڵی ڕوخسارت بەزەیی پێمدا دێ نە ئەڵقەی زولفت هەردەڵەی دەوری کافر و سەرزەمینی کوفرە.

ئیهام، ئیستیعارە و حوسنی تەعلیلی تێدایە.

(١٠) سوبحی کازیبە: بەیانییە درۆزنە، سوبحی زووکە هێشتا ڕۆژ نەبووەتەوە.

واتە: دڵم لەبەر شەوقی ڕووت لە ناو ئەڵقەی زولفتدا دەخوێنێ دەڵەی بولبولی دەنگخۆشە لە ئاخری شەودا بۆ هاتنی کازیوە دەخوێنێ.

ئیستیعارە و تەشبیهی تێدایە.

(١١) قابە قەوسەین: بە قەد نێوان دوو برۆ.

☜

**هـەموو عـالەم بـە دیـدارێکـی تـۆ قـوربانی ئـەبرۆتـن**
**مەگەر تاقی برۆت، قـوربان، هـیلالی عـیدی قـوربانە؟(١٢)**
**عیبادەتخانە بەرهەم بوو بـە نـەشئەی قـیبلەکـەی ئـەبرۆت**
**لە سایەی چاوەکانت مـاڵی کـەعبەش بـۆتـە مـەیخانە(١٣)**
**بە ئاه و گریە بۆ سەیری جەماڵی چـووم و پـێی فـەرمووم:**
**تەماشای باغ و گوڵشـەن بـۆ چـییە بـەو بـا و بـارانـە؟!(١٤)**
**خەتی هات زولفەکەی لەرزی لەسـەر خـاڵی سـیا، گـۆیـا!**
**حەبەش بۆ چین لە تێلی دا کە ڕۆم و هـیندە شـەڕیـانە(١٥)**

---

☞

واتە: ئەگەر من شەهیدی برۆت بم و خاڵی چاوت بمکوژێ مەقامم لە نێوان دوو برۆدایە و لە کن خودام. یان: خاڵی چاوت کێشامی و تیغی برۆت بە ناحەق کوشتمی، لە سایەی پیری ڕێبەرمەوە گەیشتم بە موورادی خۆم و لە زومرەی نزیکانی بارەگام. یان: چونکە لە پێناوی خاڵی چاوتدا بە تیغی ئەبرۆت شەهید کراوم، جێگام نێوان دوو ئەبرۆتە.

تەلمیح و ئیهامی تێدایە.

(١٢) واتە: ئەرێ تاقی برۆی تۆ هیلالی جەژنی قوربانە کە هەر دەردەکەوێ عالەمێ خۆی بە قوربان دەکەن.

(١٣) بەرهەم بوو: تێکچوو.

واتە: عیبادەتخانە و خانەقا لەبەر مەستی چاوت تێکچوو لە سایەی چاوی تۆ کەعبەش هەر مەیخانەیە، واتە «تائیف»یش بۆتە خانەقای تۆ.

(١٤) واتە: بە گریانەوە چووم سەیری ڕوخساری بکەم فەرمووی بەم باو بارانە کوا سەیری گوڵشەن خۆشە.

باد و باران: ئیستیعارە لە گریانی خۆی و ئاڵۆزی و پەشێوی دەورانی شکستی شێخ عوبەیدیللایە.

(١٥) خەت: تەلگراف، ئیستیعارە لە ڕوخساری یارە. چین: ئیستیعارە لە زولفی یارە. لە تێلی دا: تەلگرافی کرد. حەبەش: ئیستیعارەیە لە خاڵی یار. ڕۆم: ئیستیعارە لە ڕوخساری یارە. هیند: ئیستیعارەیە لە خاڵ و زولفی یار.

واتە: ڕوخساری یار خەتی دا زولفی لە ترسان لەرزی بە خـاڵی گـوت: تـەلگراف بکـە بـڵێ دەوڵەتی ڕۆم و هیند بەشەڕ هاتن واتە زولف و ڕووی یار.

**بە نـاز ڕووی کـردە مـیحرابـی بـرۆ مـوژگانی دەیـفەرموو:**
**کە تۆ لوتفت هەبێ ،قوربان، خەرابـاتیش مـوسوڵمـانە**[١٦]
**«وەفـایی» دەردی بـێدەرمـانە بـەو چـاوانـە نـازانـم**
**هیلاکی تۆیـە؟ یـا نـە خـەستەجانی دەسـتی پـەریانە؟**[١٧]

**[ ٨٨ ]**[١]

**خەرامـان بـەو سـەری زولفـی پـەرێشـان چـیهرە بـنوێنـە**
**لە گوڵ ڕەنگ و لە سونبول بۆ، لە سەروان جیلوە بستێنـە**[٢]
**شـــەهیدی تـاقی ئـەبرۆی تـۆ بـە جـەننەت شـادە، ئـازادە**
**ئـەتۆ قـیبلەی مـورادانـی دەمـێکـی ڕووت وەهـا بـێنـە**[٣]

---

(١٦) واتە: موژگانی یار بە ناز ڕووی کردە میحرابی برۆی یار و گوتی قوربان کە تـۆ لوتـفت هەبێ مەستی خەراباتی وەك منیش کە دایمە مەستی چاوی یارم هەر موسوڵمانم.
(١٧) واتە: وەفایی دوچاری دەردێکی بێدەرمـان بـووە بـە دەست چـاوتەوە، نـازانـم؛ یـان کوژراوی تۆیە یان شێتی دەستی پەری و شتی وایە!.

**[ ٨٨ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: بنوێنە، بستێنە، بێنە، و...
(٢) خەرامان: بە ناز ڕۆیشتن. چیهرە بنوێنە: خۆت پیشان دە.
واتە: بە ناز بە زولفی پەرێشانەوە خۆت پیشان دە تا گوڵ ڕەنگ و سونبوڵ بۆن و داری سەوڵ لار و لەنجەیان نەمێنێ.
تەشبیهی تەفزیلی تێدایە.
(٣) واتە: کەسێ شەهیدی تاقی برۆی تۆ بێ بەهەشتییە، تۆ قیبلەی ئاواتی لەحزەیەك ڕووت وابێنە تا تەوافت کەم.
حوسنی تەڵەبی تێدایە.

زەکـــاتی خـــاڵی لێوت بـــووسەیێ لەو چـــاوە کـــافیمە
ئەتۆبـی و سـاقیی کـەوسەر دڵم بـەو جـامە مـەشکێنـە![٤]
بە زولف و ڕووی گـوشاد جـارێك بـپرسە حـاڵی شـێواوم
دەمێك شەککەر بدە، سـونبول بـە بـادە، گـوڵ ببـارێنـە[٥]
دڵم هـــێنـــاوە بـــۆ لێوت بـــڵا زولفت ڕەزای لێ بـــێ
وەکوو قەننادی خۆش سەودا بە، زوو زوو بیدە بستێنـە[٦]
زەدەی چاوم، لە لێوی خۆت شیفام دە، بەس بە ڕقـدا چـۆ
بە قەترێك ئابی حەیوانت نەخۆشی خۆت مـەسووتێنـە[٧]
ئـەگـەر سـەد ڕۆح و دڵ بـێنـم مـورادی مـن ڕەوا نـابێ
لەبـی لەعـلی بـە مـن نـادا دەزانـێ ڕۆح چ شـیرینە[٨]

---

(٤) ساقی کەوسەر: مەبەست پێغەمبەرە. بووسە: ماچ.
واتە بۆ زەکاتی خاڵی لێوت ماچێ لە چاوت بەسمە و بیکە بە خاتری پێغەمبەر دڵم مەشکێنە و بمدەرێ.
(٥) ڕووی گوشاد: خۆشحاڵ.
واتە: بە زولفی ئاوەڵا و ڕووی خۆش جارێ حاڵم بپرسە تاوێك بە قسانت شەکەر بدە و بە زولفت سونبوڵ بە با دە و بە ڕوخسارت دنیا گوڵباران بکە.
(٦) قەنناد: شیرینی فرۆش ئیستیعارە لە لێوی یارە.
واتە: ئەگەر زولفت ڕازی بێ دڵم هێنا بیدەم بە لێوت، ئەتۆش وابزانە شیرینی فرۆشێکی خۆش موعامەلەی، زووزوو دڵم بستێنە و لێوت بدە.
بدە بستان: موعامەلە، جا ئەورۆ بە غەڵەت لە مێدیاکاندا بە گفتوگۆ دەڵێن، «دانوستان» کە هەڵەیە دانوستان = داد و ستد یا بدە بستانە واتە موعاملە و گۆڕینەوەی کاڵا.
(٧) زەدەی چاو: بە چاوە بوون. بە ڕقدا چوون: کینەیی بوون. ئابی حەیوان: ئیستیعارە لە لێوی یارە.
واتە: من بە چاوەوە بووم و چاوی تۆ ئەنگاوتوومی بە ماچی لێوت عیلاجم کە و کینەیی مەبە بۆ قەترەیێ ئاوی ژین نەخۆشەکەت مەسووتێنە.
(٨) واتە: ئەگەر ڕۆح و دڵیشم بدەم بە لێوی نامداتێ چونکا لێوی ئەو ڕۆحی ڕەوانە و

**لە ئـــەنفاسی ســەحەرگاهی بـترسێ، ئـەی چـرا، جـارێك**
**هـەناسەی عـاشقان تـیرە، مـەڵێ پـەروانـە بـێ‌خـوێنـە[(٩)]**
**دەلیلی چـاك و پـاکـی پـێ دەوێ وەسـڵی ڕوخ و زولفـی**
**خودا شادی بە شانەی دا و سەفای جەننەت بە ئـاوێنـە[(١٠)]**
**لەسەر میـحرابی ئەبرۆی کەوتمە زولفـی دامـیە بـەر غـەمزە**
**بە جەللادی دەکوت: مورتەددا! حەڵاڵە خوێنی بـڕژێنـە[(١١)]**
**سەری دانا لەسەر ڕووی تۆ، بە شوێنی زولفـی تـۆدا چـوو**
**«وەفایی» ئاخری خێر بێ، دەمێکە بـێ‌سـەر و شـوێنـە[(١٢)]**

☞

ڕۆحیش زۆر شیرینە.
قافیەکەی غەڵەتە دەبێ بۆ ڕاستی «شیرێنە» بخوێنرێتەوە.
(٩) ئەنفاسی سەحەرگاهی: دوعای بەیانانی مەزلوومان. چرا: ئیستیعارە لە یارە.
واتە: ئەی یار لە دوعای بـەیانان بـترسێ دوعـا وەك تـیر وایـە مـەڵێ پـەپوولە خـوێنـی نـییە دەتـپێکی.
تەلمیحە بە حەدیسی: «الدعاء أفصح من السنان» دوعا تـیژترە لە تـیر. ئـیهام لە بـێ‌خـوێنـی پەروانەدا هەیە.
(١٠) دەلیل: ڕاهنوما، ڕێپیشاندەر.
واتە: وەسڵی یار ڕاهنومای چاك و پاکی دەوێ ئیدی ئەوە شانسی خۆیانە شانە و ئاوێنە بـە خۆشحاڵی و بە سافی بەو مەرتەبەیە گەیشتوون. چاك بۆ شانە و پاك بۆ ئاوێنە.
ئیهام، موراعاتی نەزیر، لەف و نەشر و تەشخیسی تێدایە.
(١١) واتە: لەسەر برۆی یارکە وەك میحرابە کەوتمە گێژی زولفی، بە غەمزەی دەیگوت ئەوە لەسەر دین لاچووە ئەی جەللادی غەمزە سەری ببڕە.
(١٢) واتە: وەفایی بە شوێنی تۆدا سەری دانا ئاخری خێر بێ وەفایی بەینێکە بێ‌سەر و شوێنە.
تیکرار لە بێ‌سەر و شوێندا هەیە. بێ‌سەر و شوێن کینایەیە لە ون بوون.

**[ ۸۹ ]**[1]

**ئەی حوسنی ئـەزەل، دا نـەفەسێ خـۆت بـنوێنـە**
**ئـــاوێنـەیی ڕووی خـۆتـە دڵی مـن مـەشکێنـە**[2]
**کەوتوومە شکەنجی سەری زولفت بە تەمای ڕووت**
**یاریم کە نەکەی چووم بە تەلیسماتی خـەزێنـە**[3]
**عالەم هەموو ڕەنگـینە لەبـەر عـەکسـی جـەماڵت**
**هەر ڕەنگە بە ڕەنگـێکـی هـەزار ڕەنگـە نـوێنـە**[4]
**چـونکە سـەبەبی دەوڵەتـی خـەندەی گـوڵە بـاران**
**ئەی دیدە! هـەتا هـەی بگـری، خـوێن بـڕژێنـە**[5]
**چـــــونکە شـــەرەفی قـــوربی بـــەقا وا لە فـــەنادا**
**ئەی دڵ وەرە تا زیندووە بـی، خـۆت بـمرێنـە**[6]

---

**[ ۸۹ ]**

(۱) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نیە. واژەی قافیە: بنوێنە، مەشکێنە، خەزێنە، و...

(۲) حوسنی ئەزەل: جوانی خودا پێداو، هەر جوان خولقاو. نەفەسێ: تاوێ.
واتە: ئەی جوانی لە ئەوەڵەوە هەر جوان! دادەی بۆ ساتێ خۆت پیشان دە دڵی من ئاوێنـەی ڕوخساری تۆیە مەیشکێنە.

(۳) تەلیسم: لەمپەڕ و بەندێ کە لە ڕێی خەزێنەدا دروستی دەکەن، ئیستیعارە لە زولفی یارە.
واتە: من بە تەمای خەزێنەی ڕووت کەوتمە چاڵی تەلیسمی زولفت، کۆمەکم نەکەی تێدا چووم و نامێنم. شکەنج: چین چین و چەن توێ.

(٤) واتە: دونیا لەبەر عەکسی جەماڵی تۆ هەرکام بە ڕەنگێکە دونیا ئەوەندە ڕەنگینە هەرکام ڕەنگێ دەدەن.
دەکرێ ئەم غەزەلە عیرفانی بێ و وشەکان مانای مەجازییان هەبێ و مەعشووق خودابێ.

(٥) واتە: چونکا باران دەبێتە هۆی پێکەنینی گوڵ، ئەی چاو هەر بگری تا گوڵ پێ‌بکەنێ.
حوسنی تەعلیلی تێدایە.

(٦) شەرەفی قورب: ئیفتیخاری نزیك بوونەوە. بەقا: مانەوە، دژی فەنا.

**ســـووتاوە دەروونــم، وەرە ئـەی بـادی بـەهاری**

**زیندووم کەوە بێنێکی لە غونچەی دەمـی بـێنـە(٧)**

**ڕابـــــبرە بـــــە دامـــــان و خـــەیابانی یـــەخەیدا**

**نەختێ لە گوڵ و سونبول و نـەسرین بـوەشێنـە(٨)**

**مـــــومکین نـــییە لەو چـــاوە نـــەجاتی دڵی زارم**

**ئــەو مــورغە بــریندارە گــرفتاری شـــەهێنـە(٩)**

**عەینی کەرەم و مەرحــەمەتە هـەرچـی بـفەرمووی**

**لوتــفت نـــییە جـــارێ بـە جـوێنـم بـدوێنـە(١٠)**

**دەمکوت: کە خەتت بێ دڵی خۆم نـادەمە چـاوت**

**نەمزانی کە مەی فەسڵی بـەهار تـۆبـە شکـێنـە(١١)**

---

☞

واتە: چۆن تا فەنا نەبی بە نزیکی خودا ناگەی و باقی نامێنی کەواتە ئەی دڵ خۆت بمرێنە تا بە مەقامی «لقاءاللّه» بگەی.

(٧) واتە: ئەی بای بەهار، دەروونم سووتاوە بە بۆنێ لە غونچەی دەمی یار کە بیهێنی زیندوو دەبمەوە.

(٨) واتە: یەخەی یار وەك خەیابان وایە جارێ بەوێدا ڕابرە هێندێ بۆنی گـوڵ و سـونبوڵ و نەسرین بێنە.

مونادا و بانگ لێکراو، بادی بەهارییە.

(٩) شەهێن: پەلەوەرێکی ڕاوچییە، باز، سەقر.

واتە: چاوی یار وەك باز و شەهێن وایە دڵی من وەك پەلەوەرێکی زامدارە نـەجاتی نـابێ بـە دەستیەوە.

(١٠) واتە: تۆ هەرچی بفەرمووی ڕەحم و بەخششە، لوتفت نییە جارێ جنێوێکم بدەیە.

حافیز دەڵێ:

اگر دشنام فرمایی و گر نفرین دعا گویم      جواب تلخ می‌زیبد لب لعل شکر خارا

(١١) واتە: دەمگوت ڕوخسارت کە هەبێ عاشقی چاوت نابم نەمزانی چاوت وەك مـەیە و ڕوخسارت وەك بەهار، مەی لە بەهاردا تۆبە شکێنە.

**خۆی داوەتە زولفت لە دوو لا گۆشـەیی ئـەبرۆت**
**میزان کە دڵان هێندە دەبـا سـووچی شـەهێنـە**(١٢)
**فــەرموویە: «وەفــایی» بــە دڵی تــۆیــە ویسـالم**
**قوربان هەر ئەتۆ و دڵ؟ وەرە ڕۆحیش بستێنـە!**(١٣)

**[ ٩٠ ]**(١)

**ڕۆحم بـە فـیدات ئـەی گـوڵی گـوڵزاری مـەدینە**
**لوتفت هەبێ ڕوو وابکە مەقسوودی مـە، دیـنە**(٢)
**بەو جێگە بـوویتە شـەرەف و قـورب و مـەقامت**
**لوتـفت بـبێ بـمبەخشە وەرە جـورمێ مـەبینە**(٣)

---

(١٢) میزان: تەرازوو، ڕێك. شەهێن: هەم بە نووکی تەرازوو دەڵێن، هەم بە باڵندەیەکی ڕاوچی.
واتە: برۆت خۆی داوەتە پەنای زولفت بۆیە هێندە بە میزان دڵ دەڕفێنێ، زولفت وەك دوو عەقرەبەی ترازوو میزانە.
ئیهامی تێدایە.
(١٣) واتە: فەرموویە وەفایی ویسالم بە قیمەتی دڵی تۆیە، قوربان هەر ئـەتۆ و دڵ؟ فـەرموو سەرەڕای دڵ گیانیش وەرگرە.

**[ ٩٠ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعولُ مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: مەدینە، دینە، ببینە. ئەم غـەزەلە مـەدحی حەزرەتی موحەممەدە (د.خ).
(٢) واتە: ئەی گوڵی گوڵزاری مەدینە ڕۆحم بە فیدات بێ، لوتفت دەرحەق من ببێ مەبەستی ئێمە دینە.
جیناسی تەواو هەیە لە نێوان مەدینە و مە دینەدا، ئیهام هەیە لە دیندا هەم بە مانای دیتن و هەم بە مانای ئیمانە.
(٣) بەو جێگە: بیکە بە خاتری ئەو مەقامە، تا ئەو حەددە.

**دەرمان مەکە، هاتوومە حەکـیمی هـەموو دەردان!**
**دەرمان بکـە جـەرگم کـە هـەموو کـۆنـە بـرینە(٤)**
**عــومرێکــە دەنــاڵم بــە ئـومێدی گـوڵی زارت**
**جـارێکـی بـفەرموو کـە چ هـاوارە؟ چ شـینە؟(٥)**
**فەرزەن هەموو دونـیا مـن و عـومری خـزرم بـوو**
**بێ جەننەتی ڕووی تۆ چ حەیاتێکـە؟ چ ژیـنە؟(٦)**
**ئیحسانی گوڵ و خاکـی دەری پـاکـی لە چـاودا**
**بـۆیــێکـە فـەلەك تـا هـەیە چـاوی لە زەمـینە(٧)**
**ڕەوشەن بکە چاوم بەکلی خـاکـی دەری خـۆت**
**بەو عیززەتە فەرشی قـەدەمت عـەرشی بـەرینە(٨)**

---

واتە: بیکە بە خاتری ئەو جێگە و مەقامە کە تۆی تا ئەو حەددە لە خودا نزیك خستووەتەوە ئێمە ببەخشی و گوناهمان چاو لێ مەکە.

(٤) واتە: ئەی حەکیمی هەموو دەردان، من هاتوومە کنت دەرم مەکە بەڵکە دەرمانی جەرگم بکە کە هەمووی برینی کۆنەیە.
جیناسی تەواو هەیە لە نێوان دەرماندا. هەروەها تەزادیش هەیە لە نێوان مەکە و بکەدا. دەبێ ئەم غەزەلە لە ڕەوزەی موتەههەردا دانرابێ.

(٥) واتە: زۆر لە مێژە من هاوار و ناڵەمە بە ئومێدی لوتفی تۆ، قوربان جارێ بـفەرموو ئـەم گریان و شینە بۆچییە؟.

(٦) واتە: ئەگەر هەموو دونیا هی من بێ و بەقەد خدری زیندە تـەمەنم هـەبێ، بـێ وەسـڵی بەهەشتی ڕوخساری تۆ ژیانی وام ناوێ.

(٧) واتە: هەر بە چاوە پیاو خاکی دەرگا و جوانی بە چاکی هەست دەکا، ئەوە نییە ئاسمان بەو بڵندییە هەر چاوی لە عەرزە کە تۆی تێدایە؟
حوسنی تەعلیلی تێدایە. دەبێ وەفایی لە کاتی هۆنینەوەی ئەم غەزەلە چاوی کەمبینا بووبێ.

(٨) واتە: خاکی دەرکەت سورمەی چاوە، چاوم ڕۆشنکەوە ئەتۆ هـێنـدە گـەورەی فـەرشی

زولفت لە دوولا شـــاد و گـــوشادن بـە جـەماڵت
کوا ئەهلی شیمالی؟ هەموو ئـەسحابی یـەمینە[٩]
مەوقووفی نـیگاهێکـە بـفەرموو بـە تـەڕەحـحوم
ژەنگـــاوییە ئـــاوی نـــییە ئـــاوێنـــەیی سـینە[١٠]
پـــــابەندی ئـــیشارێکـــە دەریکـــە لە دەروونـــم
خودبینی و بوخل و حەسەد و نیخوەت و کینە[١١]
بەو خاڵ و خەت و سوورەتی گیسووی هەتە حەقیە
(مانی) کـە پـەرێشـانی سـەنەمخانەیی چـینە[١٢]
نـــایدەم بـــە هـــەموو دەوڵەتـــی دنـیا و قـیامەت
جـارێ بـە «وەفـایی» کـە بـڵێ کـەلبی ئـەمینە[١٣]

---

☞
بەرپێت مەقامی عەرشی ئەعلایە.
لە نێوان عەرش و فەرشدا جیناس و تەزاد هەیە.
(٩) واتە: زولفی تۆ ئاواڵە و جوانییەکەت دیارە، خەڵکیش کە بە جەماڵی تۆ شاد بن هـەموو یاری ڕاستن و رستگارن.
شیماڵ و یەمین: ڕاست و چەپ، تەلمیحە بە ڕۆژی قیامەت کە نامەی عـەمەلی چـاکـان بـە دەستی ڕاست و نامەی کردەوەی خراپیان بە دەستی چەپەوە دەگرن.
(١٠) واتە: بە ڕەحمەت نیگاهێك بفەرموو بە دڵمـدا کـە وەك ئـاوێنـەی ژەنگـاوی ویشك و بێ ئاوە، تا بەو نیگاهەی تۆ سەیقەل بدرێ و شتەکان مونعەکیس بکات.
لە نێوان ئاوی نییە و ئاوێنەدا سیفەتی عەکس هەیە.
(١١) واتە: خۆبینی و بەخیلی و حەسوودی و خۆ بە زلزانی و سیفاتی ڕەزیلە بە تەماشایەکی تۆ لە دەروونەدا پاك دەبنەوە، جارێ تەمەشام بکە تا ئەو سیفەتانەم نەمێنێ لە دڵدا.
(١٢) واتە: ئەو زولف و ڕوخسارەی تـۆ هـەتە مـانی نـەققاش حـەقیەتی پـەرێشـان بـێ و لە بوتخانەی چینیدا نەتوانێ ڕەسمێ وەك زولفی تۆ جوان بکێشێتەوە.
(١٣) کەلب: سەگ .
☜

[ ٩١ ](١)

لەسـەر چـی لێم زیـزی چ بـووە؟ چ قـەوماوە؟
دەمـم لە ڕووی تـۆ دا، کـابە نـەڕووخـاوە(٢)
چ کـێوی تـوورێکـە چ شـوعلە نـوورێکـە
دڵم لە تاوی ڕووی تـۆ ئـەگـەر نـەسووتاوە؟!(٣)
چ بـەرق و بـارانـە چ گـوڵبـەهارانـە؟
چـاوم لەبـەر خـەندەت ئـەگـەر نـەگـریاوە(٤)
نـە زولفـی جـادووتم نـە خـاڵی لای ڕووتـم
عـەزیزەکـەم بـۆچـی ئـەمنت وەلا نـاوە؟(٥)

---

☞

واتە: تەواوی سەروەتی دونیام هەبێ بەو ڕستەیەی ناگۆڕمەوە کە بفەرمووی: «وەفایی سەگی دەرگای منە و لە ئەمانی مندایە» یان: بڵێ سەگی «موحەممەد ئەمین»ە.

[ ٩١ ]

(١) کێشی شیعر: ئەم کێشە عەرووزی نییە، بۆ گۆرانی گوتراوە، بە پەنجەیی دەبێتە: «مفعولن مفعولن مفعولن مفعولن» شازدە هیجایە. لەسەرچی = مفعولن، لێم زیز بووی = مفعولن، چ بووە چی = مفعولن، قەوماوە = مفعولن. کە بە پێی عەرووز دەبێتە بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەب، بەڵام دڵنیام عەرووزی نییە. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: قەوماوە، ڕووخاوە، سووتاوە.
ئەم شیعرە ئاهەنگی تایبەتی خۆی هەیە و دەبێ بەو ئاهەنگە بگوترێ، هیجا کورتەکان هەموو بڵند دەبن.
(٢) واتە: بۆ لێم زیزی، ماچم کردی خۆ کابە نەڕووخاوە.
(٣) واتە: دڵم ئەگەر لە تاوی ڕووت نەسووتاوە لە کێوی توور قەویترە و ڕووی تۆش نوورێکی گەورەیە.
(٤) واتە: ئەگەر چاوم لەبەر خەندەت نەگری لە هەور و هەڵا بریسکەی قەویترە.
(٥) واتە: ئازیز خۆ من زولف و خاڵی تۆ نیم بۆچ منت وەلا خستووە.

چ بکەم کە هەر نەگریم لە دەست ئەو چاو کاڵە؟
شەهید بە هیچ وەختان خوێنی نەوەستاوە![٦]
لەبەر هەناسەی من زولفی لە ڕوو لاچوو
مەگەر نەسیم ئەنگووت؟ بەیانی بەرداوە؟[٧]
بە زاری خۆی داخۆ پرسی لە من ئاخۆ
گوڵ بوو وەها پشکووت؟ شەکەر بوو دەتواوە؟![٨]
بە تاری زولفانت ئەمن وەها شێواوم
سەبر و قەراری من ڕۆیی نەگەڕاوە[٩]
لەبەر شەکەرخەندەت ئاورم وەها کەوتێ
سۆز و گودازی من نەی بوو نەشێراوە[١٠]
سوراغی دێوانان، چراغی پەروانان
شەرابی مەیخانان، خوماری ئەو چاوە[١١]
ئەتۆ و گوڵی بۆ خۆت کردت بە ئاوێنە
ئەتۆ و دەمی فەرمووت بەو ئاوە کوژاوە

---

(٦) واتە: ئەگەر هەر لە دەست یار نەگریم چ بکەم ئاخر شەهید قەت خوێنی ناوەستێ.
حوسنی تەعلیلی تێدایە.
(٧) واتە: هەناسەی من زولفی لە ڕووی لادا دەڵەی نەسیم هات و بەیان بەر بوو.
تەشبیهی موڕەککەب هەیە.
(٨) واتە: ئاخۆ بە دەمی خۆی لە ئەحواڵی منی پرسی، یان گوڵ بوو پشکووت و شەکەر توایەوە؟
تەجاهولولعاریفی تێدایە.
(٩) واتە: بە تاری زولفی وا تێکچووم ئارامم هەر نەگەڕایەوە.
(١٠) واتە: ئاگرێ لەبەر خەندەی کەوتە من و نەکرا سۆز و گودازی بشارمەوە.
(١١) واتە: خوماری ئەو چاوە وەك سۆراغ و دیاردەی دیوەخان و چرای پەپوولە و شەرابی مەیخانە وایە.

ئەی ڕۆژی شەوگەردان، ڕووی تۆ لە نێو پـەردان
شیفای هەموو دەردان، بە خـەندەت هـێنـاوە(١٢)
تۆ و زولف و خاڵی خۆت، ئەتۆ و جەمالی خۆت
کـە شــەو بــە تــاریکی لەو ڕۆژە گــیراوە(١٣)
بــەو ئــاڵ و واڵایــە، بــەو بــەژن و بــاڵایــە
کـە زاتــی ئــەسمایە، کـە وەحـدەتی نـاوە(١٤)
یەخسیر و بەندی تـۆم، لە دووی کـەمەندی تـۆم
بــە زولفــەکــان جـارێ بـفەرموو بـەولاوە(١٥)
فەرمووت: دەبێ بگری، سـەبر و قـەرار نـەگـری
ئەمرت لەسەر عومرم، حوکمت لەسەر چاوە(١٦)
بــە تــیری ئــەو شــۆخــە چــلۆن نـەناڵێنـم؟
بــــرینی تــیراوێ بــە ئــێش و زووخــاوە(١٧)
فەرزەن ئەمن شێت بـووم ڕووم نـەبوو نـەمزانـی
هــەمیشە خــۆ پــاشا ڕووی بــە گـەدا داوە(١٨)

---

(١٢) واتە: تۆ بە پێکەنین شیفای هەموو دەردان و ڕۆژی شەوگەردانت هەیە.
(١٣) واتە: زولف و خاڵی تۆ وەك شەو ڕۆژی جەماڵیان گرتووی.
(١٤) واتە: ئاڵ و واڵا و بەژن و باڵای تۆ زاتی نێوەکانە کە پێی دەڵێ: «وەحدەت».
مەبەستێکی عیرفانییە کە دەڵێن: «وحدت در عین کثرت».
(١٥) واتە: ئەسیری کەمەندی زولفی تۆم جارێ پێیان بڵێ واوە چن.
(١٦) واتە: فەرمووتە دەبێ هەر بگری و ئارام نەگری، بەڵێ ئەمری تۆ لەسەر چاومە هەر وادەکەم.
(١٧) تیراوێ: برینێ کە تەشەنەی کردبێ و چاك نەبێتەوە، برینی شێرپەنجەیی.
واتە: بە تیری ئەو یارە چۆن نەناڵم وەك برینی «تیراوێ» وایە هەمیشە ئێش و زووخاوی هەیە.
(١٨) واتە: وا فەرزەن من شێت بووم ولە ڕووم هەڵنەهات چ بڵێم خۆ پادشا هەمیشە ڕووی بە سواڵکەر داوە تۆ بمدوێنە.

بــە غــەمزە کــوشتوومی، بــە شێوە گـرتوومی
دەشـڵێ: وەفـا مـەگـری، شـەهید نـەشۆراوە[١٩]

دەمــێکــە ڕەنــجوورم، لە یــاری خـۆم دوورم
شەماڵ دەخیلت بم، وەعدەی دوعا و سڵاوە[٢٠]

بـــڕۆ بــە زاری مــن، بــڵێ بــە یــاری مــن:
دوور بێ لە حاڵی تـۆ، ڕۆحـم بـە نـێو مـاوە[٢١]

ئـــەتۆ کـــە ڕێزانـــی چـــۆڵ و بــیابانی
دەســتی مــن و دامـانت «وەفـایی» دامـاوە![٢٢]

[ ٩٢ ][١]

لەبـــەر نـــازی چـــاوبازان خــورد و خــەوم خــوێنــاوە
بـــە تـــیری تـــیرەندازان چبکـــەم جــەرگم بــڕاوە؟![٢]

---

(١٩) واتە: بە غەمزەی گرتوومی بە شێوەی و کەڵەکبازی ئەسیری کردووم پێشم‌دەڵێ وەفایی مەگری شەهید شۆردنی ناوێ.
(٢٠) واتە: زۆر لە مێژە دوورە یارم، شەماڵ دەخیلت بم دوعا و سەڵاوم بۆی بەرەو بۆم بهێنە.
(٢١) واتە: بە زارییەوە بە یاری من بڵێ دوور لە حاڵی تۆمن بەحاڵ ڕۆحم ماوە.
(٢٢) واتە: تۆ ڕێگا دەزانی دەستی من و دامانت بچۆ بە یار بڵێ وەفایی زۆر داماوە.
ئەم قەسیدەیە دەبێ بە دەف و لە سەر هەوای خۆی لە خانەقا و تەکیەدا بخوێندرێتەوە.

[ ٩٢ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن» بەحری موزاریعی موسەممەنی ئەخرەب. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: خوێناوە، بڕاوە، لێداوە. ئەم قەسیدەیەش هەر بۆ گـۆرانییە و گۆرانی‌بێژی زۆر کەڵکیان لێ‌وەرگرتووە.
(٢) واتە: لەبەر نازی چاو جوانان خۆراکم خوێناوە و جەرگیشم بە تیری تیرهاوێژان لەت لەت بووە.

شـێت و شـەیداو سـەحرایـی، دەگـریم هـەروەك وەفـایی
چبکـەم لە دڵەی سـەودایـی، پـەریيان دەسـتیان لێداوە؟(٣)
لە سـەر تـاقی دوو ئـەبرۆت مـەیلی زولفـان دەمکـێشـێ
خـۆ وەخـتە مـن کـافر بـم، چبکـەم قـیبلەم گـۆڕاوە(٤)
عیشوەی ڕووی تۆ هەر خۆش بێ، موشکڵگوشا و سەرخۆش بێ
بـزووت بـادی نـەورۆزی، گـرێی زولفت کـراوە(٥)
ئـەی ئـاوێنـەی دڵبـەری، زارت گـوڵ زولفت زڕێ
بـا هـەناسەم نـەتگرێ، ڕووی خـۆت بـێنـە بـەملاوە(٦)
زولفت جـێی بـێقـەراران، ڕووت ڕۆژی شـەو بـێداران
ئـەمان ئـەی شـای گـوڵزاران، ڕوحـمێك تـا ڕۆحـم مـاوە(٧)
بـەس عـومری مـن بـە بـادە، ڕووت بـێنـە زولفت لادە
دڵ بـۆیـە نـامورادە، بـەو شـەوە ڕۆژ گـیراوە(٨)
بـا شـەو بـڕوا سـەحەر بـێ، بـاغی گـوڵان وەبـەر بـێ
گـەر تـۆ مـەیلت لە سـەر بـێ، کـافر ئـیسلامی نـاوە(٩)

---

(٣) واتە: وەك وەفایی بە شێتی دەگریم، چ بکەم لە دڵم پەری شێتیان کردووە.

(٤) واتە: لەسەر تاقی برۆت زولفت جەزبم دەکا بەرەو خۆی دەمکێشێ، ئەوە خەریکە کافر بم چونکە قیبلەم گۆڕاوە، لە برۆوە بۆ زولف.

(٥) واتە: بای نەورۆز هات زولفت گرێی کراوە، یاخوا عیشوەی تۆ خۆش بێ کە باعیسی ئەم کارە بووە.

(٦) واتە: ئەی یـارێ کـە وەك ئـاوێنـەی دڵبـەری وای، زارت گـوڵە و زولفت زەڕی (زەرد و ئاڵتوونی) یان زڕێیە، با ئاهی من نەتگرێ ڕووت واوە بێنە.

(٧) واتە: ڕووت ڕۆژی شەونەخەوانە و زولفت جێی بێسەبر و قەرارانە، توخودا تـا ڕۆحـم ماوە ڕەحمت هەبێ.

(٨) واتە: کەم عومرم بە با بدە، ماچێکم دەیە، دڵم بۆیە بە ئاوات نەگـەیی چـون بـە شـەوی زولفت ڕۆژی کوڵمت گیراوە.

(٩) واتە: با شەوی زولفت لاچێ و سەحەری ڕوخسارت وەدەرکـەوێ گـەر تـۆ ئـارەزووت لێبێ کافری زولفت موسوڵمان دەبێ.

دەســـــتم لە تـــــای زولفت دا بــــەم بــــاڵایـە نـەمزانـــی
بـــۆچ دەمکـــوژی خــۆ قـوربان پـردی قـیامەت نـەپساوە؟[١٠]
لەبــــەر چـــــاوت نــــەمزانـــی، بــیّ بــاغەبان گــوڵچــینم
مەست بووم هـۆشـم لیّ نـەبوو، دەمـم بـۆ ڕووت هـێنـاوە[١١]
هــاتم بــە بــۆنــەی خــاڵت، تــووشی داوی زولفت بــووم
تــــەیرێکـــــی نـــابەڵەد بـــووم نــەمزانـــی دانــە و داوە[١٢]
ئــــەمڕۆ ســــەبای مـــــورادان کـــاسی کـــردم نــەمزانـــی:
نــە عــەتری نــافەی چــینە، نــە بــۆنـی زولفـی خـاوە؟[١٣]
لە ســــایەی چـــــاوەکـــانت بـــوومە ڕەنـــدی خـــەرابـــات
لەلای پـــیری مـــەیخانە خـــەرقەم لە گـــرەو مـــەی نـــاوە[١٤]
تـــــو خـــودا دڵم مـــەشکێنـــە، بـــا بـــزانــم ڕووت وابـــێنـــە
ڕووتــە یـــان گـوڵ هـەنارە؟ لێوتـە یـان شـەکـری خـاوە؟[١٥]

---

(١٠) واتە: دەستم لە زولفت کەوت قەسەم بە باڵات ئاگام لیّنەبوو بۆ لە خۆڕا دەمکوژی فیدات بم خۆ قیامەت ڕانەبووە و پردی سیرات نەڕووخاوە.

(١١) واتە: لەبەر شوعلەی چاوت نەمزانی باغەبان ئاگای لێیە گوڵم چنی مەست و بیّهۆش بووم و دەمم هێنا بۆ ڕووت.

(١٢) واتە: بە بۆنەی دانەی خاڵت هاتم و تووشی تەپکەی زولفت بووم من مەلێکی نابەڵەد بووم و نەمزانی ئەو دانەت لە نێو داودا بۆ ڕاوی باڵندەکان داناوە.

(١٣) واتە: بای سەبای ئاوات ئەوڕۆ بۆنێکی هێنا کاسی کردم کەچی نەمزانی بۆنی عەترە یان زولفی خاوی تۆ؟

(١٤) خەرقە: لیباسی دەروێشی.

واتە: لە سایەی چاوی تۆوە شەرابخۆری مەیخانەکانم خەرقەم لە لای مەیفرۆش لە بارمتەی شەرابدا داناوە.

(١٥) واتە: لەبەر ڕەزای خودا دڵم مەشکێنە و ڕووت واوە بێنە، با بزانم ئەوە ڕوخساری تۆیە یان گوڵ هەنارە وا ئەوەندە سوور و جوانە؟ وە ئەوە لێوی تۆیە یان شەکرە وا ئەوەندە شیرینە؟ «تەجاهولولعاریف» و تەشبیهی تێدایە.

وەقـــــتێ ئـــــارەق دەرێژێ بـــۆ کـــــوشتنی «وەفـــــایی»
بە گوڵی کوڵمی سوێنـد دەخـۆم گـەردن شـووشەی گـوڵاوە[١٦]
لە دەردی بـــێ دەرمـــــانی، کـــــەوتوومە ســــــەرگەردانـــی
بــــە جـــوابـــی (لَــنْ تَــرانـــي) چبکـەم ڕۆحـم سـووتاوە[١٧]
قــــــــەیتانی دوو لێوانت بــــــەندی جــــەرگی پســــاندم
کــــــــوفرت لەلام زاهـــــیرە ڕوحـــــمت لەلا نـــــەماوە[١٨]
ســــڵاوم کـــــرد لە یــــــارم، بــــــە دڵێکــــــی غــــــەمگینەوە
بـــــە لەفــــزێکــــی زۆر شـــیرین جـــوابــــی ســـڵاوی داوە[١٩]

---

(١٦) واتە: کاتێ بۆ کوشتنی وەفایی ئارەق دەڕێژێ سوێند دەخۆم ملی وەکوو شووشەی گوڵاو بۆنخۆشە.
(١٧) واتە: دەردم هێندە بێدەرمانە سەرگەردان و داماوم بەوەی دەڵەی «من نابینی» ڕۆحـم ئاگری گرتووە.
تەلمیحە بە داستانی حەزرەتی مووسا و کێوی توور.
(١٨) واتە: لێوت وەك قەیتان جەرگی بڕیم ئەوجار زانیم کافری و ڕەحمت نەماوە.
(١٩) واتە: سڵاوم کرد لە یارم بە دڵێکی غەمگین، ئەویش زۆر شیرین وەڵامی داوە.
بەیتی ١٧و ١٨ دەبێ زیاد کرابن لە هی وەفایی ناچن «ئاسۆ».

[ ٩٣ ][١]

چاوەڕێی مـوژدەی نـەسیمم، تـا لە گـوڵشـەن دێتـەوە
بـەڵکـە فـەرمایش بکـا گـوڵ، بـولبولم بـا بـێتـەوە[٢]
وا وەعـیدی بـەفری زسـتانە و فـیراقـم کـەوتە دڵ
مەر بە بای وەعدەی ویسالت کێوی دڵ ڕەش بـێتـەوە[٣]
میروەحەی زولفت لە دەوری ئاوری ڕووت بـێ چـلۆن
ئاگری عیشقت بە ئاوی چـاوی مـن دەکـوژێتـەوە؟![٤]
سووچی زولفت بوو کە پەروانەی دڵم ڕووی کردە ڕووت
ئاگـری وەسـڵی شـەم و پـەروانـە شـەو دەکـرێتـەوە[٥]

---

[ ٩٣ ]

(١) تێبینی: ئەم غەزەلە یەکێ لە بەقەوەترین غەزەلەکانی وەفاییە کـە تێیـدا تـێ کـۆشـاوە تازەگەری بێنێتە مەیدانی غەزەلی کوردییەوە و تێشیدا زۆر سەرکەوتووە، پێوەم شەرحی ئەم غەزەلە هەندێ جوانی ناسانەیی و هەڵسەنگاندنێکی زانستی لەسەر بکەم.
غەزەل لە نالییەوە گەیشتە وەفایی، وەفایی زۆرتر لە نالی لە ژێر کارتێکردنی شاعیرانی فارسدا بووە. دەوری وەفایی سەردەمی بازگەشتی ئەدەبی بووە شاعیران دەیانەوێ شتی تازە بڵێن.
وەفایی لەم غەزەلەیدا عـەمدەن تـەشبیهات و ئیستیعاراتـی تـازەی وەك: مـوژدەی نـەسیم، فەرمایش کردن، وەعیدی بەفری زستانی فیراق، بای وەعدەی ویـساڵ، کێوی دڵ، میروەحی زولف، پەروانەی دڵ، ئاگری وەسڵ، ئاوی خوڕخوڕە، نەقشی موهر، کێوی هیجر، مەزرەعەی میهر و مەحەبەت، توخمی وەسڵ... بەکار بردووە، بەڵام ئەوەم پێ سەیرە بۆچ لەبەیتی ئاخر یا هیچکام لە بەیتەکاندا ناوی شاعیر نەهاتووە بڕێ دوو دڵم دەکات. دیارە ئەم غەزەلە تازەگەری تێدایە و هەر ئەو تازەگەرییە «حەقیقی» و «حەریق» و «سەیف» دروست دەکا تا دەگاتە «هێمن» و «هێدی» و باخچەی غەزەلی موکریان دەڕازێنێتەوە. جا بۆیە پێوەم لەئەم غەزەلەدا تەنها بە ماناکردنەوەی وشە قورسەکان بەسەندە بکەم پێچەوانەی غەزەلەکانی دی؛ چونکا لە شیعری تازەگەیشتن ئاسانە.
(٢) فەرمایش: دەستووردان.
(٣) وەعیدی بەفری زستانی فیراق: وادەی دووری. ڕەشبوونەوەی کـێو: لاچـوونی بـەفر و هاتنی بەهار.
(٤) میروەح: باوەشێن.
(٥) سووچ: تاوان. ئەم بەیتە زۆر تازەیە کـە زولف هـۆی ڕوو کـردنی پـەپوولەی دڵی بـێ لە
☜

خەتتی میهر و زولف و خاڵی حوججەتی مولکی دڵە
نەقشی ئەو موهرە بە ئاوی «خورخورە» ناچێتەوە(٦)
دڵ لە ترسی چاوی بوو، ڕووی کردە میحرابی بڕۆی
ئێستە بیستوومە لە چینی زولفی جێی نابێتەوە(٧)
کێوی هیجرت خستە سەرشان و دڵم پێی خستووە
تا نەگا دەستی بە زولفت زەحمەتە هەستێتەوە(٨)
سەد کەڕەت خستمتە گێژی مەهلەکەی بەحری فیراق
ئاخری قوللابی موژگانت دەرم دێنێتەوە(٩)
مەزرەعەی میهر و مەحەببەت توخمی وەسڵی شین نەکرد
گوڵ بە شادی دادەچێنم خاری غەم دەڕوێتەوە(١٠)
خۆت دەزانی موددەتێکە سەیر و پاماڵی جەفام
کەی وەکوو نەقشی قەدەم سەر نێمە ژێری پێتەوە؟(١١)

---

☞

ڕوخساری وەك شەمی. تاوانی شەوی زولف بێ بە هۆی ئەوە پەروانە ڕوو لەشەمی ڕوخسار بکات.

(٦) خەت: نامە، سەنەد. حوججەت: دەلیل، بەڵگە. موهر: ئیمزا، توغرا. خورخورە: چۆمێکە لە موکریان.

(٧) چینی زولف: یانی چین و چرووك و درێژی وەك دووری موڵکی چینە، ئەمە ئیهامە.

(٨) پێ خستن: ماندوو بوون.

(٩) بەحری فیراق: دووری. گێژی مەهلەکە: جێگەی قووڵی دەریا.

(١٠) مەزرەعە: مەزرا، بێستان. توخمی وەسڵ: تۆی پێك گەیشتن. موراعاتی نەزیر هەیە لە نێوان مەزرەعە، توخم، شین کردن، چاندن، دوورین و خاردا.

(١١) سەیر: قەیدە واتە یەکجار جەفا پاماڵی کردووم. سەر ژێر پێ نان: وەسڵ و تەوازوع. دەشکرێ «سەیر و پاماڵی» نەبێ و «سەر و پا ماڵی» بێت.

دڵ ئـــەوا کـــەوتۆتـــە زیـــندانـــی غـــەم و قـــوربانتم
تـــاێـکـــی زولفت بـــنێرە بـــەڵکـە بـۆم دەربـێتـەوە[١٢]
تــو خــودا تـاکـەی لە تـاریکی شـەوی هـیجرانـی تـۆ
دەستەوئەژنۆ دابـنیشم، ڕەبـبی کـەی ڕۆژ بـێتـەوە؟![١٣]
بێ ئیشارەی «حکـمة العـین»ی "شـیفا"ت نـایە شـیفام
خۆت دەزانی زامی دووری سەختە خۆش نـابێتـەوە[١٤]
فــیکری مــن چــونکە دەقـیقی عـاشقی قـەددی ئـەوە
موو لە موو گـیراوە، چ بکـەم لێك جـوێ نـابێتـەوە؟[١٥]

## [ ٩٤ ][١]

چین چـین و تـاتا گـرێی زولفـی حـەریری بکـەوە
دین و دڵان مەسکە ڕێێ میسك و عەبیری بکەوە[٢]

---

(١٢) واتە: زولفی وەك تەنافت بنێرە تا دڵمی لە زیندانی غەم پێ‌دەربێنمەوە. (بەڕاستی شتێکی تازەیە).
(١٣) دەستەو ئەژنۆ: مات و داماو.
(١٤) «حكمة العين»: حیکمەتی چاو، ناوی کتێبێکە کە نیسبەت دراوەتە لای ئەبو عەلی سینا. شیفا: کتێبی ئەبوو عەلی سینایە.
(١٥) واتە: فیکری من هێندە دەقیق و باریکە لە قەدی باریکی یار ئاڵاوە دوو موو لەیەك جیا نابنەوە.

**[ ٩٤ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفتعلن فاعلن مفتعلن فـاعلن» بـەحری سـەریعی مـوسەممەن. ڕەدیـف: بکەوە. واژەی قافیە: حەریری، عەبیری، و... قافیەی میانیشی تێدایە.
(٢) مەسکەر: مەستکەر، سەرخۆشکەر.
واتە: گرێی زولفی حەریرت بکەوە تاوەکوو دین و دڵان بە میسك و عەبیری مەست بن.

چەند خۆشە بۆسە کردن، پێکەوە دەست و گەردن
ئیدی هەتاکوو مردن بە شەهد و شیری بکەوە[٣]
هیلاکی غەمزە و برۆی، شاد و شەهیدە بۆ خۆی
ئەی دڵی ڕەنجەڕۆ بۆی، شیر و تیری بکەوە[٤]
گەر وەکوو زولفی سیای، حەلقە ببەستن سەفای
بمرە لەبەر خاکی پای، هەر بە ئەسیری بکەوە[٥]
لە مێژە بێ حاسڵم، تاکەی بناڵێ دڵم؟
بولبولی خۆتە گوڵم، جارێکی بیری بکەوە[٦]
دڵ کە لە تۆ زیز بووە، خوێن وە سەری کەوتووە
تیفلە گرووی گرتووە، بەو مەمە ژیری بکەوە[٧]
چاو مەستە ڕوو گوڵدەستە زاری خۆت کردە پستە
فەرمووی «وەفایی» هەستە بەس بە زویری بکەوە![٨]

---

(٣) بکەوە: بخەوە.
واتە: چەندە خۆشە ماچ و دەستەملان کردن، ئیدی هەتا مردن لە بەهەشتدا بخەوە و شیر و شەکر بنۆشە.
(٤) واتە: هەر کەس کوژراوی غەمزەی یار بێ شەهیدە ئەدی دڵ لە کۆڵی تیر و شمشێر بەوە و خۆت بە غەمزەی یار بەکوشت بدە.
(٥) واتە: ئەگەر سەفا و خۆشی وەك زولفی یار لەبەر پێیدا بکەوێ تۆ لەبەر خاکی پای ئەسیر بە، جا هەر ئەهلی سەفا دەبی.
"ی" لە «سەفای»دا "ی" سابڵاغییە هەر یانی سەفا.
(٦) واتە: ئەی یار بولبولی خۆتم تاکەی بە بێ حاسڵی بناڵم جارێك یادم بکە.
(٧) ژیرکردنەوە: خاواندنەوەی منداڵ.
واتە: دڵم کە نارەحەتی تۆیە و پڕ لە خوێناو بووە وەك منداڵ وایە بەو مەمکەی خۆت بیلاوێنەوە و ژیری بکەوە.
(٨) زویری: زەلیلی و بێ کەسی.
واتە: ئەو یاری چاو مەستە زاری وەك پستە وایە، فەرمووی وەفایی هەستە هێندە زەلیل مەبە.

[ ٩٥ ][1]

مـــەمکوژە تـۆ گـەردەنی خـۆت ڕووت لە زولفـان دەرخـەوە
ئەی سەبای سالّحان ئـەتۆ بکـەی ئـەم شـەوە ڕۆژ بـێتـەوە[2]
تــاقەتم چـــوو ئـــارەقی گـــەردنت بـــە زولفـــان ون مـەکـە
ئـــەی ســـتارەی ســـوبحدەم ئـەوشۆکـە زووتـر دەرکـەوە[3]
ســـووتبووم خـــۆم دا پـــەنای زولفت دەمـێك ئـاسوودە بـم
ڕووت نـیشان دام بـاز لە ســایەی تـۆوە ئـاورم گـرتەوە[4]
زولفت ئـەفشان کـرد و پـەنهان بـووی و دونـیات کـردە تـەم
خـــۆت وەدەرنـــا عـــالەمت سـووتاند و ئـاورت کـردەوە[5]
بـــا بـــە هـــەوایای پـــایبووسیت عـــومری مـــن کـۆتـا نـەبێ
مەیخە پشت گوێ، مەرگی من، بـێ زولفـەکـانت بـەردەوە[6]

---

[ ٩٥ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: دەرخەوە، بێتەوە، دەرکەوە، و...

(٢) واتە: تۆبی و گوناحانی گەردنی خۆت، یان سوێندت ئەدەم بە گەردنی خۆت، مەمکوژە و زولفت لەسەر ڕوخسارت لابەرە، خودایە بۆ خاتری بەیانی پیاوچاکان شەوی زولفی لەسەر ڕووی لاچێ و ڕۆژ هەڵبێ.

(٣) واتە: من سەبرم تەواو بوو ئارەقی گەردنت بە زولفت دامەپۆشە ئەی ئەستێرەی بـەیانی ئەوشۆ زووتر هەڵبێ.

ئارەقی گەردنی یار بە ئەستێرەی بەیانی شوبهاوە.

(٤) واتە: من سووتا بووم خۆم دا سایەی سێبـەری زولفت کـەمێ وەحـەسێم، ڕوخسـارت نیشاندام لە حەیبەتان دووبارە سووتامەوە.

(٥) زولفت پەرێشان کرد و خۆت لە عالەم ون کرد و دونیا لە تەمێ غەرق بوو، هـەر خـۆت پیشان دا دونیا سووتا و ئاگرت هەڵایسانەوە. ئاگر کردنەوە: کینایە لە چالاکی زۆرە.

(٦) واتە: بە هیوای پێ ماچکردنی تۆ تەمەنێکە چاوەڕێم و خەریکە بـەو هـیوایـەوە ئـەمرم، زولفیشت مەخەرە پشت گوێ، بەریدەوە با بگاتە کن لاقت.

پشت گوێ خستن: ئیهامە و کینایەیە لە تەوەججوه پێ نەکردن و بێ ئیلتیفاتی.

ئــولفەتی زولفت چــییە قــوربان لەگــەڵ ڕوخســاری تــۆ؟
خــۆ بــە هــیچ دیـنێکـی نـابێ کـوفر و ئـیمان پـێکـەوە(٧)
هــاتەسەر خــەندە کــە مــن ســولْتـانی حـوسن و دڵبـەرم
غــایەتی ســوورەتنومای ڕۆژی جــەماڵی مــن شــەوە(٨)
بای سەبای بەرقەع گوشا بوو؟ یا ئەتۆ بووی خـۆت نـوانـد؟
یــا نــە ڕیــزوان دەرکــی گــوڵزاری بـەهەشتی کـردەوە؟(٩)
مــن لەبــەر عــەکســی نــیگاهت کــەوتووم هـۆشم نـییە
چاوەکەی تۆ هەر نەخۆشە یـا نـە سـەرخـۆشـی خـەوە؟(١٠)
«خــارق العــادات»ی زولف و خــاڵ و خـەندەی زاری تـۆ
میشك و عەنبەر، شەهد و شەککەر، لەعل و گەوهەر پێکەوە(١١)

---

(٧) زولف: کوفر. ڕوخسار: ئیمان.
واتە: قوربان ئەو ڕەفاقەتی زولف و ڕوخسارەت بۆ چییە؟ کوا کافر و موسوڵمان یەك دەکەون.
(٨) واتە: یار بە پێکەنینەوە گوتی من پادشای جوانی و دڵڕفێنم، ئەوپەڕی شکڵی جوانی من شەوی زولفەکانمە.
(٩) بەرقەع: ڕووبەند، چارشێو. ڕیزوان: دەرکەوانی بەهەشت.
واتە: ئەرێ بای سەبا بوو چارشێوی لادای؟ یا تۆ خۆت نیشان دا؟ یا دەرکەوانی بەهەشت دەرکی گوڵزاری ئاوەڵاکرد؟
«تەجاهولولعاریف» و تەشبیهی تێدایە.
(١٠) واتە: لەبەر شەوقدانەوەی تەمەشات من بێهۆشم، ئەرێ چاوت هەروا بیمارە؟ یان خەواڵووە وا هێندە جوانە؟.
(١١) «خارق العادە» لە حاڵەتی عادی بەدەر.
واتە: زولف و خاڵ و خەندەت خارقولعادەن، کوا میشك و شەکەر و لەعل پێکەوە دەبن؟.
لەف و نەشر و تەشبیه هەیە لە نێوان زولف و میشك، و خاڵ و عەنبەر، و خەندە و شەکەر، و زار و لەعل و گەوهەردا.

**زولفـــی لادا تـــا دیـــاربێ جـــاعیلی لەیـــل و نـــەهار**
**ڕووی وەدەرنـــا تـــا بـــزانـــن «خـــالق الأصـــباح» ئـــەوە[١٢]**
**نـەوڕەسـیدەی نـەخلی بـاڵای شـەرحـی حـەرفی وەحـدەتە**
**نەور و نەکهەت، نوور و زوڵمەت، نار و جەننەت پێکەوە[١٣]**
**وەك سـەری زولفت دەبـێ کـێبـێ حیسابی تێك‌نـەچێ**
**گەر بە ناز تۆ بێیە پـەی مـەحشەر بـە چـاوی مـەستەوە؟[١٤]**
**چـم لە ئـومـمێدی بـەهەشت و بـیمی دۆزەخ داوە مـن؟**
**دۆزەخـی مـن هـەر فـیراقـە، جـەننەتم وەسـڵی ئـەوە[١٥]**
**لێوەکەت عـومرم بـوو شـەرتت کـرد بـە دڵ جـارێکـی دیش**
**وەخـتە بـوو بـمرم وەرە عـومری دوبـارەم پـێبـدەوە[١٦]**

---

(١٢) جاعیل: بەدی هێنەر. «خالق الأصباح»: ڕوونکەرەوەی بەیانان.
واتە: زولفی لادا تا بزانن شەو و ڕۆژ بە دەستی ئەوە، ڕوخساری دەرخست تا بزانن بەیانی ئەو دروستی ئەکات.
ئەم شیعرە خاڵی لە مەفاهیمی عیرفانی نییە.
(١٣) وەحدەت: یەکیەتی و عەلامەتی (١) کە وەك باڵای یار وایە. نەور: خونچە. نەکهەت: بۆن.
واتە: باڵای تازە پێگەیشتووی شەرحی واژەی وەحدەت و یەکـە، خـونچە و بـۆن و نـوور و تاریکی، ئاور و بەهەشت پێکەوەن.
لە عیرفاندا وەحدەت نەمادی خودایە کە هەموو شتی خەلق کردووە و هەموو شت هەر ئەوە.
(١٤) واتە: کێیە لە مەحشەردا وەك زولفی تۆ ئاڵۆز نەبێ و حیسابی لە دەست خاریج نەبێ گەر لە مەحشەردا بە چاوی مەست خۆت نیشان دەی.
دەکرێ ئەم بەیتە بە شەفاعەت و تکاکاری پێغەمبەرىﷺ گوتبێ.
(١٥) واتە: من کارم بە بەهەشت و جەهەننەمەوە نییە، جەهەننەمم دووری ئەوە و بەهەشتم وەسڵی ئەوە.
(١٦) واتە: لێوی تۆ عەمری من بوو قەرارت کرد جارێ‌دیش ماچم دەیتێ و بم‌دوێنـی وەرە ئەمجارەشم بدوێنە تا تەمەنم بێتەوە هەوەڵ.

خـۆش بـە نـاز ڕامـەبرە، قـوربان، ئـیلتیفاتێکت هـەبێ
دادخـواه زۆر کـەوتوون نـەختێ سـەمەندت بگـرەوە(١٧)
تـاقی ئـەبرۆت دەرخـە شـادم کـا هـەتا قـوربانی بـم
عـیدی قـوربان چـونکی شـەرتی ڕوئـیەتی مـاهی نـەوە(١٨)
داخۆ چبکا پـاش خـەت و خـاڵان سـەفی مـوژگان بـە نـاز؟
لەشکـری تـورکان ئـەوا هـات و فـەرەنگی پـێشڕەوە!(١٩)
ئـاه و نـاڵەی بـێقـەراریـم عـالەمی خسـتۆتـە جـۆش
گـوڵ بـەناز پـەروەردەیە ئـەی دڵ دەمـێکی بسـرەوە(٢٠)
مـن لە سـەر خـاکـی دەری یـاری سـەفەرکەردە نـەمام
نـامرم ئـەهلی بـەهەشتم گـەر ژیـانم بـێتـەوە(٢١)

---

(١٧) دادخا: شکایەتکەر. سەمەند: ئەسپ.
واتە: قوربان هەروا بە سەرخۆشی مەڕۆ و چاوێك لە دەور و بەرکە ویستیاری عەدڵ و شکایەتگەرت زۆرن هێندێ ئەسپەکەت ڕاگرە و عەرز و حاڵیان بپرسە.
(١٨) واتە: تۆ برۆت دەرخە کە وەك تاقی هیلالە با دەمێ منیش خۆم بە قوربانی کەم، چونکە شەرتی جەژنی قوربان دیتنی مانگی یەکشەوەیە.
نازانم چۆن وەفایی لێرەدا ئاوای کردووە! چونکە بینینی مانگی یەکشەوە بۆ جەژنی ڕەمەزانە نەك بۆ جەژنی قوربان و جەژنی قوربان لە دەی زیلحەجەدا دەکرێ و مانگ لە هیلالی دەردەچی و بەرەو پڕی دەڕوا.
(١٩) واتە: سەفی موژگانت بڵێ چ بکا لە خەڵك، چونکا لەشکری تورکی چاوت هات و خاڵ و ڕوخساری فەرەنگیشت لە پێشەوە حەرەکەتیان کردووە.
(٢٠) واتە: ئاه و ناڵەی بێ قەراری من دونیای وەجۆش خستووە ئەی دڵ! گوڵ بە ناز پەروەردە کراوە هێندە مەناڵە و ئارام بە تا گوڵ نارەحەت نەبێ.
(٢١) واتە: یارم کە سەفەری کرد من لە سەر خاکی دەرکی ئەو نەمام منیش چۆڵم کرد وڵات. دەزانم من نامرم و ئەهلی بەهەشتم ئەگەر یارم جارێدیش بێتەوە. یار لێرەدا شێخ عوبەیدیللایە.

تــۆ هــەڵســتای بــەو دەمــە ڕۆحــی «وەفــایی»ت زیــنـدە کــرد
بــا قــیامەت کــەس نــەڵێ هــەر یــێکــە تــوخودا هــەستەوە[22]

[ ٩٦ ][1]

تــا بــە تــا لەو ڕۆژە تــۆ زولفت بــە ڕوودا خســتەوە
من لە سایەی زولف و ڕووی تۆ ڕۆژی ڕووناکم شەوە[2]
دا بــزانــن خــەت لە دەوری عــاریزی هــات و کــوتی:
«هەرچی نەیدیوە شەو و ڕۆژ نوور و زولمەت پێکەوە!»[3]
دڵ لەسەر تاقی برۆی خــۆی خســتە داوی زولفــی خــاو
قــیبلەکــەم گــۆڕاوە بــۆیــە پــێم بــە داوی کــوفرەوە[4]

---

(٢٢) واتە: تۆ کە هەستای و قیامت کرد ڕۆحی وەفایی بەوە زیندوو بووەوە، با خەڵك نەڵێن هەر یەك قیامەت هەیە تو خودا جارێکی دیش هەستەوە و قیامەتی دیکە سازکە.
ئەم بەیتەی ئاخر دەری دەخا شیعرەکە سەراپا وشەکان مەجازین و ڕاجیع بە شۆڕشی شێخ عوبەیدیللا و مەرگ و دوورخستنەوەی ئەو گوتراوە بە سەبکی «حافظ» جار جار مـەبەستی دونیاییشی تێدا گونجاندووە.

[ ٩٦ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: خستەوە، شەوە، پێکەوە، و...
(٢) واتە: لەو ڕۆژەوە زولفت یەکە یەکە بە ڕوخسارتدا داوە من ڕۆژی ڕووناکم لێ بۆتە شەو.
(٣) واتە: لەبەر ئەوەی خەڵکی ئاگەداربن خەتی ڕوخساری هات و گوتی: «کێیە شەو و ڕۆژ و نوور و تاریکی پێکەوە نەدیوە بێ ببینێ».
(٤) واتە: دڵم لەسەر تاقی برۆی خۆی هاویشتە زولفی بۆیـە قیبلەم گۆڕاوە لاقـم ئـەسیری داوی کوفری زولفی یار بووە.

ڕۆحـــی شـــیرینم بـــە چـــاوان وا بـــە زاری دەمکـــوژێ
قـــەد نـــەڵێ: داخـــۆ ئـــەوە فـــەرهادە یـــاخۆ خـــەسرەوە؟[٥]
چونکە دڵ عاشق بە ئەبرۆی بوو بە داوی زولفی بـەست
حـــــەقیە زنـــــجیری بکـــا دێوانـــەیی مـــاهی نـــەوە[٦]
من وەها زوو مەستی مەی نابم بـە نـەشئەی چـاوەکـەت
مـــەرگی مـــن ســـاقی لەگـــەڵ ئـــەو جـــامە لێوت بـــێنـەوە[٧]
تـــۆ «وەفـــایی»ت کـــوشتووە ئـــیسباتی کـــوڵمـــی ســـوورتە
ڕۆژ کـــە گـــیرابـــێ نـــیشانەی قـــەتڵی مـــەزڵوومـــان ئـــەوە[٨]

---

(٥) واتە: ڕۆحی شیرینی من کە یارە چاوی وام دەکوژێ قەت فەرقی بۆ ناکا من فەرهاد بم یان خەسرەو.
تەلمیح و موراعاتی نەزیر هەیە لە نێوان شیرین و فەرهاد و خەسرەودا. وە لە شیریندا ئیهام هەیە.
(٦) واتە: چونکە دڵ عاشقی برۆی بوو کە وەك مانگی نەو دەچێ، یار بـە زنـجیری زولفـی بەستییەوە، چونکا شێتی مانگ دەبێ بە زنجیر بـەسترێتەوە دەنا دەست دەوەشێنێ.
دەڵێن شێت مانگ ببینێ شێتتر دەبێ.
(٧) واتە: من بە ئاسانی مەستی مەی نابم ساقی مەرگی من لەگەڵ ئەو جامە لێویشت بێنە با بە ماچی لێوت مەست بم.
(٨) واتە: تۆ قاتڵی وەفاییت، بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەمە کوڵمەکـەتە کـە بـە خـوێنـی ئـەو سوورە، کاتێ ڕۆژ دەگیرێ دیارە مەزڵوومێ کوژراوە.
ئەسلووبی موعادەلەی تێدایە.

[ ٩٧ ](١)

سـەروە یـا عـەرعەرە یـا تـازە نـیهالی چـەمەنە؟
یا ئـەوە گـوڵبـونی بـاڵای گـوڵی گـوڵزاری مـەنە؟(٢)
عاشقی زولف و ڕوخی سـەرسەری یـارێکـم ئـەمن
چـاوی بـیمارە، گـوڵی زارە، قـەدی نـارەوەنە(٣)
قەدی سەروە بـەری هـێنـاوە کـە مـیوەی دەمـی وی
نـاری پسـتانە، گـوڵی نـەورەسـە، سـیبی زەقـەنە(٤)
بـە هـەوای بـاغی گـوڵانـی کـە دەنـازێ حـەقیە
گوڵی من گوڵ دەمە، گوڵ چەپکەنە، گوڵ پیرەهەنە(٥)
دڵ کـە کـوشتەی ڕوخـیە بـەستەیی زولفـە دەگـری
شەوی هیجرانـە دەڵێی نـاڵەیـی مـورغی چـەمەنە(٦)

---

[ ٩٧ ]

(١) کێشی شیعر: «فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن» بەحری ڕەمـەلی مـوسەممەنی مـەخبوونی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: چەمەنە، مەنە، نارەوەنە، و...

(٢) واتە: ئەرێ ئەوە داری سەوڵە یان عەرعەرە یان خەڵفی تازەیە لە نێو چەمەندان، یان بنچە گوڵی باڵای یارەکەی منە؟!
ئیستیعارە و «تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

(٣) سەرسەری: شێت.
واتە: من عاشقی یارێکی شێتۆکەم، چاوی نەخۆشە دەمی وەك گوڵە، قەدی وەك دارەبەن وایە.

(٤) واتە: قەدی وەك سەوڵە کەچی بەری میوەی گرتووە کە بریتین لە هەناری مەمك و گوڵی تازەپێگەشتوو و سێوی چەنە.

(٥) چەپکەن: کراسی داوێن درێژ. واتە: حەقیەتی بە باغی گوڵ و ڕوخساری خۆی بنازێ چونکا گوڵی من دەمی وەك گوڵە و کراسەکەی بەریشی هەر لە گوڵ دروستکراوە.
بە زاراوەی شنۆیی «چەپکەنە» یانی چەپکە گوڵن، هەر چەند دەڵێن چەپکەن کراسێکـە لای چەپەوە دادەکەندرێ، من بڕوام وانییە.

(٦) واتە: دڵ کە بەسراوی زولفی یارە و کوژراوی ڕوخساریە دەگری دەڵەی مەلی چەمەنە لە شەوی دووری زولفی یاردا دەناڵێ.

**ئەشکی من چونکە لەسەر چاوەیی دڵ دێتە دەرێ**
**ڕەنگی گوڵنارییە مرواریی خاکی یەمەنە(٧)**
**زولفی لەرزانی بە سەر چاوی بە دەم بادی وەزان**
**میشکی تەڕ، عەنبەری تەڕ، چەتری غەزاڵی خوتەنە(٨)**
**کوشتنی بولبولی میسکین چییە؟ پشکووتنی گوڵ**
**مەتڵەبت کوشتنی عاشق نییە، تۆ پێمەکەنە(٩)**
**دڵ و دینم لە بەهای ماچی دەمی داوە دەڵێ:**
**لە «وەفایی» مەگرن عاشق و مەجنوونی مەنە(١٠)**

•••••••━━●━━•••••••

(٧) واتە: فرمێسکی من لەسەر چاوانی دڵم دێتەدەر بۆیە وەك گوڵنار سوورە و لە مرواریدی خاکی یەمەن دەچێ.
(٨) واتە: زولفی لەسەر سەر و چاوی کە با دەیلەرزێنێ دەڵەی میشکی تەڕ و عەنبەری تەڕ و چەتری ئاسکی وڵاتی خوتەنە.
(٩) واتە: دەزانی بولبولی فەقیر بە چی دەکوژرێ؟ بە پشکووتنی گوڵ، ئەگەر مەبەستت کوشتنی عاشق نییە تۆش پێمەکەنە.
حوسنی تەعلیل و تەشبیهی تێدایە.
(١٠) واتە: من دڵ و دینم بە قیمەتی ماچێ داوە کەچی دەڵێ ئیراد لە وەفایی مەگرن شێت و عاشقی منە!

[ ٩٨ ][1]

چـاوی پـڕ خـوێنـم دەگـێڕم قـیبلەکـەم پـەیدا نـییە
نـووری چـاوم ڕۆیـیوە یـا دیـدەکـەم بینا نـییە؟[2]
وەك نـەیستان ئـاورێ بـەربۆتـە دەروونـم بـەند بـەند
دڵ کە هەروەك نـەی دەنـاڵێ دەم بـە دەم بـێ‌جـا نـییە[3]
ئـەی چـرا لەحـزێك مـودارا تـێر ببینێ ڕەنگ و ڕووت
وەرنـە پـەروانـەی غـەریب جـان و دڵی پـەروا نـییە[4]
بـۆ نـیساری مـەقدەمت عـومرێکـە دەگـریم ڕۆژ و شـەو
تا بـەکـەی گـەوهەر فشـانی، چـاوەکـەم دەریـا نـییە؟[5]
چی دەکەم، دەگریم، دەسـووتێم، ئـاوری دڵ نـامرێتـەوە
چبکـەم ئـاخر نـووری دیـدەم، سـینەکـەم سـینا نـییە[6]

---

[ ٩٨ ]

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف: نییە. واژەی قافیە: پەیدا، بینا، بێ‌جا، و...

تێبینی: وەفایی ئەم شیعرەی بۆ تەبعید و دوورخستنەوەی شێخ عوبەیدیللا گوتووە و «میرزا ئیسماعیلی ئاغا تەها» لەسەر ئەم کێش و ڕەدیف و قافییە قـەسیدەیەکـی هـەیە کـە زۆر لەم شیعرەی وەفایی بەقەوەتترە.

(٢) واتە: چاو دەگێڕم شێخ کە وەك قیبلەم وابوو دیار نییە، یان نووری چاوم نەماوە یان چاوم نابینێ.

(٣) واتە: دڵم ئەگـەر وەك نـەی بـناڵێ جـێی خـۆیـەتی چـونکا بـەند بـەندی دەروونـم وەك قامیشەڵان ئاگری تێ کەوتووە.

(٤) واتە: ئەی چراکەمێ سەبرت هەبێ با پەروانە تۆزێ ڕوخسارت ببینێ، خۆ ئـەو تـرسی گیان و دڵی نییە هەر پێی خۆشە بتبینێ.

(٥) واتە: تاکەی چاوم بۆ زێڕەوشانی هاتنت گەوهەر بڕێژێ، بۆ مەگەر چاوی من بەحرە ئەو هەمووە گەوهەرەی تێدابێ.

(٦) واتە: هەرچی دەگریم ئاوری دڵم بۆ ناکوژێتەوە ئـەی نـووری دیـدەم خـۆ سـینگی مـن

**گەر هەزار جار بێ بەکۆی زووخاڵ بە نووری کێوی توور**
**ئــەو دڵە، جــۆیـایی یـەك دیـداری وەك مـووسا نـییە(٧)**
**هـات و ڕووی وا کـرد و دونـیای کـردە نـاڵەی عـاشقان**
**دا نــــەڵێن نــــایێ قــیامەت، ڕۆژی واوەیــلا نــییە(٨)**
**حەڵقە حەڵقە تـاری زولفت خستە سـەر ڕووی نـازەنین**
**دا نــەڵێن ڕۆژ حــەڵقـەگـۆشـی مـاهی شـەوئارا نـییە(٩)**
**پــێکــەنی مـەمنوونی کـردم، زولفـەکـەی دامـێ بـە دڵ**
**دا نەڵێن شەککەر فرۆشـی ئـێمـە خـۆش‌سـەودا نـییە(١٠)**
**خــۆم بــەسەر گــێڕا کـوتم: قـوربان پـەرێشـانی بـەسە!**
**سوێندی خوارد بەو زولفە وەسڵم عەینی سەرگەردانییە(١١)**

---

☞
سەحرا و تووری سینا نییە وا بسووتێ.
تەشبیهـ ، تەفزیل، تەلمیح و ئیستیعارەی تێدایە.
(٧) واتە: دڵ ئەگەر هەزار جار وەك کێوی توور بسووتێ و بێتە زوخاڵ، هێشتا ئەوەی کە مووسا بە دوایدا دەگەڕا (کە گەیشتن بە خودا و قسەکردن بوو لەگەڵیدا) بۆ ئەم دڵەی من دەست ناکەوێ.
تەلمیحە بە داستانی کێوی توور و تەجەللای حەق و...
(٨) واتە: هات و ڕوخساری پیشان دا و دونیای کرد بە ناڵەی ئاشقان تا نەڵێن ڕۆژی قیامەت شین و گریانی تێدا نییە؟
ئیشارە بە شۆڕشی شێخ عوبەیدیللایە.
(٩) واتە: یار ئەڵقە ئەڵقە زولفی خستە سەر ڕوخساری جوانی تا نەڵێن هەتاو گوێڕایەڵی مانگی شەو ڕازێن نییە.
ماهـ: ئیستیعارە لە ڕوخساری یارە. وە تەشبیهی تاری زولفی زەردیش کراوە بە تیشکی هەتاو.
(١٠) واتە: یار پێکەنی و منی مەفتوونی خۆی کرد و زولفی بە دڵ و گیان دا بە من تا خەڵکی نەڵێن ئەو شەکەر فرۆشەی ئێمە خۆش مامەڵە نییە.
(١١) خۆم وەسەرگێڕا: تکام لێ کرد.
☜

مەنعی ناڵینم لەشەوقی گەردەن و ڕووی خۆت مەکە

بولبولی سوبحی بەهار بێشین و واوەیلا نییە(١٢)

دڵ کە بەستەی زولفە لەو لێوانە مەحروومی مەکە

بێشەکەر ئەم تووتییە ناژی کە هێندوستانییە(١٣)

گا بە ناز، گاهێ بە غەمزە مەمدە بەر تیغی برۆت

کوشتنی عاشق بە هیچ دینێکی قوربان چا نییە(١٤)

با فریبی من نەدا واعیز بە گوڵزاری ئیرەم

عاشقی ڕووی تۆ بە هەوای «جنة المأویٰ» نییە(١٥)

گەر هەموو عالەم بڵێن: مەجنوونە، تا دەمرم دەڵێم:

هەردوو دونیا قیمەتی دیداری یەك لەیلا نییە(١٦)

---

☞

واتە: زۆرم تکاکرد گوتم قوربان ئیدی بەسە پەرێشانی، فەرمووی بە زولفم قەسەم ویساڵی من عەینی سەرگەردانی و ئاڵۆزییە. واتە: دەردەکەم زۆر سەختە هەرکەس دەگەڵم بێ زەحمەتی بۆ پێش دێ.

(١٢) واتە: مەنعم مەکە بۆ تۆ بناڵم، بولبول لەکاتی بەهاردا ناتوانێ شین و واوەیلا نەکات.

(١٣) واتە: دڵم بەستەی زولفە و لە لێوت بێبەشی مەکە، دڵم وەك تووتی هیندی وایە بێ شەکەر ناژی.

مەبەستی عیرفانی بەیتەکە ئەوەیە: لەو قسە چاکانەی خۆت بێبەشم مەکە با بیانکەم بە شیعر.

(١٤) واتە: کوشتنی عاشق لە هیچ دینێکدا چاك نییە، تاوێ بە ناز و تاوێ بە غەمزەی برۆت مەیکوژە.

(١٥) واتە: با نەسیحەتگەر بە بەهەشت من فریو نەدا، کوژراوی ڕوخساری تۆ عاشقی بەهەشت نییە.

(١٦) واتە: ئەگەر تەواوی عالەم پێم بڵێن شێتە وەك مەجنوون، من دەڵێم تەواوی دونیا تاقە لەحزەیێ دیداری لەیلا ناهێنێ.

داد لە دەست حوسنت کـە زولفت نـابێ بـێ نـاڵەی دڵان
ئـاریٔ ئـاریٔ دائیـرەی شـاهانە بـێ‌غـەوغا نـییە؟[١٧]
چت لە وەسڵی زولفی من؟ فـەرموو «وەفـایی» هـا دەمـم
تـالیبی عـەیشی ئـەبەد بـە، عـومری دونـیا فـانییە[١٨]
سەد هەزار دڵ پێکەنی وەك گـوڵ بـەدەم بـادی بـەهەشت
یا هەناسەی جـانفەزای گـوڵزاری غـەوسی سـانییە؟[١٩]
جـانشینی حـەزرەتی «غـوث الخـلایق» قـوتبی حـەق
فەرعی «تـاها» ئـەسڵی «یـاسین» نـەوبەری گـەیلانییە[٢٠]
ڕەوشـەنی چـاو و قـولووبی عـاریفە عـەکسی دڵی
کـێوی تـوورە، مـەزهەری نـوورە، کـلی سـوبحانییە[٢١]
پێی لەسەر شـانی هـەموو وەلیـیانە جـەددی خـۆی دەڵێ
جـێی لەسـەر چـاوانـە شـاه و شـانشینی سـانییە[٢٢]

---

(١٧) واتە: هـاوار لە دەست حـەڵقـەی زولفت کـە هـەمیشـە دڵان ئـەسیر دەکـا و نـاڵەی لێ دەبیسرێ، بەڵێ وایە ئیرادەی شاهان هەمیشە غەوغا و هەڵڵای تێدایـە. (حـوسنی تـەعلیلی تێدایە).

(١٨) واتە: وەفایی کارت بە زولف چییە؟ ها دەم ماچی بکە، لایەنگری ڕابواردنی هەمیشەیی بە، تەمەنی ئەم دونیا فانییە.

(١٩) غەوسەلئەعزەم: شێخ عەبدولقادری گەیلانی. غەوسی سانی: پیری شەمزینی.
واتە: وەکوو گوڵ بە بای بەهەشتی دەپشکوێ، سەد دڵیش بە تۆ گەشاوە، پێم‌وایـە نـەفەسی گیانبەخشی حەزرەتی غەوسی سانییە وا عالەمی گەشاندەوە.

(٢٠) واتە: شێخ عوبەیدیللا جێنشینی بە حەققی غەوس و نەجاتدەری خەڵکە، تۆو و تۆرمەی لە تاها و یاسینە و نەوبەری باغی گەیلانییە.

(٢١) واتە: بریسکانەوەی دڵی شێخ عوبەیدیللا ڕووناکی قەلبی عارفانە هەروەکوو کێوی توور کە هەرچی کلەی سوبحانییە لەوێوە دێ بۆ ڕووناکی چاو.

(٢٢) واتە: جەددی خۆی کە ئەکاتە «شێخ عەبدولقادری گەیلانی» فەرمووبەتی پێم لەسـەر ☞

**[ ٩٩ ]**[١]

**دڵی دێوانـــە لەســـەر زولفـــی لە عـــالەم بـــەرییە**
**قەد ڕەهـايی نـيیە لەو داوە کـە بـەستەی پـەرییە**[٢]
**بـە وەفـابە کـە دەشـمکوژی بـە مـیهرم وەرە سـەر**
**دا نەڵێن عـاشقی بـێ‌مـیهر و وەفـا سـەرسەرییە**[٣]
**چـت لە دڵ داوە عـــەزیزم وەرە نـــێو دیـدەیی مـن**
**دڵ هەموو ئاورە، چـاو مـەنزەرەیی دوو دەریـیە**[٤]
**چـــاوی بـــیماری تـــەبیبی هـــەموو دەردی دڵمـە**
**غـــەمزە دەرمـانییە، پـەیکانی مـوژە نـەشتەرییە**[٥]

---

☞

شانی هەموو ئەولیاکانە (قدمي هذا على أكتاف الأُولياء)، تۆش کە نەوەی و جانشینی ئەویت پادشایت و جێت لەسەر چاوانە.

**[ ٩٩ ]**

(١) کێشی شیعر: «فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن» بەحری ڕەمـەلی مـوسەممەنی مـەخبوونی مەحزووف. ڕەدیف: یە. واژەی قافیە: بەری، پەری، سەرسەری، و...

(٢) بەری: بێ‌بەش. بەستەی پەری: شێت.

واتە: دڵی شێتی من لەسەر زولفی یارە لە دونیا بێ‌بەشە و ڕەهایی نابێ چونکە پەری شێتی کردووە.

ئیهام لە پەریدا هەیە.

(٣) واتە: هەندێ وەفات هەبێ ئەگەر دەمکوژی بە میهرەوە سـەرم‌ببڕە بـا نـەڵێن عـاشقی بێ‌میهر و وەفا بێ‌عەقڵ و شێتە.

تەلمیح و ئیهام هەیە لە میهر و وەفادا. حافز دەڵێ:

ما قصەی سکندر و دارا نخواندەایـم       از ما بەجز حکایت مهر و وفا مپرس

(٤) واتە: ئازیزم کارت بە دڵم نەدابێ وەرە نێو چاوم، دڵ ئاورە بەڵام چاوم وەك بـاڵەخـانەی دوودەری وایە لەوێوە سەیری دونیا بکە.

(٥) واتە: چاوی نەخۆشـی دوکـتۆری دەردی مـنە (پـارادۆکسـە) غـەمزە دەرمـانەکـەیەتی، موژەشی نەشتەری ئەو دوکتۆرەیە.

**قامەتی تۆ کە گوڵ و بەی بەری بێ، بێ بەری بێ**
**بۆچ دەڵێن ئیدی سنەوبەر بەری بێ بێبەرییە؟(٦)**
**بۆیە سووتاوم ئەمن عاشقی بەدناوم ئەمن**
**دڵەکەم غەمزەدەیی غەمزە و نازی پەرییە(٧)**
**ڕوو بە ئەبرۆتە ئەگەر بۆچی دڵ ئازارە موژەت؟**
**ئەهلی قیبلە عەجەبا وا ڕەوشی کافرییە(٨)**
**سەروی گوڵزاری «وەفایی»یە کە گوڵزاری جەمال**
**خەندەگوڵ، گوڵ بەرییە، هەم گوڵە هەم گوڵپەرییە(٩)**

---

(٦) من پێم وایە ئەم بەیتە بەمجۆرەیە:
قامەتی تۆ کە گوڵ و بەی بەری بێ، با بەرییە
بۆچ دەڵێن ئیدی سنەوبەر لە بەری بێبەرییە؟
واتە: ئەگەر قامەتت گوڵ و بەهێ بەرەکەی بێ دیارە بەری هەیە ئەی بۆ دەڵێن سنەوبەر بەروبوومی نییە؟
تەشبیه ، تیکرار و حوسنی تەعلیلی تێدایە.
(٧) واتە: بۆیە من سووتاوم عاشقێکی بەدناوم دڵەکەم عاشقی ناز و غەمزەی پەرییە.
(٨) واتە: موژەت هەرچەند ڕووی لە قیبلەی برۆتە کەچی بۆ وا ڕەوشتی کافرییە و ئازار ئەدات.
هەندێ مژۆڵ کە هەڵدەگەڕێنەوە و ڕوو دەکەنە برۆ جوانییەکی بێحەد بە چاو دەدەن.
(٩) واتە: یار سەوڵی گوڵزاری وەفاییە لە جوانیدا، پێکەنینی گوڵە سەمەری هەر گوڵە و ناویشی گوڵپەرییە.

**[ ١٠٠ ]**[(١)]

**کار و پیشەی ئەم دڵەم چبکەم خودا هەر زارییە؟**
**سەیلی فرمێسکم وەکوو جۆگە لە چاوم جارییە**[(٢)]
**سەروە یا شمشادە؟ یاخۆ عەرعەرە، یانارەوەن؟**
**یا چنارە یاکە تووبای قامەتی دڵدارییە؟**[(٣)]
**نوختەیی ئایاتی قورئان، یا نە هیندووی خەتتی تۆ**
**یا سەوادی عەینە، یاخۆ خاڵی سەر ڕوخسارییە؟**[(٤)]
**بێ قسە وەختی تەبەسسوم سەد هەزارانی دەکوشت**
**یا نە غیلمان، یا پەری، یا حوورە، یا گوڵزارییە؟**[(٥)]
**مات و حەیرانم کە بۆچ ئەمڕۆ دەمی هێنا ئەمە**
**یا نە تەئسیری فوغانە، یا نە وەعدەی پارییە؟**[(٦)]

---

**[ ١٠٠ ]**

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن» بەحری ڕەمەلی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیف: یە. واژەی قافیە: زاری، جاری، دڵداری، و...

(٢) ئەم گوڵە: دەبێ وانەبێ دەنا مانا نابەخشێ یان بە مانای چاوی خۆی بێ. یان «ئەم دڵەبێ».
واتە: کار و پیشەی من هەر گریانە و سێڵاوی فرمێسکم وەك جۆبارە.

(٣) سەرو، شمشاد، عەرعەر، نارەوەن، چنار و تووبا: داری ڕاستن باڵای یاریان پێ دەشوبهێ.
موراعاتی نەزیری تێدایە، باڵای یارە یان ئەم دارانە؟

(٤) واتە: ئەرێ خەتی ڕوخساری تۆ نوختەی ئایەتی قورئانن یان خەڵکی هیندین؟ ڕەشی چاوتە یان خاڵی ڕوخسارتە.

(٥) بێ قسە: بێ درۆ، بێ زیدەڕەوی. غیلمان: کوڕانی بەهەشتی. حوور: ژنانی چاوڕەشی بەهەشتی.
واتە: کاتێ بزەی دێتێ ئەگەر درۆی نەبێ یان بێ ئەوەی قسان بکا هەزاران نەفەر دەکوژێ، ئەرێ ئەمە بەهەشتییە یان خەڵکی وڵاتی گوڵزارە؟
«تەجاهولولعاریف»ی تێدایە.

(٦) واتە: سەرگەردانم چۆن بوو ماچێکی دامێ یان ناڵە و گریانم ئەسەری کردووە یان قەولی پارەکەیە ئەمساڵ وەفای کردووە.

**زەخمی ناسۆری قەرارە، یا نە ئێشـی خـەنجەرە؟**
**یا خەدەنگی چاوی بیمارت لە جەرگم کـارییە؟**(٧)
**دەنگی قووقووی قومرییە، یاخۆ سەڵای شـیوەنە؟**
**دەنگ و نەغمەی بولبولە یـا نـاڵە نـاڵی تـارییە؟**(٨)
**ئەشکی دوو چاوی «وەفایی» سوورە جارێ ئاوییە**
**چونکی لێوی لەعلە گەردەنبەندەکەی مرواریيە**(٩)

---

(٧) زەخمی ناسۆری قەرار: برینی کۆنی وادە و وەعیدە.
واتە: ئەرێ برینی وادە و قەراری بـەدی نـەهاتووی یـارە لە جـەرگم کـاری بـووە یـان تـیری خەدەنگی یار و خەنجەرە؟
تەشبیهی تێدایە.
(٨) قووقوو: دەبێ کووکوو بێ، ناوی دەنگ (اسم صوت)ی پێدەڵێن بۆ قومری دەگوترێ.
واتە: ئەرێ دەنگی قومرییە دێ یان شیوەنی عاشقەکانی ئەوە، ناڵە ناڵی عاشقانە یان دەنگی تاری یارە دێ.
تەئسیری لەم شیعرەی نالی وەرگرتووە (یا ناڵە ناڵی ناڵییە؟).
(٩) واتە: بۆیە فرمێسکی وەفایی جارێ سوورە و جارێ شینە، وە ئەم سوور و شینەش لەبەر لێوی سوور و ملوانکە شینەکەی تۆیە.
حوسنی تەعلیلی تێدایە.

[ ١٠١ ][1]

فــەرەنگــی مــیللەتێ، کــافر دڵێ، ئــەگــریجە تــەرسایێ
مەلایك سوورەتێ، ئـاهوو خـەرامـێ، مـاه سـیمایێ[2]
پەری پەیکەر بوتێ، گوڵ پەرچـەمێ، زنـجیر گـیسوویێ
شەکەر لەب، نازەنینێ، عیشوەسازێ، سـەرو بـاڵایـێ[3]
نیگارێ، توندخوویێ، سەرکەشێ، عاشقکوشێ، شۆخێ
گوڵەندامێ، دڵئارامـێ، سـەمەنبەر، دیـدە شـەهلایێ[4]
بە دوو زولفان ڕەسەنبازی، بە دوو ئـەگـریجە تـەننازی
بە دوو چاوان سیحرسازی، بە دوو لێوان مـەسیحایێ[5]
کەمان ئەبرۆی پەیوەستێ، لە عیشوەی نێرگسی مـەستێ
کە سەهمی خستە نێو شەستی نران هەریەك لەسەر لایێ[6]

---

[ ١٠١ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: تەرسایێ، سیمایێ، باڵایێ، و...
تێبینی: تا بەیتی حەوت هەر سیفات و ئیستیعارات و کینایاتە لە یار و بەیتەکان مەعنایان نییە، باشتر بڵێم موبتەدای بێ خەبەرن، جا بۆیە هەر مانای وشەکان لێ دەدەمەوە.
(٢) فەرەنگی: ئەورووپایی، غەیرە دینی. ئەگریجە: قژی لای کوڵم. تەرسا: مەسیحی. ئاهوو خەرام: وەك ئاسك ڕۆیین.
(٣) پەرچەم: زولف. گیسوو: پەلکە. عیشوەساز: بە ناز و کەڵەكباز. سەروباڵا: باڵابەرز.
(٤) نیگار: یاری جوان. توندخوو: تووڕە. سەرکەش: سەربزێو، نافەرمان. سەمەنبەر: مێوەی گوڵی سەمەن. شەهلا: چاو جوان.
(٥) ڕەسەن باز: سیحرباز، تەنافباز. لێو مەسیحا: بە لێو مردوو زیندوو کەرەوە.
(٦) ئەبرۆی وەك کەمان پـەیوەستە. نـێرگسـی مـەست: چـاوی خـوماری یـار. سـەهم: تـیر. شەست: جێگەی تیر لە کەواندا. هەریەك لە لایەك نران تیرەکانی، «خران» بایە باشتر بوو.

هەڵیدا دای لە جەرگم، خستمی قـەسدی سـەری کـردم
شەهیدی "کەربەلا" من بووم، ئەسیری دەستی تەرسایێ(٧)
شکاندی سەددی ئیمان، پشتی دیـن دەسـتی تـەوانـایێ
حیجابی ئابڕوو، تۆبەی «وەفـایی» سـیدقی مـەولایێ(٨)
دەخیل ئەی هەمجەلیسان، ئەی ڕەفیقان، خزمە تا مـاوم
بە هەر نەوعێکی بۆ خۆتان دەزانـن بـۆم بکـەن ڕایـێ(٩)
هەموو عومری عەزیزم سـەرفی دەردی ئـینتیزاری بـوو
بەسەر وەختی «وەفایی» داخۆ دێ ئەم شۆخە یا نایێ(١٠)

---

(٧) واتە: تیرەکەی هاویشت لە جەرگی دام لە جێدا خستمی، کەوابوو من شەهیدی کەربەلام کە بە دەست مەسیحایەکەوە کوژراوم، (یانی: مەزلوومانە کوژراوم).

(٨) واتە: ئیمانم کە دەتگوت سەددە، دەستی تەوانایی ئەو پشتی دیـن و حـیجابی ئـابڕوو و مەولایی و سەروەرییەکەی شکاندم.

دەستی تەوانایی ئیزافەی ئیقترانییە. پشتی دین: ئیزافەی ئیستیعارییە. حیجابی ئابڕوو: ئیزافەی تەشبیهییە. تۆبەی وەفایی: ئیزافەی تەخسیسییە. لەم شیعرەدا سیفەتی ئیستیخدام هەیە.

(٩) ڕا: تەگبیر. هەمجەلیس: هاونشین.

واتە: دەخلیتان بم ڕەفێقان هەتا ماوم بە هەمووتانەوە تەگبیرێکم بۆ بکەن.

(١٠) واتە: تەواوی تەمەنم لە چاوەڕوانی یاردا ڕابوورا بڵێی ئـەو شـۆخـە جـارێ بـپرسێ لە وەفایی یان نەیێ؟.

[ ١٠٢ ](١)

سـەحەر مـەستانە ڕابـوردم بـە بـەر دەرکـی کـلیسایێ
کـەچی دەسـتی دڵی گـرتم خـەرامـان بـەچچە تـەرسایێ(٢)
ئـیرەم بـوو عـەنبەری زولفـی، ئـەسیری چـەنبەری زولفـی
کـەراماتی سـەری زولفـی بـە هـەر تـایێ مـەسیحایێ(٣)
بـە دوو زولفـی مـوژەی هـەستان، لەسـەر مـوڵکی دڵم وەسـتان
نـیزامـی چـین و تـورکستان ڕژان بـەربوونە یـەغمایێ(٤)
نـیگاری دڵسـتانی مـن، خـوماری دا بـە جـانی مـن
تـەبیبی حـاڵزانـی مـن، نـەخۆش بـوو، شـەربەتی دایـێ(٥)
ئـیشارێکـی بـە چـاوان کـرد، بـرۆی هـەمباشی تـورکان کـرد
دڵمـیان تـیرەباران کـرد کـەمانداران لە هـەرلایێ(٦)

---

[ ١٠٢ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: کلیسایێ، تەرسایێ، مەسیحایێ، و...

(٢) واتە: کاتی بەیانی بە بەردەرکی مزگەوتێکی مەسیحیاندا ڕابوردم کەچی منداڵێکی مەسیحی دڵی گرتم لە بۆ خۆی و عاشقی بووم.

(٣) واتە: بۆنی زولفی لە باغی بەهەشت دەچوو، زولفی کەڕاماتی بوو هەر تاڵێکی بۆ شیفای مردوان مەسیحایەك بوو.

(٤) واتە: زولف و موژەی هەستان و لە سەر دڵم ڕاوەستان دەتگوت عەسکەری چین و تورکستانن دەستیان کرد بە تاڵانگەری.

(٥) واتە: یاری من ڕۆحی منی خومار کرد، ئەو تەبیبە حاڵزانە زانی دڵم نەخۆشە شەربەتی پێدا.

(٦) هەمباش: شەریك.

واتە: ئیشارەی کرد بە چاوی و برۆی کردە شەریکی تورکانی چاوی بۆ تاڵانکردن و دڵی منیان لە هەموولاوە دایە بەر تیر.

سەبا زولفی پەرێشان کرد بە ڕوخساری عەرەقناکی
چە شیرینە لەگەڵ یەکدی مەه و پەروین کە شەو دایێ!(٧)
پەرێشان زولفی زوننارى، درەخشان ڕوویی گوڵناری
لە زاری گوڵ شەکەر باری، کە ئەی مەجنوونی لەیلایێ!(٨)
وەرە بڕوانە مەیخانە، چ مەعموورە چ وێرانە!
لە هەرلایێ دڵئارایێ، لە هەر گۆشێکی شەیدایێ!(٩)
کە دەستم داوەری دڵ بوو، نە دڵ بوو گوڵشەنی گوڵ بوو
هەموو نەسرین و سونبول بوو، قەرەنفول نەخلی تووبایێ(١٠)
لە جێگایی تەجەللا دەم بە دەم بێ «لَنْ تَرانِي» بێ
بە قوربانی دڵی عاشق هەزار وەك تووری سینایێ(١١)
سروشکم هاتە خوارێ، دوور لە چاو و گەردنی ساقی
بەسەر حەوز و فوارەی عاشقان ئاخ جام و مینایێ(١٢)

---

(٧) واتە: بای سەبا زولفی تێکەڵی ئارەقی گەردنی کرد کاتێ شەو دادێ وەك زولفی، چەند جوانە مانگ و ئەستێرە تێکەڵ بن وەك ئارەق و ڕوخساری یار.
(٨) مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی پاشەوەی دێ.
(٩) واتە: زولفی وەك زوننارى و کوڵمی وەك گوڵناری و لە دەمی شەکەر دەباری و دەیگوت ئەی مەجنوونی شەیدا وەرە بزانە مەیخانە، چ ئاوەدانەکان و چ وێرانەکان لە هەر لایەك مەعشووق و لەیلایەکی لێ ڕاوەستاوە.
(١٠) واتە: کە دەستم برد گوڵم کەوتە بەر دەستی، گوڵ نەبوو گوڵشەن بوو تەواوی نەسرین و قەرەنفول و سونبول و داری تووبا بوون.
ئەم شیعرە خاڵی لە مەفاهیمی عیرفانی نییە.
(١١) واتە: ئەگەر جێگای دیداری واژەی «لَنْ تَرانِي = قەت نامبینی» تێدا نەبێ هەزار تووری سینا بە قوربانی دڵی عاشق بێ.
مەولەوی فارس دەڵێ:
چو رسی به طور سینا أَرِنِي مگو و بگذر     که نیرزد این تمنّا به جواب «لَنْ تَرانِي»
(١٢) واتە: دوور لە چاو و گەردنی یار فرمێسکم هاتەخوار، ئاخ لەسەر ئەو حەوز و فوارەی

**جــەماڵی مــوتریبم کــەوتۆتــە یــاد کــوا نــەغمەکــەی تــاری**

**هــەوای خــورشید ئــەوا ســووتاندمی، ئــاخ بــۆ کــزەی بــایێ![١٣]**

**مــوغەننی کــوانــێ ئــاهەنگی حــیجاز و بــەربەت و چــەنگی؟**

**سێ‌تای موتریب سەدای بۆکەوت؟ لەبەرچی دەنگی نەی نایێ؟[١٤]**

**بە لەهجەی دەنگ و ئاوازت، بــە شــوعلەی زەخــمەکــەی ســازت**

**مــەداری ئــاو و ئــاور بــووم، ئــەمان مــوتریب مــودارایــێ[١٥]**

**بە شــەوقی ئــاتەشی ڕووی تــۆ، بــە بــادەی چــاوی جــادووی تــۆ**

**ســەرا پــا بــوومە کــۆی ئــاور، ئــەمان ســاقی ســەراپــایێ[١٦]**

---

☞

ئاشقان پیاڵەیێ شەرابم هەبوایە بینۆشم.

(١٣) واتە: جوانی ساز لێدەرم بیر کەوتۆتەوە کوانێ دەنگی تارەکە؟ بۆم لێدەن. گەرمای هەتاو سووتاندمی، ئاخ کزەیێ بای فێنك لای یارەوە بێ.

هاتیفی ئەسفەهانی کە زۆر لەگەڵ وەفایی فاسیلەی عومرییان نەبووە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| هــاتف اربــاب مــعرفت کــه گــهی | مست خــوانــندشان و گــهْ هشــیار |
| از مغ و مـطرب و شـاهد و سـاقی | و ز می و مـطرب و شـاهد و زنـار |
| قـصد ایشـان نـهفته اسـراری است | کــــه بــا ایــما کــنند گــاه اظـهار |
| پــی بــری گــر بــه رازشـان دانـی | کــه هــمین است ســر آن اســرار |
| که یکی هست و هیچ نیست جز او | وحــــــده لا إله إلّا هـــــو |

(١٤) حیجاز: ئاوازێکی موسیقی دەزگای «شوشتەری»یە.

واتە: ئەی ساز لێدەر بۆ دەنگی مەقامی شوشتەری و شمشاڵ و سێ‌تات نایە.

(١٥) واتە: من بوومەتە هێڵ و مەداری ئاو و ئاگر تۆش بە نەغمەی چەنگ و دەنگی خۆشت لەگەڵم مودارا بکە و بۆم‌لێدە.

لە نێوان مەدار و مودارادا جیناسی ئەفزایشی هەیە.

(١٦) واتە: ساقی تۆ خودا هەستە سەر پێ و دەورێ دیکە تێکە بە شەوقی ئاگری ڕوخساری تۆ و بە بادەی چاوی جادووگەرت سەراپا بوومەتە ئاگر.

لەبـــەر تـــاوی جـــەماڵی عـــالەمی مـــومکین بـــوو ئـــارامـــم
دەســـووتام ئـەز ئـەگـەر سـایەی سـەری زولفـی نـەبوویایێ[(١٧)]
بـــە گـــریانی دڵی مـــن هـــاتە ڕەحـــم و پـــێکـــەنی فـــەرمووی
مـــەحاڵ بـــوو خـــەندەیی ســـاغر ئـــەگـەر مینا نـەگـریایێ[(١٨)]
ئـــەمان شـــۆخـــی خـــەرابـــاتی! کـــە بـــۆ دیـــن و دڵ ئـــافاتی
بـــفەرموو بـــۆچ کـــەتۆ هـــاتی لە مـــن دەنگ و ســـەدا نـــایێ![(١٩)]
بـــە ئـــاب و تـــابی ڕوخســـارت «وەفـــایی» وا مـــەسووتێنـــە
خـــودارا! ئـــەی چـــراغـــی دیـــدە! بـــۆ پـەروانـە پـەروایـێ[(٢٠)]
«وەفـــایی» مـــاوە دەستبـــەردان، لە دەوری نـــوقتە سـەرگەردان
ئـــەمان یـــا قـــوتبی ڕەبـــبانی، مـەدەد یـا شـای بـوخارایـێ![(٢١)]

(١٧) واتە: ئارامی من لەبەر شەوقی جوانیی جیهانگیری ئەو ڕوخسارەدا بوو، بەڵام سێبەری زولفی تۆ نەبوایە ئەو تاوە دەی سووتاندم.

(١٨) ساغر: پیاڵە. مینا: شووشەی شەراب.

واتە: دڵی بە گریانی من هاتە سەر بەزەیی و گوتی هەتا مینا نەگری و قوڵپەی نـەیێ پیاڵەی شەراب پێ ناکەنێ.

حوسنی تەعلیل و تەشبیهی تێدایە جگە لەوەی شاهکاری ئەدەبی عیرفانییە.

(١٩) واتە: ئەرێ شۆخی مەیخانەیی کە هۆی ئافەتی دڵ و دینی منی بۆچی کە تۆ هاتی من ناتوانم هیچ بڵێم.

(٢٠) خودارا: بۆ خاتری خودا، ئەم وشەیە فارسییە.

واتە: وەفایی بە ئاو تاوی ڕووت مەسووتێنە لەبەر خاتری خودا ئەی چرا نیسبەت بە پەپوولە کەمێ ترس و پەروات هەبێ.

(٢١) واتە: وەفایی دەستبەرداو ماوە و سەرگەردانی قوتبی دائیرەیە ئەی شاهی بوخارا (مەبەست شێخ عوبەیدیللا، یان عوبەیدیللای کاشغی)یە کۆمەکییە کم بکە.

لەم بەیتەی ئاخرەوە دەردەکەوێ کە شیعرەکە سەراپا عیرفانییە.

## [ ١٠٣ ][1]

| | |
|---|---|
| هـــەتا ڕۆژی قــیامەت دێت و نــایێ | لە دووری نامە شەرحــی مــاجەرایــێ[2] |
| لە ئــاه و نــاڵەیـی پـەروانـە خـەوفێ | کە تۆ بگرێ خودا ئەی شەم بە بـایێ[3] |
| دەمت دەرمان، تەبیب تۆ، مـن بـریندار | دەسا بـۆ حـاڵی مـن تـەدبیر و ڕایـێ[4] |
| لەسەر گەنجی ڕوخت ڕەشماری زولفت | لەبۆم هاتن بە دەو هەر یـەك لە لایـێ[5] |
| بــرینداری هـەوای جـیلوەت شـەهیدە | ئەمان ساقی بە مـەرگی مـن سـەمایێ[6] |
| هــەموو دەم ڕوو لە مـیحرابـی بـرۆتـم | ئیلاهی کەی ئیجابەت کەی دوعایێ؟[7] |
| بــە یـادی تـاقی مـیحرابـی بـرۆی تـۆ | «وەفایی» چوو لە گۆشەی خـانەقایێ[8] |

---

**[ ١٠٣ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن فعولن» بـەحری هـەزەجی مـوسەددەسی مـەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: نایێ، چرایێ، بایێ، و...

(٢) واتە: هەتا ڕۆژی قیامەت دێت شەرحی ماجەرای دووری من تەواو نابێ.
لە نێوان دێت و نایێدا تەزاد هەیە.

(٣) واتە: ئەی شەمع لە ناڵە و فوغانی پەپوولە پەروایەکت هەبێ و لە خوا بترسە نەوەك خودا ئەتۆ بگرێ بە بایەك و حەقت لێ بسێنێ و بکوژێیتەوە.

(٤) واتە: من بریندارم تۆ دوکتۆری دەمت دەرمانە دەکەوابوو تەگبیرێ بۆ حاڵی من و ماچێ لە دەمتم بدەرێ.
حوسنی تەڵەبی تێدایە.

(٥) واتە: ڕەشماری زولفت دەوری گەنجی ڕوخسارتیان داوە هەرکام لەلایەکەوە بۆم هاتن. دەڵێن لەسەر هەر خەزێنەیەك مارێ خەوتووە.

(٦) واتە: هەرکەس بریندارى لارو لەنجەی تۆ بـێ دەرەجـەی شـەهادەتی هـەیە سـاقی تـۆ مەرگی من هەستە سەمایی بکە با منیش شەهید بم.

(٧) واتە: بە دایمە ڕووم لە میحرابی بـرۆی تـۆیـە بـەشکم خـودا لە ژێر مـیحرابـی بـرۆتـدا دوعاکەم گیرا کات.
تەلمیحە بە ئایەی «ادعوني أستجب لكم»

(٨) واتە: بە یادی میحرابی برۆی تۆ بوو وەفایی گۆشە نشینی خـانەقا بـووە. یـان: گـۆشـەی خانەقای چۆڵ کرد.

[ ١٠٤ ][1]

ئـەرێ خـەبیبی ڕەوانـم تـەبیبی دەردی جـودایـی
«چنین تو عهد شکن یار شوخ دیـده چـرایـی؟»[2]

دڵێکه داومـه بـه زولفت فـیدای غـەمزەیی تـۆ بـێ
«که در کمند تو خوش‌تر عزیز مـن کـه رهـایی»[3]

له تـاوی دەردی فـیراقت نـەماوه ڕۆح له بـەدەندا
«طـمع بـریدەام از جـان مگـر تـو بـاز بـیایی»[4]

هـەمیشه بـۆیـه دەنـاڵم بـه ئـاه و نـاڵەیـی بـولبول
«دمی چو غنچه بخندی و همچو گل بەدر آیـی»[5]

نـەسیمی بـاغی گـوڵه یـا عـەبیر و عـەتره دەبـارێ
«تـویی شکـر شکـنی یـا ز زلف نـافه‌گشـایی؟»[6]

---

[ ١٠٤ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلاتن» بەحری موجتەس «مجتث»ی موسەممەنی مەحزووف. ڕەدیفی نییە. واژەی قافیە: جودایی، چرایی، ڕەهایی، و...

**تێبینی:** ئەم غەزەلە «مولەممەع»ە واتە: بە دوو زمانی کوردی و فارسی گوتراوە.

(٢) واتە: ئەرێ خۆشەویستی ڕۆحم دوکتۆری دەردی دووریم، بو هێندە چاوباز و پەیمان شکێنی؟

(٣) واتە: دڵم داوە بە زولفت تا فیدای ناز و کرێشمەی تۆ بێ، چونکا ئەسیری کەمەند و زنجیری تۆ لە ئازادی خۆشترە.

(٤) واتە: لە حەسرەت دەردی دووریت ڕۆحم لە بەدەندا نەماوە بە هیوای گیانم نیم مەگەر تۆ بێی و گیانم بهێنیەوە بە بەدەنمدا.

(٥) واتە: بۆیە دایمە وەك بولبول دەناڵێنم تا ئەتۆ وەکوو غونچەگوڵ پێبکەنی و وەکوو گوڵ خۆت نیشان بدەی.

(٦) واتە: ئەرێ ئەوە بای باغی گوڵە دێ یا عەتر و عەبیر دەبارێ، ئەتۆ قسان دەکەی یان زولفت بە شانە دەکەی. واتە: ئەم بۆنە خۆشە بۆنی زاری تۆیە، یان بۆنی زولفی کراوەتە؟ «تەجاهولولعاریف» و تەشبیهی مورەککەبی تێدایە.

**بە چیهرە باغی گوڵانی، بـە خـەندە زەوقـی دڵانـی**
**«مگر تـو شـاخ نـباتی، گـل بـهشت خـدایـی؟!»(٧)**
**بڵا بـە جـیلوە نـەنازن غـوڵام و حـۆری بـەهەشتی**
**«خدای را چه شود گـر جـمال خـود بـنمایی؟»(٨)**
**بە غەمزە کوشتمی چاوت عیلاجی دەردی نەفەرموو**
**«بـیا کـه صـد گـله دارم ز آهـوانِ خـطایی»(٩)**
**دڵت شکاوە چ قەوما خیلافی عـەهدی مـەحەبەت**
**«خدانکـرده چـه دیـدی ز دوسـتیِ «وفـایی»؟»(١٠)**

**[١٠٥](١)**

**تـا نـەرگسی تـۆ نـازی هـەبێ غـەمزە نـومابێ**
**شـەرمەندە ئـەبێ چـینییە ئـاهوویی خـەتابێ(٢)**

---

(٧) واتە: ئەرێ تۆ شاخی نەباتی یان گوڵی بەهەشتی خودای کە بە ڕوخسار لە گوڵ دەچی و بە خەندە دڵ دەڕفێنی؟.

(٨) واتە: دەبا حۆران و غوڵامانی بەهەشتی هێندە بە جوانی خۆیان نەنازن، تۆبی و خودا چ دەبێ کەمێ خۆت پیشان بدەی.

(٩) واتە: چاوت کە وەك ئاسکی خەتایین منیانکوشت و دەرمـانیان نـەکـردم، زۆرم گـلەیی لێیان هەیە.

(١٠) واتە: ئەرێ دڵت بۆ شکاوە من خیلافی وادەم کردووە یا خودا نەخواستە لە دۆستیی وەفاییدا شتی خراپت دیوە؟

**[١٠٥]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەحزووف. ڕەدیف: بێ. واژەی قافیە: نوما، خەتا، عیتا، و...

(٢) نەرگس: ئیستیعارە لە چاوی یارە. چینییە ئاهووی خەتا: ئاسکی سەرزەوی خەتا لە وڵاتی چین.

**ئەی خوسرەوی خووبان بـە دوو لێوی شـەکـەرینت**
**شـــیرین نـــییە فـــەرهاد بکـــوژی تـۆ بـە عـیتابێ[٣]**
**ســـەبزەی دەمـتە داویـە شکـەست خـەتی ڕێحـانی**
**خـــەتێکـــە غـــوباری کـــە بـــە یـاقووت کشـابێ[٤]**
**حـــەیرانـــی دەم و ســـەبزەیی نـەوخێزی لەبـی تـۆم**
**بـــێ نـــوکتە نـییە قـەت خـەتی ئـایاتی خـودابـێ[٥]**
**ســـووتاوە دەروونـــم لە غـــەمی غـەمزەیی جـانان**
**مـوتریـب بـڵێ، سـاقی بـە کـەرەم بـێنـە شـەرابـێ[٦]**
**خـــوێنـــی دڵی ڕشـــتم لە هـــەوا دڵ نـــەبوو خـاڵی**
**عـــاشق بـــە خـودا وایـە وەکـوو مـن بـە وەفـابێ[٧]**

---

☞

واتە: تا چاوت بە ناز و غـەمزە بـنوێنـی ئـاسکی شـاری خـەتای وڵاتـی چـین شـەرمەندە و خەجاڵەت دەبێتەوە. (تەشبیهـ و تەفزیلی تێدایە).

(٣) واتە: ئەی پادشای چاکان جوان نییە بە دوو لێوی شەکەرینت و بە توڕڕەیـی فـەرهادی عاشقی خۆت بکوژی.

لە نێوان خوسرەو و فەرهاد و شیرین و شەکەردا موراعاتی نەزیر هەیە. لە شیریندا ئیهام هەیە.

(٤) واتە: خەتی سەوزی دەمت (وردە مووی دەوری دەمت) شکستی بـە خـەتی ڕێحـانی داوە، ئەوە خەتە تەنانەت یاقووتی خەتخۆشیش ناتوانێ بینووسێ.

لە نێوان یاقووت و ڕێحان و خەتدا موراعاتی نەزیر هەیە.

(٥) سەبزەیی نەوخێز: وردە مووی دەموچاو.

واتە: سەرگەردانی ئەو سەبزەی ڕوخساری تۆم، بێ‌دەلیل نییە خەتی ئایەتی خودایە.

(٦) واتە: من دەروونم لە غەمزەی یاردا سووتاوە، ئەی سـازلێدەر بـە سـاقی بـڵێ کـەرەمکا جامێ بدا بە من.

(٧) واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە خوێنی دڵی ڕشتم، دڵم هەر لە هـەواداریـی و عـەشقی خـاڵی نەبووە، دەبێ عاشق ئاوا وەفاداربێ و هەر هەواداربێ.

حــــوسنت بـــە لەتــیفی قـــەد و شــیرینیی زارت

قـــەد بـــاغی ئــیرەم دارە گــوڵێکــە گـوڵی نـابێ[٨]

تــۆ هــەر بــە جــەفا مـەیلی «وەفـایی»تـە عـەزیزم

مەعشووقە دەبێ هەم بـە وەفـا هـەم بـە جـەفا بـێ[٩]

[ ١٠٦ ][١]

شەرحـی دەردی ئـارەزوومەندی لە کـەس تـەئسیری نـابێ

ئەو کەسەی دەردم دەزانێ گەر لە یاری خـۆی جـودابـێ[٢]

ئـــەی بـــرادەر خـــانەوێرانـــی، جــودایـــی بــۆ وەفـــایی

وەك وەفایی ئـەی جـودایـی یـاخودا خـانەت خـرابـێ![٣]

غـــەیری دڵبـەر دەردی دڵ نـاڵێم بـە هـیچکەس تـا بـمێنم

دەردی دڵ بــۆ وەی بــڵێم چـــاکـە بـە دەردم ئـاشنابێ[٤]

---

(٨) واتە: جوانیت و شیرینی دەمت سەلماندوویە باغی بەهەشت گوڵی وای تێدا نییە.

(٩) واتە: تۆ مەیلت هەیە هەر لەگەڵ وەفایی جەفا بکەیت، عاشق دەبێ جـەفاشی هـەبێ و وەفاشی هەبێ.

**[ ١٠٦ ]**

(١) کێشی شیعر: «فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن» بەحری ڕەمەلی مـوسەممەنی سـالم. ڕەدیف: بێ. واژەی قافیە: نا، خەرا، ئاشنا، و...

(٢) واتە: شەرحی دەردی تاسەی من لە کەسدا شوێن بەجێناهێڵێ مەگەر کەسێ وەك من لە یار جودابێ جادەردم دەزانێ.

(٣) واتە: ئەی برایان وەفایی جودایی ماڵی خراپ کرد یا خوا جـودایـی وەك وەفـایی مـاڵت خراپ بێ.

تەشخیسی تێدایە.

(٤) واتە: تا مابم جگە لە یار دەردی دڵ لای کـەس نـاڵێم، دەردی دڵ لای کـەسێك دەکـەم ئاشنای دەردم بێ.

ئـاخر ئـەی سـوڵتـانی خـووبان تـا بـەکـەی نـامیهرەبانی؟
چاکە مـەحروومم نـەفەرمووی: یـا خـیتابێ یـا عـیتابێ[٥]
ڕۆژ و شـەو تـۆ بـوویتە قـوربان شـیوەن و شـینی دڵی مـن
کاری بـولبول فـەسڵی گـوڵ نـاڵـینە تـا ئـاهێکـی مـابێ[٦]
مـەنعی سـووتانم مـەفەرموو بـا وجـوودی ئـەو جـەماڵە
پـیشەیی پـەروانـە هـەر سـووتانە تـا شـەوقی چـرا بـێ[٧]
هەرکەسێکـی گـوڵفـرۆشـە بـاغی پـڕ جـۆش و خـرۆشـە
یـا دەری گـوڵزاری بگـرێ، یـا لە بـولبول بـێ سـەدابـێ[٨]
هەرچی تۆ پێتخۆشە مەحزی ڕەحمەت و مەقسوودی دڵمە
گـەر عـیتابی «لَـنْ تَـرانـي» یـا خـیتابی «أَوْ دَنـا»بـێ[٩]

---

(٥) خیتاب: هەرا لێکردن. عیتاب: جواب کردن و لێتووڕە بوون.
واتە: ئەی یاری نامیهرەبان تۆ کە پاشای چاکانی مەحروومم مەکە یـا هـەرام لێکـە یـان لێم تووڕەبە. مەبەست لە عیتاب «لن تراني» و لە خیتاب «أو أدنی»یە، کە چەند بەیت پاشتر ڕوونی دەکاتەوە.
(٦) واتە: قوربان، تۆ شەو و ڕۆژ باعیسی دەرد و گریانی دڵمی دیارە بولبول کاری ئەوەیە لە فەسڵی گوڵدا هەر بناڵێ.
(٧) واتە: تا جوانی تۆ هەبێ مەنعم مەکە لە سووتان دیارە تا چرا شەوقی هەبێ پەروانە دەبێ هەر بسووتێ.
حوسنی تەعلیلی تێدایە.
(٨) لە بولبول بێسەدا بێ: کاری بەسەر بولبولەوە نەبێ.
واتە: دیارە هەرکەس گوڵ بفرۆشێ ئاگای لە جۆش و خـرۆشـی بـولبول هـەیە، یـا دەرگـای گوڵزارەکەی داخات، یان لە بولبول گەڕێ با هەر پێیدا هەڵبڵێ.
(٩) «لن تراني»: قەتم نابینی. «أو أدنیٰ» یا نزیکتریش. تەلمیح بە ئایەی کێوی تووری مووسا و شەوی میعراجی پێغەمبەرە (د.خ)
واتە: هەرچی تۆ بفەرمووی دڵم پێخۆشە جا بـفەرموو قـەتم نـابینی وەك مـووسا یـان وەك موحەممەدﷺ لە نێوان دوو برۆ لێت نزیکتر بمەوە.

بـۆیـێ سـەر تـا پـا گـوناهم، بـۆیـێ عـاسی و ڕووسـیاهم
تـــا گـــەدا شـــایانی ڕوحـــم و ئـــیلتیفاتی پـــادشابێ[١٠]
دوور لە ئـــەغیار و ڕەقـــیبان عـومری دوسـەد سـاڵە دێنـێ
دەست لە دەستی یار و سەحنی باغ و گۆشەی مـاهتابێ[١١]
ڕەنگ زەرد و لێوبـــەبار و ئـــەشك‌بار و بـــێ‌قـــەرارە
زۆر پـــەرێشـانە «وەفـایی»، وەك لە یـاران هـەڵبـڕابـێ![١٢]

••••••——●——••••••

[ ١٠٧ ][١]

زەدەی ڕووتـــم، بـــە چـــاوی تـــۆ، شـــیفام بـــێ‌لێوەکـــەت نـــابێ
بـــە حـــەقی ئـــابڕووی پـــیری مـــوغان ســـاقی مـــەیی نـــابێ![٢]

---

(١٠) واتە: بۆیە گوناه دەکەم و شەرمەندەم و ڕووڕەش، دەڵێم بەشکم بە گەدایی لیاقەتی لوتفی پادشاهم هەبێ و بەزەیی پێمدا بێ.

(١١) ماهتاب: مانگە شەو، بەڵام بە بۆچوونی من وشەی «ماهتابێ» لێرەدا جێی خۆی نییە و دەبێ «ماء و ئابێ» واتە جۆگە و ئاوێ، بووسرێ، بۆیەش مانای بەیتەکەم هەر بەم شێوەیە لێکدایەوە.

واتە: گۆشەی جۆگە ئاوێك و دەست لە دەستی یاردا دوور لە چاوی بێگانان و ڕەقیبان عومرێکی دوو سەد ساڵە دەهێنێ.

(١٢) واتە: وەفایی بە ڕەنگی زەرد و لێوی بەبار و چاوی بە فرمێـك و بێ‌ئوقرەییەوە زۆر پەرێشانە وێدەچێ لە یارانی جودا بووبێتەوە.

[ ١٠٧ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ڕەدیف: بێ. واژەی قافیە: نا، نا، مینا، و...

(٢) واتە: بە چاوت قەسەم ڕوخساری تۆ منی پێکاوە بێ‌ماچی لێوت شیفام نایێ بۆ خاتری پیری مەیخانە ساقی شەرابێکی سافم بۆ تێکە.

ئـــەتۆش ئـــەی تـــارزەن ســـادەی ســروودێکــی بــە نــەغمەی نــەی
بـــڵا تـــەی بـــێ غـــەم و نـــۆبـــەی ســـرووری جـــامی مـــینابێ[٣]

ئەتۆش دەم دەم بە نەغمەی نەی ئەتۆش خۆش خۆش بە جورعەی مەی
کـــزەی بـــایێکـــی ڕۆحـــانی، نـــەشەی جـــامێکـــی یـــار بـــابێ[٤]

بـــــەقوربانی ســـــەداتـــــم هـــــا بـــــڵێ مـــــوتریب وەرە ســـاقی
نـــــەیستان ئـــاوری بـــەربۆتـــێ، بـــڵا تـــۆفـــان لەســـەردا بـــێ[٥]

لە شـــــەوقی بـــــادە داگـــــیراوە ســـــاقی ڕووی عـــــەرەقناکـــی
وەکـــوو شـــەبنەم لەســـەر گـــوڵ کـــەوتبێ ڕۆژ عـــەکسی لێدابـــێ[٦]

وەرە بـــــــنوارە تـــــــاب و تـــــــابشی زولفـــــی دڵاوێزی
ئـــەگـــەر نـــەتدیوە «عـــرش الله» چـــرای دەیـــر و کـــلیسا بـــێ[٧]

لە تـــــاو ئـــــاوری جـــــەماڵت کـــەی دەزانـــێ حـــاڵی دڵســـۆزان؟
کـــەسێکـــی تـــاوەکـــوو زولفت نـــە شـــێوابـــێ نـــە ســـووتابێ[٨]

---

(٣) واتە: ئەرێ تارزەن سروودێ لێدە بە ئاهەنگی نەی بەشکم دەورەی غەم تەواوبێ و با جامی مینا شادیمان بۆ بێنێ.

(٤) واتە: ئەتۆ موتریب بە نەغمەی نەی ئەتۆ ساقی بە جورعەی شەراب کزە بایەکی ڕۆحی و جامێکی دۆستانە بابێ.

(٥) واتە: موتریب بە قوربانی دەنگت بم هەراکە لە ساقی و پێی بڵێ قامیشەڵان ئاگری تێ کەوتووە تۆفانێ لە مەی بە سەریدا بڕێژە.

(٦) واتە: ساقی لە شەوقی بادە ڕوخساری ئارەقاوی و سوورهەڵگەڕاوە، دەڵەی شەونم لەسەرگوڵ کەوتووە و تیشکی ڕۆژ لێی داوە و دەبریسکێتەوە. سیفەتی تەشبیهی مورەککەبی تێدایە. «لە شەوقی بادە داگیرساوە» جوانترە لە «لە شەوقی بادە داگیراوە».

(٧) واتە: ئەگەر نەتدیوە عەرشی خودایی چرای کلیسای مەسیحی بێ وەرە ببینە تاب و تابشی زولفی یار لەسەر ڕوخساری.

(٨) واتە: کەسێ وەك زولفت شێواو و سووتاو نەبێ نازانێ تاوی ئاوری جەماڵت چۆن دڵی عاشق دەسووتێنێ.

کەناری چاوی هەردەم شانشینی عاشقی ڕووتە
بەڵێ وەك سوورمە وایە هەرچی سووتاوی تەجەللابێ[(٩)]

ئەتۆ بەو چاوە سەرمەستە دەمێکی هەستە ڕاوەستە
ببینم کەی قیامەت دێ؟ بزانم بۆچ مەسیحا بێ؟[(١٠)]

دەڵێن غەم لەشکری کێشاوە، تۆش بەو زولف و خاڵانە
بفەرموو تا شەبیخوونێ لەلای چین و حەبەش ڕابێ[(١١)]

دەڵێن یار دێتەوە، خۆ من بە دەردێکی گران کەوتووم
تەبیبی دەردەداران ئەی خودا بێ، ئەی خودا وابێ[(١٢)]

بە گۆشەی چاو و خاڵی لێو و خاکی کۆی یار نادەم
ئەگەر سەد جامی جەم، ئابی خدر، ئەورەنگی دارا بێ[(١٣)]

لە ڕووم مەحرووم مەبە فەرمووی «وەفایی» عاشقی زارم!
کەسێ زەڕڕێکی ئیمان بێ بەهەشتی لێ حەرام نابێ[(١٤)]

---

(٩) کەناری چاوی: گۆشەی چاوی. هەردەم: هەمیشە.
واتە: بۆ عاشقی ڕووت گۆشەی چاوت هەمیشە وەك تەختی شاهی وایە چونکا هەرچی بە جیلوەی تۆ بسووتێ وەك تووری سینا بۆ کلەی چاو بە کاردێ.
(١٠) واتە: ئەگەر تۆ بەو چاوەتەوە هەستی و ڕاوەستی قیامەت ئەوەیە ئیدی لازم بە هاتنی عیسا و ڕۆژی قیامەت نییە.
(١١) واتە: غەم لەشکری کێشاوە بە سەرمدا تۆش بە زولفت کە وەك لەشکری چینە و خاڵت کە وەك لەشکری حەبەشە، بڵێ با بێن و حەملەیەکی شەوانەم پێ بکەن، یان بە شەوا دیفاعم لێ بکەن.
(١٢) واتە: من بە دەردێکی گران لە جێدا کەوتووم و دەڵێن یار قەرارە بێتەوە، ئەی خودایە ئەو قسە دروست بێ چون ئەو دوکتۆری نەخۆشانە و منیش ئیدی چا دەبمەوە.
(١٣) واتە: ئەمن جامی جەم بە گۆشەی چاوی یار و خاڵی لێوی بە ئاوی حەزرەتی خدر و خاکی دەرکەی بە تەختی پادشاهی دارا نادەم.
لەف و نەشر و تەشبیهی تەفزیلی تێدایە.
(١٤) واتە: فەرمووی ئەی وەفایی! عاشقی زاری من لە ڕووم بێبەش مەبە، کەسێك زەڕڕەیەك

دریغــا ســەروی بــاڵای مــن گــوڵێك بــوو هــات و بــا بــردی
گـــــوڵێکــی وا بــەهار نــاگــرێ هــەتا دونــیا بــە دونــیابێ(١٥)

## [ ١٠٨ ](١)

مـوتریب وەرە دەسـتی مـن و دامـانی وەفـات بـێ
سووتام بە مـەستی مـەیەوە دەنگـی نـەوات بـێ(٢)
ساقی وەرە مەجلیس بـە سـەر و گـەردەنی جـامت
بێ نەغمەیی نەی نامەوێ گەر ئابی حەیات بـێ(٣)
تـۆ گـەنجی جـەمالت هـەیە، مـن عـاشقی ڕووتـم
یەك بووسە چ نابێ کە بفەرمووی بە زەکات بـێ(٤)

---

ئیمانی لە دڵدا بێ بەهەشتی لێ حەرام ناکرێ.
دەکرێ «زار» بە مانای «دەم»بێ. لەوانـەیە زەڕڕە ئـیستیعارە لە بـچووکی دەمـی یـار بـێ کـە هەرواشە. تەشبیهی موزمەری ڕوخساری یار بە بەهەشتی تێدایە.
(١٥) واتە: ئەی حەیف! گوڵێکم بوو باڵای بەقەت سەوڵێك دەبوو بای خەزان بردی دڵنیام بەهار قەت گوڵی وەك ئەوگوڵەی منی بۆ دروست نابێ.

**[ ١٠٨ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئـەخرەبی مەکفووفی مەحزووف. ڕەدیف: بێ. واژەی قافیە: وەفات، نەوات، حەیات، و...
(٢) واتە: ئەی ساز لێدەر دەستم بە دامانت با وەفـابە، مـەستیی مـەی سـووتاندمی دەنگـی ئاهەنگت با هەربێ.
(٣) واتە: ساقی بە شکڵی جامەکەتەوە وەرە مەجلیس ئەگەر ئاوی حەیاتیش بێ بێ نەغمەیی نەی من نامەوێ. واتە موتریب و ساقی لازم و مەلزوومن.
(٤) واتە: تۆ جوانیت بە قەد خەزێنەیەکە و منیش ئاشقی ڕوخسـارتم و هـەژارم، مـاچێ بـە

نـــابێتـــەوە ڕۆژ ئـــیدی ســـەباحی ئـــەمەلی مـــن
بەو گەردنە، هەرتا شکـەنی زولفـی دوتـات بـێ[٥]
دەگـریم و لەگـەڵ ئـاهی دەروون سـۆزی دڵم دێ
وەك بەرقی بەهاری کـە لە عـەینی زوڵمـات بـێ[٦]
قـوربان! کـوتم: ئـاخر بـەسە بـەو زولفـە ئـەسیری
فەرمووی: کە ئەتۆ مورغی‌شەباوێزی، سەدات بێ[٧]
مەنعم مـەکـە مـەستم کـە بـە تـەفسیری جـەماڵت
عاشق ئەوەیە بێ سیفەت و پـەڕتـەوی زات بـێ[٨]
من ڕیند و قەلەندەر سیفەت و مـەست و خـەرابـم
تۆ پیری خەرابـاتی ئـەگـەر مـەزهەبی وات بـێ[٩]

---

☞

زەکات بمدەیەی چ نابێ.
ئیهام لە ڕووتدا هەیە.
(٥) واتە: بە ملتەوە هەتا زولفت وا شکەن بە شکەن و پڕ پێچ و خەم بێ ڕۆژی ئاواتی من هەر هەڵنایێ.
(٦) زوڵمات: تاریکی.
واتە: من دەگریم و لەگەڵ ئاهی دەروونم گڕی دڵم دێتە دەر وەك هەورە بریسکەی بەهاری لە تاریکیدا.
(٧) واتە: گوتم: بەسە، ئەسیری زولفت هەتا کەی؟ فەرمووی: تۆ مەلی بە شەوخوێنی دەبێ هەر دەنگت بێ و بناڵی.
(٨) تەفسیر: شرۆڤە. زات: وجوودی حەق. سیفات: کردەوە و سیفەتەکانی لە تەفسیردا باس دەکرێ.
واتە: من بە جوانی تۆ مەستم، ئاشق ئەوەیە کاری بەسەر زات و سیفاتەوە نەبێ زاتەن عاشق بێ.
(٩) ڕیند و قەلەندەر: ئاشق و ئازا. پیری خەرابات: شێخ و مورشید.
واتە: من عاشقم و تۆ شێخی منی ئەگەر لەسەر مەزهەبی قەلەندەرانی.

**نــەمزانــی هــەتا پــێ‌نـەکـەنی گـوڵبـەدەنی مـن**
**فنجانی لە مـەرجـانی دەبـێ پـڕ لە نـەبات بـێ(١٠)**
**هــەر چـــاوەڕوانـی قـەدەمی تـۆم و ئـەگـەر دێی**
**زوو بێ نەفەسی ئـاخرە، ڕۆحـم بـەفیدات بـێ(١١)**
**هــەستە وەرە لەو جــامی ئــەلەستی بـدە دەسـتم**
**بەستەی دەری گوڵزارە ئەوی مەستی سەفات بێ(١٢)**
**سەد جـار بـچم و بـێم و بسـووتێم حـەقی تـۆیـە**
**هەرچەندە بە شەرعی شەم و پەروانە خەتات بێ(١٣)**
**بۆ ماچێکـی مـەمکوژە، بـە ڕوحـم و بـە وەفـا بـە**
**هەرچەندە بە دینی گوڵ و بولبول حەسەنات بێ(١٤)**
**عەهدێکە لەگەڵ گوڵ کـە بـەبێ مـوتریب و سـاقی**
**تا ئێرە نەچی ئیدی «وەفـایی» دە حـەیات بـێ(١٥)**

---

(١٠) واتە: تا یاری گوڵئەندام پێ‌نەکەنی نەمزانی پیاڵەی دەمی پڕە لە نەباتی شیرین.
مەرجان ئیستیعارە لە ددانی یارە.
(١١) واتە: من چاوەڕوانی هاتنی تۆم ئەگەر دێی بۆ لام لە نەفەسەکانی ئاخری ژیانم دام، ڕۆحم بە فیدات زوو وەرە.
(١٢) واتە: ساقی وەرە و لە جامی ئەلەستم بدەرێ هەرکەس مەستی سەفای تۆ بێ لە دەرکی گوڵزاری ڕوخسارت بەسراوەتەوە و ئەسیرە.
تەلمیحە بە ئایەتی «ألست بربكم قالوا بلىٰ».
(١٣) واتە: ئەگەرچی بە شەرعی شەم و پەروانە سووتانی ئاشق تاوانە، بـەڵام هـەرچیم لێ بکەی هەر حەقی تۆیە.
ئەم مەقامە لە عیرفاندا «رضا»یە واتە عاشق حەقی ئیعتیرازی لە مەعشووق نییە.
(١٤) حەسەنات: چاکە.
واتە: بە مەزهەبی گوڵ و بولبول ماچکردن چاکە، تۆش لەسەر ماچێ مەمکوژە و وەفادار بە.
(١٥) واتە: لەگەڵ گوڵ قەرارم داوە بێ سازلێدەر و ساقی تا نزیکترین جێ نەچم، وەفایی ئیدی حەیات بێ! بێ‌مەی و موتریب بۆ هیچ کوێ مەچۆ.

[ ١٠٩ ][(١)]

وەفــایی بــوت‌پەرستی تــۆیــە سـەد جــار کــوفری زاهــیر بــێ
بــە دیــنی بــولبولان سـەجدە حـەڵاڵە گـوڵ کـە مـەزهەر بـێ[(٢)]

دەمێك با دەست و گەردەن بـم، دەمـێك بـا هـەمدەمت مـن بـم
نەخۆشی چاوی تۆم بەڵکوو شیفای من شیر و شەککـەر بـێ[(٣)]

قـەسەم بـەو لێوی خـەندان! هـەر ئـەتۆی بـەو شکـڵ و بـاڵایـە
لە جەننەتدا ئەگـەر هـیچ نـەخلی تـووبا، ئـابی کـەوسەر بـێ[(٤)]

لە تــــاوی تــــیرەبارانــــی نــــیگاهت بــــۆچ نــــەناڵێنم؟
دیــارە حــاڵی بــیمارێکــی جــەرگی پــڕ لە نــەشتەر بـێ[(٥)]

ڕوخ و گــــەردنی پــیشان‌دام پــێم‌دەڵێ: تــۆ هــەر بــناڵێنــە
کــە خـۆشـە نـەغمەیی بـولبول بـەهاران وەك بـەیان بـەربێ[(٦)]

---

[ ١٠٩ ]

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم.
ڕەدیف: بێ. واژەی قافیە: زاهیر، مەزهەر، شەکەر، و...

(٢) زاهیر: ئاشکرا، لەبەر کێشی شیعر دەکرێ بڵێین: زاهەر. مەزهەر: سەرچاوە، جێی بەدی هاتن.
واتە: وەفایی سەد جار پێی بڵێن کافر ئاشکرایە هەر بوت‌پەرستی تۆیە بە مـەزهەبی بـولبول سوژدەبردن حەڵاڵە بۆ گوڵ کاتێ ئەو سەرچاوەی عەشق و ئەوینە.

(٣) واتە: ساتێ هاودەم و هەم قەدەمت بم نەخۆشـی چـاوتم بـەڵکـە شـیفای مـن بـەشیر و شەکەری دەمت بێ.

(٤) واتە: بە لێوی بە پێکەنینت سوێند بێ، شکڵ و باڵای تۆیـە ئـەگـەر دەڵێن لە بـەهەشتدا داری تووبا و جۆگەی شیر و شەکەری هەیە.

(٥) واتە: چۆن بۆ تیرەبارانی تەماشای تۆ ناڵەم نەیێ؟ دیارە نەخۆشێ جەرگی پڕ نەشتەر بێ دەبێ هەر بناڵێنێ.

(٦) واتە: ڕوخسار و ملی پیشان‌دام و دەڵێ بناڵە چۆنکە خۆشـە وەرزی بـەهاران نـەغمەی

عاشق وادەبێ بەهەموو دەم چاو پڕ ئاو، دڵ پڕ ئاو و مەخزوون
پێی هەوای بشکێ، پێی نەمێنێ غەیری هوو لە دەروون و بیروون
خاکی ڕێی دولبەری وەبزانێ سورمەیە بۆ چاوی پڕ خوون
سەگەکەی ڕێبازی لەیلێ وەرە سەر دوو چاوی مەجنوون
دونیام ئەو ڕۆژە لێ ڕوونە خاکی بەرپێی ئاشنابم(٦)

* * *

ڕۆحەکەم ڕووی خۆت بنوێنە، تابەکەی کوشتەی نازت بم؟
دەمەکەت بە تەکەللوم بێنە، تا نەمردووم هەمرازت بم
جارێك بە کەرەم بمدوێنە من فدای دەنگ و ئاوازت بم
مەیلی ئەبرۆی تۆ قەد نانێم غەمزەدەی چاوەکەی بازت بم
من کە هات و قیبلەم گۆڕی، یاخوا کافر بێ جەلابم!(٧)

* * *

بەزەییت ئەر هەبێ یا نەبێ بەندەی باڵاتم، سەد شا بم
تو خودا دڵم مەشکێنە من کەوا عاشقێکی چا بم
سەرەکەم فیدات عەزیزم وەرە زیز مەبە لەسەر دڵ
سەرە پایەبەندی تۆیە، دڵەماڵی خۆت هەتا بم
بە کەمەندی تۆوە بمرم خۆشترە نەوەك ڕەها بم(٨)

* * *

(٦) هو: «اللّه». پێی هەوای بشکێ: هەوای نەفسی نەمێنێ. دەروون بیروون: زاهیر و باتین.
(٧) دەمەکەت بە تەکەللوم بێنە: قسان بکە. هامراز: ڕەفیقی چاك. مەیل نان: لە بیر کردن. جەلاب: خوێنڕێژ، ڕاکێشەر، بەو کەسەیش دەڵێن کە ئەمشار و ئەوشار کۆیلە ڕائەکێشێ بە دوای خۆیدا بۆ فرۆشتن، کە لەوەئەچێ ئەمە مەبەستی وەفایی بێت.
(٨) ئەگەر شا بم هەر بەندەی تۆم. چا: چاك. میسرەعی سێهەم قافیەی غەڵەتە دیارە دەسکاری کراوە.

کوتم: ئەی شـای دڵنـەوازان مـانگ و ڕۆژن مـوشتەری ڕووت
دڵی چـاکـی پـاکـی بـازان پـێ بـە داوی زولفـی جـادووت
لە غـەمی ويسـاڵی ڕووی تـۆ جگـەر و هـەناوی مـن سـووت
خۆش بوو ئەو دەمەی گوڵ پشکووت شەکەر دەباری لە ياقووت
لادە لێم «وەفايی» دەيکوت: تۆ گەدا من شا بۆت نابم[٩]

* * *

## پێنج‌خشتەکی ژمارە [٤][١]

ئەی غـارەتی هـۆش و خـیرەدم نـەرگسی کـاڵت
ڕۆشـنگەری ئـاوێنـەیی دڵ عـەکسی جـەماڵت
حاشا مەکە قـوربان لە کـوژاوی خـەت و خـاڵت
ئـیسباتی شـەهیديم ئـەوەتا پـەنجەيی ئـاڵت
دەستم کە نەگەییێ بەسە بەو گەردەنە خێنم[٢]

* * *

وەك زولفی ڕەش و نەرگسەکەی فـیتنەگـەری تـۆ
سـەرمەستم و سـەوداسـەرم و دربـەدەری تـۆ

---

(٩) دڵنەواز: نەوازشگەری دڵ. پاکی بازان: پـاکـباز و عـاشقی ڕاسـتی. پێ‌بـەداو: بـەستراو. سـووت: سـووتا. يـاقووت: ئـيستيعارە لە لێوی يـارە. دەيگـوت: وەفـايی لە کـۆڵم بـەوە تـۆ سواڵکەری منيش شام بۆ يەکتر نابين.

**[٤]**

(١) کێشی شیعر: «مفعولن مفاعيل مفاعيل فعولن» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(٢) غارەت: لێرەدا غارەتگەر مانا دەکرێ. هۆش و خيرەد: عـەقڵ و هـۆش. نـەرگسی کـاڵ: چاوی کاڵ. ئاوێنەی دڵ: دڵ وەك ئاوێنە. کوژاو: کوژراو. خەت و خاڵ: جوانی. پەنجەيی ئاڵ: دەستی خەناوی و سوور. خێنم: خوێنم. بەوگەردنە: لە پای تۆيە.

گەر دین بووە گەر دڵ بووە قوربان بەسەری تۆ
ئێستاکە لە سایەی سەری زولف و نەزەری تۆ
گەردەنکەچی زوننارم و مەیخانە نشینم[٣]

* * *

ڕۆژ عاریزی تۆ ئاگری بەردامە هەناوان
شەو پەرچەمی تۆ دووکەڵی ئاویتمە چاوان
بەند بەندی دەروونم هەموو سووتاوە لە تاوان
ناڵەم وەکوو نەی دێ لە خەمی حەڵقە و داوان
لەو شێوە وەرن گوێ بدەنە شیوەن و شینم[٤]

* * *

زولفت کە لەسەر عاریزی تۆ خۆش حەرەکاتن
گۆیا سەحەری عید و شەوی قەدر و بەراتن
دایم دەگەڕێن تەشنەیی خوێنی شوهەداتن
دوو سەف لە فەرەنگی لە تەرەف ڕۆمەوە هاتن
بردیان بە ئەسیری دڵەکەی زار و حەزینم[٥]

* * *

---

(٣) گەردن کەچ: مەزڵووم. زوننار. ملبەند و پشتوێنی مەسیحی. واتە: دەربەدەرم وەك چاوی فیتنەگەرت دڵ و دین قوربانی تۆ بوو قەسەم بەسەرت.

(٤) عاریز: ڕوخسار. هەناو: دەروون. پەرچەم: زولف. ئاویتمە: هاویشتمە. حەڵقەو داو: زولف. لەو شێوە: بەمجۆرە.

(٥) خۆش حەرەکات: جوان دەجووڵێنەوە. گۆیا: وەك دەڵێن. سەحەری عید: بەیانی جەژن. شەوی قەدر: ٢١ تا ٢٩ی ڕەمەزان. شەوی بەرات: شەوی ١٥ی مانگی شەعبان. تەشنە: تینوو. شوهەدا: شەهیدان. دوو سەف لە فەرەنگی لە تەرەف ڕۆمەوە هاتن: دوو بڕژۆڵ لە لای ڕوخسارتەوە هاتن دڵیان بە ئەسیری بردم.

وەك کافرێ تینوو بێ بە خوێنــی ســەری ئـیسلام
وەك تورکێ لە دین وەر بگەڕێ مەست و مەیئاشام
چاوت بە کەمان مـۆرەیـی ئـەبرۆیـی سـیەهـ فـام
تیرێکی وەها سـەختی لە مـوهرەی جگـەری دام
تا ڕۆژی حەشر هەر دەتکێ خوێن لە برینم(٦)

❊ ❊ ❊

چبکەم وەکوو قومری کـە نـەیێ ئـاه و فـوغانم؟
پــڕ خــوێنــە وەکــوو نـافە دڵی بـەستە زوبـانم
هــەر لەحـزە بـە نـازێکـی دەکـا غـارەتی جـانم
ڕادەبرێ بە بـای عـیشوە، دەڵێ: سـەروی ڕەوانـم
دەنواڕێ بە تای زولفی، دەڵێ ئاهووی چینم(٧)

❊ ❊ ❊

ســینەم هــەموو ســووتاوە لە تـاو ئـاوری سـینا
دیدەم هەموو پڕ خـوێنـە لەبـەر چـەشمەیی مـینا
ئـەو دەردە «وەفـایی» کـە لە چـاوی گـوڵم هـێنـا
موشکل کە شیفام بێ بە هـەزار «بـووعەلی سـینا»
جارێکی مەگەر بێ بە دڵی خۆمی ببینم؟(٨)

❊ ❊ ❊

---

(٦) تورکی مەست و مەی ئاشام: نموونەی بێڕەحمی. ئەبرۆیی سیەهـ فام: برۆی ڕەش وەك کەوان. موهرەی جگەر: ناوەڕاستی جەرگ.

(٧) قومری: کوترەباریکە. نافە: نێوکی ئاسکی چین کە خوێنەکەی بۆنخۆشە. ئاهووی چین: ئاسکی چینی کە تەماشاکردنی جوانە.

(٨) ئاوری سینا: ئاگری کێوی توور لە سـەحرای سـینا. چـەشمەیی مـینا: کـانی شـووشە، ئیستیعارە لە ڕوخساری یارە. شیفا: کتێبی بووعەلی سینا. بووعەلی سینا: پزیشکی گـەورەی دەورانی غەزنەوییە. مەگەر: بڵێ، بەشکم.

## پێنج‌خشتەکی ژمارە [ ٥ ][1]

گــوڵێکـــم بـــوو لە دونـــیادا شکـــۆفـەی بـاغی ڕەعــنایی
لە داغـــی پـــەرچــــەمی شـێوام لە نـێو بـازاڕی ڕیســوایــی
وەکوو بولبول بە ڕۆح و دڵ شەو و ڕۆژ بـوومە سـەودایـی
هەموو عومری عەزیزم چوو لە ڕێی خەندێك بە خـۆڕایـی
بە جارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چوو![2]

❋ ❋ ❋

ئـەمن وەك پـەرچـەمی جـانان، ئـەمن وەك نـەرگسی یـارم
لەلایـــێ خــاو و ســەرگەردان، لەلایـێ مـەست و بـیمارم
بـــڵا بگـــریم بـــناڵێنـــم، کـــەوا تـێك‌چـوو سـەر و کـارم
دڵم دانــــا لە ڕێی دڵبـــــەر: نــە دڵبــەر بــوو نــەدڵدارم
بە جارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چوو![3]

❋ ❋ ❋

گـــوڵێکـــم بـــوو لە بـــاغی دولبـــەریدا مـــاهی کـــەنعانی
دڵێکـــم بـوو لە ڕیـزەی عـاشقان مـەجنوون بـە سـووتانی

---

**[ ٥ ]**

(١) کێشی شیعر: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن» بەحری هەزەجی موسەممەنی سالم. ئەم پێنج خشتەکییە لە هەموویانی خۆشتر و مەشهوورترە.

(٢) شکۆفەی باغی ڕەعنایی: غونچەی باغی جوانی. سەودایی: شەیدایی.

(٣) پەرچەم: زولف. جانان: یار. نەرگس: چاو. خاوم وەك پەرچەم و مەستم وەك چاو. بڵا: لێم‌گەڕێن.

دڵی بــــردم فــریوی دام بــە مــاچی لێوی مــەرجــانی
ئــەسیری ئــیلتیفاتی ســەر زبــانی بــووم و نــەمزانــی
بە جارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چووا[٤]

* * *

بە ئاوی چاو و خوێنــی دڵ، بــە ســەعیی ڕۆحــی شــیرینم
غــــەزاڵێکــم لە داو خست ئــافەتی دڵ غــارەتی دیــنم
هــەتا چــووم چــاوەکـانی مـاچ بکـەم لەحـزێکـی بـیبینم
لە دەستم چوو وەکوو دڵ، بوو بە مـایەی شـیوەن و شـینم
بە جارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چووا[٥]

* * *

«وەفایی» مـن شـەهێنـی قـۆڵی چـاوبازانـی شـاهان بـووم
ئەسیری دەستی گوڵدەم، سەرو بـاڵا، مـاه ڕوویـان بـووم
گەهێ بولبول، گەهێ تووتی، گەهێ مورغی غەزەلخوان بووم
بە ئومێدی عەزیزێك ـ دوور لە چاوم ـ پیری کەنعان بووم
بە جارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چووا[٦]

* * *

(٤) ماهی کەنعان: یووسفی پێغەمبەر کە نومادی جوانییە. ئیلتیفاتی سەر زوبانی: لوتفی زاهیری. (٥) سەعی: تەلاش، هەوڵ. غەزاڵ: ئاسك.
(٦) شەهێنی قۆڵ: بازی سەرقۆڵ، شەهێنی خێڵی چاوبازان. واتە: وەك هەڵۆ کچە جوانانی شاهانم ڕاو دەکرد. گوڵدەم: دەم وەك گوڵ.

خـــوداوەنـــدا! خـــوداوەنـــدا! پـــەشیمانم پـــەشیمانم
بـــە کـــاری ئـــاخیرەت نـــایەم عـــەجەب ئـــالوودە دامـــانم
بـــە بـــاری مـــەعسییەت شـــەرمەندەم و چـــاو پـــڕ لە گـــریانم
نە دینم بوو نـــە دونـــیا گـــەر نـــەکـــێشی خـــەت بـــە دیـــوانـــم
بە جارێ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چوو!(٧)

* * *

## پێنج خشتەکی ژمارە [٦](١)

ڕۆژی تـــەرەب و کـــەیف و دەمـــی جـــۆیـــە کـــوتانە!
بـــەو دەســـتەیی جـــوانـــێ وە پـــەری بـــۆتـــە نـــیشانە

---

(٧) ئاخیرەت: قیامەت. ئالوودە دامان: گوناحبار. مەعسییەت: گوناح. خەتکێشان بە دیواندا: پاك كردنەوە و سڕینەوە لە دەفتەری کردەوەدا و عەفوو کردنی گوناح. سەربەندی ئەم پێنج خشتەکییە (بە جارێ ماڵی ویرانم...) -وەك مامۆستا حەمەبۆریش لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەسەر شیعرەکانی «کوردی»، نووسیویەتی - نیو بەیتێکی مستەفا بەگی «کوردی»یە.

**[٦]**

(١) **تێبینی**: من لام وایە جۆ کوتان وەك گەرچەك کوتان لە ئاخری بەهاردا باوبووە کە بەرکوتیشیان پێ دەگوت، لە نێو ژنانی جۆ کوتدا ئافرەتێکی جوان بە ناوی پەری دەبێتە ئیلهامی ئەم موسەممەتەی کە لە تەرجیعیش دەچێ و وەفایی شیعری وای زۆرن. من وای لێ تێدەگەم و جەنابی قەرەداغی دەفەرموێ دەسنووسەکەی ئاوایە: (جان منە جونی دکتی عذر و بهانە). لە هەندێ کەسیشم بیستووە ئاوای خوێندووەتەوە: (جانی منە جوان بیکوتە بێ عوزر و بەهانە)، بەڵام ئەم بۆچوونە لەگەڵ تێکستەکەدا نایەتەوە.
کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفعول مفاعیل» بەحری هەزەجی موسەممەنی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

دەسـتی بـەمە تـوند گـرتووە گـەرمی قـەوەتانە
نـێوکـی نـەکـەوێ یـاڕەبـی بـەم بـارە گـرانـە
جانی منە جۆ دەکوتێ بێعوزر و بەهانە(۲)

❋ ❋ ❋

پـەروانـە سـیفەت سـووختەیی شـەوقی چـراغـم
وەك بـولبولی شـەیدا هـەموو سـووتاوە دەمـاغـم
دڵ پـڕ لە غـەم و داغـی جـەماڵی گـوڵەبـاغـم
وەك نێرگسی مەخمووری پەری مەست و نـەساغـم
جانی منە جۆ دەکوتێ بێعوزر و بەهانە(۳)

❋ ❋ ❋

دولبەر کە بـە خـەندە سـەری زولفـان دەهـەژێنـێ
بـازاڕی شـەکـەر، قـیمەتی عـەنبەر دەشکـێنـێ
مـاندوو بـووە ئـارەق بـە ڕوانـدا دەڕژێنـێ
بەرگی گـوڵ و نـەسرین بـە گـوڵاوێ دەڕووشـێنـێ
جانی منە جۆ دەکوتێ بێعوزر و بەهانە(٤)

❋ ❋ ❋

---

(۲) تەرەب: شادی.کام: دەم. جۆیەکوتان: جۆ هاڕین لەکاتی بەهاردا بە دەست نەك بە گێرە. بۆتە نیشانە: لە هەموولاوە دیارە. پەری: ناوی ئافرەتە جۆکوتەکەیە. بەمە: بە ڕای من. گەرمی قەوەتانە: زۆر بەقەوەت. جۆ دەکوتێ نێوکی نەکەوی: نێوك کەوتن نـەخۆشـییەکـە لە هـێزی زۆرەوە تووش دەبێ. ئەوە گیانی منە بێبەهانەگرتن جۆ دەکوتێ.
(۳) سووختە: سووتاو. شەوقی چراغ: ئیـستیعارە لە ڕوخسـاری یـارە. دەمـاغ: مـرخ، مـۆخ، هەست. داغ: حەسرەت و ناڕەحەتی. نەرگسی مـەخمووری پـەری: چـاوی مـەستی پـەری. مەست و نەساغ: مەست و نەخۆش، سیفەتی چاوە.
(٤) دەهــەژێنـێ: وە حـەرەکـەت دەخـا. بـازاڕ شـکـاندن: بـێقـیمەت و بـێئـەرزش کـردن. دەڕووشێنێ: بریندار دەکات، لە ڕووشاندنەوە هـاتووە. واتـە: ڕوخسـاری وەك بـەرگی گـوڵ ناسکە کەچی فرمێسکەکەی کە وەك گوڵاوە ئەوکوڵمە ناسکە دەڕووشێنێ. (ئیغراقی تێدایە).

ئەو شۆخە کە جیلوە و ڕەوشـی کـەبکی دەری بـێ
گێسوو شەب و مەھ عاریز و گەردەن سەحەری بێ
چاوی ڕەش و زاری گوڵ و زولفـی قـەجەری بـێ
ئەو دڵبـەرە بـەو ڕەنگـی جـوان ڕەنگـە پـەری بـێ
جانی منە جۆ دەکوتێ بێ‌عوزر و بەھانە(٥)

❊ ❊ ❊

ھەر لەحزە لە خەندەی دەمی وەك حوققەیی یاقووت
شەککەر دەوەری، گوڵ دەڕژا، غونچە دەپشکووت
سەر تا بە قەدەم ڕۆحی «وەفایی» لە غەمان سووت
نـــاڵەی دڵی زاری گـــەییبە عـــالەمی لاھـــووت
جانی منە جۆ دەکوتێ بێ‌عوزر و بەھانە(٦)

❊ ❊ ❊

## پێنج‌خشتەکی ژمارە [ ٧ ](١)

سـوڵتـانی هـەموو سـەرو قـەدان مـاهی حـەساری
چـــاوی کـــە غـــەزاڵن دەگـــرن شـــێری شکـــاری

---

(٥) کەبکی دەری: خاسەکەو. گیسوو شـەب: زولفـی ڕەش. مـەھ عـاریز: سـەرو چـاو وەك مانگ. گەردن سەحەری: مل سپی. زولفی قەجەری: قرتاندن و دانانی زولف وەکوو ئافرەتانی ئێلی قەجەر. ڕەنگە: پێم‌وایە.

(٦) حوققە: قوتوو، ئیستیعارە لە زاری یارە. سووت: سووتا. عالەمی لاھووت: عالەمی سەروو.

[ ٧ ]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری ھەزەجی ئەخرەبی مـەکفووفی مەحزووف.

بــۆ هــەتکی ڕیــازی چــەمەن و بــادی بــەهاری
زولفــی کــە هــەوا خســتیە ســەر غــونچەیی زاری
هەر لەحزە لە خەندێکی گوڵ و نافە دەبـاری(٢)

❊ ❊ ❊

گــوڵ هــاتەدەرێ لافـی لە حـوسنی بـوتی مـا دا
لەرزی قــەدی بــەرزی لە ڕقــان زولفـی کـە بـادا
عـەترێکـی لە دەم پـەرچـەم و ئـەگـریجە بـە بـا دا
چــین و خــوتەن و هـیندی بـە شـاباشی سـەبا دا
یەکسەر هەموو عالەم کە بووە موشکی تەتاری(٣)

❊ ❊ ❊

لەعـل و شـەکـەر و زاری کـە وەك فـیکری دەقـیقە
شــوبهەی نــییە ئـەو مـەرکەزە پـەرگـاری عـەقیقە
ئەو سـەبزە لەسـەر ئـەو لەبـە وەك ڕاحـی ڕەحـیقە
هەر جەوهەرە، جەوهەر خەتە، خەت موشکی عەبیقە
یاقووتی گوڵم نەقشە لەگەڵ خەتتی غـوباری(٤)

---

(٢) سەرو قەد: باڵا وەك سەوڵ. ماهی حەساری: یـارێ کـە لە مـاڵدا نـەهێڵن بـچێتـەدەرێ. غەزاڵ: ئاسك. شێری شکاری: شێری ڕاوچی. هەتك: سووکایەتی پێ‌کردن. ڕیاز «ریاض»: باخچە. غونچەیی زاری: دەمی وەك غونچە. نافە: میشك، مادەیەکی بۆنخۆشە کە لە نـاوکی ئاسکی چینی دەیگرن.
(٣) لاف: ئیددیعا، زێدەڕەوی. حوسن: جوانی. بوتی ما: یاری ئێمە. لە ڕقان: بە تووڕەییەوە. بادا: لوولی کرد، هەڵی پێچا. شاباش: پووڵێ کە دیدەن بە شایەر بە سڵامەتی یەکتر. وەفایی وڵاتی چین و خوتەن و هیندی کردووە بە شاباش و دای بە بای سەبا.
(٤) فیکری دەقیق: بیری باریك. شوبهە: شك و گومان. پەرگار: وەسیلەی دایـرە کـێشـانە لە ڕیازی و هەندەسەدا. مەرکەزی پەرگار: نوختەی ناوەندی دایرە، ئیستیعارە لە زار و دەمی یارە. ☜

بـــۆ هـــەتکی ڕیـازی خـوتەن و کـانی بـەدەخشان
وەك لەشکری هیند و حـەبەشن، گـەرمی تـەماشان
تـــێکـــەڵ بـــوون زەڕڕە و خـــورشیدی درەخشـــان
یـــا زولفـــییە بـــێشـــانە لەســـەر شـــانی پـــەرێشـان
وا دێن و دەچن هەردوو لەسەر زار و عیزاری(٥)

* * *

پـــەرچـــەم حـــەبەشیزادە، فـــەڕەنگـی بـــوتی زیـــبام
سەرحەلقەیی شـۆخـانی پـەریچیهرە گـوڵئـەندام
پێمکوت: چییە ئەم نوقتە لە نێو دوو لەب و یەك جام؟
فەرمووی ئەوە نوکتێکە بـە دوو لێوی شـەکـەرخـام
تا ماچی نەکەی ناگەیە سەر حیکمەتی باری(٦)

---

☞

عەقیق: بەردێکی جوان و سوورە و قیمەتی. سەبزە: مووی کەناری لێو و دەموچاو. لەب: لێو. ڕاح: شەراب. ڕەحیق: ساف و بێغەش. جەوهەر: مادەی غەیرە مورەککەب. خەت: دەوری ڕوخسار. موشکی عەبیق: مادەیەکی ڕەشی بۆنخۆشی چاك. یاقووت: ئیستیعارە لە لێوی یارە. یاقووت: خەتێکی جوانە. خەتی غوبار: جورە خەتێکی ناسك و جوانە.

(٥) هەتك: ئابڕوو بردن. خوتەن: لای وڵاتی چینە. کان: مەعدەن، کانگە. بەدەخشان: مەنتەقەیەکە لە وڵاتی ئەفغانستان کانی یاقووت و لەعلی هەیە. گەرمی تەماشان: مەشغووڵی سەیر کردنن. زەڕڕە: تۆزقاڵ لەگەڵ تیشکی خۆر دژایەتی هەیە و عاشقیشە هەمیشە زەڕڕە بەرەو خۆر هەڵدەکشێ. دێن و دەچن لە سەر زار و عیزاری: زولفی یار بێشانە لەسەر شان و دەم و ڕوخساری هاتوچۆ دەکەن.

(٦) پەرچەم حەبەشیزادە: زولف ڕەش. فەرەنگی بوتی زیبا: یاری جوان شکڵ. سەرحەڵقە: سەردەستە. شۆخ: جوان چاك. گوڵەندام: ناوی ئافرەتە کە وەفایی پێی وایە سەر دەستەی شۆخانی وەك پەری ڕوخسار وایە. نوقتەی نێو دوو لەب و یەك جام: دەمی یارکە لە نێو دوو لێو و ئاوێنەیەکدایە (ڕوخساری یار). فەرمووی: نوکتەیەکی باریکە لەسەر دوو لێوم تا ماچی نەکەی لە حیکمەتی خودا ناگەی.

بـــادی ســـەحەری هـات و دڵ و ڕۆحـی مـەنی دا
عـــەتری گـــوڵ و گـــوڵزاری خـەتاو و خـوتەنی دا
یـــان دەســـتی لە دوگـــمەی وەرەقـی پـیرەهەنی دا
یەکسەر هەموو عـالەم گـوڵی جـەننەت شکـەنی دا
باغی سەمەن و یـاسەمەن و سـێو و هـەناری(٧)

❋ ❋ ❋

فـەرموویە «وەفـایی» کـە دەبـێ ئـەهلی نـەزەر بـێ
عـــاشق ئـــەوەتا هـەمدەمی ئـەنفاسی سـەحەر بـێ
سێڵاوی سروشکی هەموو خـوێنـاوی جگـەر بـێ
بـــۆ تـــەوفی ڕیـــازی حـــەرەمی قـــیبلە لەبـــەربێ
ئەو سەعیە سەفای عومرە ئەگەر عاشقی یاری(٨)

❋ ❋ ❋

دەم غـــونچەیی نـــەشکوفتەیی گـــوڵزاری جـەماڵە
ئـــەبرۆ چـــییە مـیحرابـی دوعـای نـێرگسـی کـاڵە

---

(٧) باغی سەمەن و سێو و هەنار: مەبەست سنگی یارە. واتە: بای بەیانی هات و دڵ و ڕۆحی وەسەر خۆ هێنایەوە، ئەو بایە بۆنی عەتر و گوڵ و گوڵزاری خوتەن دێنێ پێموایە یار دوگمەی کراسی کردەوە کە عالەم هەموو وەك بەهەشتی لێ هات.
(٨) ئەهلی نەزەر: خاوەن ڕا، تێگـەیشتوو، عـارف. هـەمدەمی ئـەنفاسی سـەحەر: هـاوڕێی نەفەسی بای بەیانی، لە قورئاندا هەیە «و الصبح إذا تنفّس». لەبەر: لە پێشدا، پێش هـەنگاو. تەوف: تەواف بە دەوری شتێکدا خولانەوە. ڕیازی حەرەمی قیبلە: باغی دەور و بەری کەعبە. سەعی و سەفا: مەناسیکی حەجن لێرەدا ئیهامە یانی هەوڵدان بۆ زیارەتی یار.

قـــەد نـارەوەنی نـەورەسـی بـاخی خـەت و خـاڵە
نــێرگس بــە ڕوانــین خـــەتەراتـــی ســـەر و مـاڵە
یەکسەر هەموو عالەم کە بووە میشکی تەتاری(٩)

❋ ❋ ❋

مـــن عـاشقی ڕووتـم وەکـوو پـەروانـە «وەفـایی»
بــــیماری نـــیگاهم بــە غــەزالانــی خـــەتایی
تۆبی و سەری خۆت ئەی گوڵی سەرپەنجە حەنایی
چـیت دیـوە خـەتا مـەمخەرە زیـندانـی جـودایـی
بنوێنە ویسالت کە لەســەر وەعـدەیی پـاری(١٠)

❋ ❋ ❋

(٩) واتە: دەمی وەك غونچەی نەپشکووتە. ئەبرۆی چییە؟ میحرابی دوعای چـاوی کـاڵییە. قەدی داری نارەوەن، داری بەڕووە. نەرگس: چاوی یار. کاتێ دەڕوانێ خەتەری هەیە بۆ سەر و ماڵ، عالەم هەموو دەبێتە موشکی وڵاتی تاتار.

(١٠) غەزاڵانی خەتایی: چاوی یار. سەرپەنجەی حەنایی: واتە: بیکە بە خاتری سەری خۆت و سەرپەنجەی خەناویت ئەگەر لەسەر وادەی پاری، ویسـاڵت دەرخە و خەتام نـییە مـەمخە زیندانی دووری و جودابیت.

## پێنج‌خشتەکی ژمارە [ ٨ ][1]

تـــاڵێکـــی ڕیشـــەیی دڵ بـــە نـــووکی غـــەمزەدا دا
دەستێکی بـۆ ســەما بـرد ڕووبــەندی مــاهی لادا
نافەی گوڵی بە دەرکەوت عەتری بە دەم ســەبا دا
باریك و لووس و ناسك وەك زولفی خاوی بــادا
وەك شاخی گوڵ بەلادا، شیرین تــەشی دەڕێسێ[2]

* * *

---

**[ ٨ ]**

(١) بە پێچەوانەی زۆر کەس کە پێیان وایە وەفایی بە «شیرین تەشی دەڕێسێ»وە ناسراوە و بە پێچەوانە مەرحوومی مامۆستا هێمن کە دەیفەرموو ئەم پێنج خشتەکییە هی وەفایی نییە، من بیر و ڕایەکی تایبەتیم هەیە و عەرزتانی دەکەم قەبووڵتان نەبوو ماڵی قەڵب سەر بە ساحەبیەتی. ئەم موسەممەتە هی وەفاییە بە شیرینێکیشا هەڵگوتووە کە تەشی ڕستووە، لە پێشدا بە قودرەتی فەلەکیاتەوە دەستی پێ کردووە و وەزنی غەرەبی «مفعول فاعلاتن» و تەرجیعی شیرینی تەشی دەڕێسێ و هاوقافیەی نیوەی سەربەندی شیعرەکە وای کردووە شیعرەکە زۆر کۆششی بێ و لە ئاخرەکانیدا شاعیر لە خۆی و شیرین و شیعرەکەی وەڕەز دەبێ لە فەلەکیاتەوە لائەداتە سەر هەزەلیات و بە ئەندامە ژێر کەمەرەکانی خۆی و شیریندا هەڵدەڵێ کە ئەم شیعرە سەنگینەی هەوەڵ بە تەواوی سووك دەکات. مـن پـێم شـیعری چـاك نـییە بـەڵام ئـاهەنگی تـایبەتی و داستانەکەی کە بۆیان هەڵبەستووە ڕاست یان درۆ جالبە و وای کردووە ئەم شـیعرە حـەیفە نەنووسرێتەوە جا بۆیە من بە لازمی دەزانم بنووسرێتەوە.

(٢) تا: تاڵ، هەودا. نووکی غەمزە: ئیستیعارە و ئیهامە لە نووکی تەشی. یانی: هەودایەکی کرد بە نووکی تەشییەکەیەوە. دەستێکی برد بۆ سەری بە مۆدەی تـەشی ڕسـتن ڕووبـەندەکـەی لاچوو نیقابی لەسەر مانگ لابرد، ناوکی وەك گوڵی (کەوەك ناوکی ئاسکی تەتارە کە میــسکی لێ ئەگرن) دەرکەوت و بۆنی بای سەبا هەڵی گرت، ڕیشەی دڵمی باریك و ناسك، وەك زولفی خاوی، با دا.

نووکی تەشی بە گەردوش چەرخێکی قوتبی پێوە
مەجەڕڕە بوو بە داوی کە چـەرخـی کـەوتە نـێوە
وەك زوهرە دەستی کێشا کە بەندی قـەوسی زێوە
ئـەستێرە مـاهی داگـرت سـابت گـەڕا بـە پـێوە
عەرەق بە ڕوو بە ڕێوە، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(٣)

* * *

لە بـانی عـارەقی ڕشت لە پـێکـەنینی زاری
بە خەندە غونچە گوڵ بـوو گـوڵاوی لێ دەبـاری
وتم: بـفەرمووە سـەر دوو چـاوی مـن بـە یـاری
بـە چـاوی مـن ببینن تـەلیسمی سـیحر کـاری
کە سەروی جۆیباری، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(٤)

* * *

کـە دەسـتی بـرد و هـێنـا بـە دڵبـەری بـە تـادا
هـێنـایە چـەرخ و گـێڕای بـە ڕانـی سـافیدا دا
عەیان بوو پـەنجەیی ڕۆژ بـە خـەتتی ئـیستیوادا
بە سوبحی سادق ئەنگووت زەنەب لە نێو سەمادا
حـیرەت لە مـاسیوادا، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(٥)

---

(٣) قوتب: جەمسەر. لەگەڵ تەشی کە دەخولێتەوە وەك یەك دەچن. مەجەڕڕە: کاهکەشانی ڕێی شیری کۆمەڵە ئەستێرە. زوهرە: ئەستێرەی ئاسمان. ئەستێرە: جورمی ئاسمانی نووردار هەر هەمان سابت. تەشی ڕستنی شیرین لە حەرەکەتی سابت و سەیاراتی ئاسمان دەچوو.
(٤) لەبانی: لێوانی. یاری: «یارێ» بە زاراوەی سابڵاغی ڕاستترە، مەنزوور شیرینە. تەلیسمی سیحرکاری: ئیستیعارە لە تەشی ڕستنی شیرینە.
(٥) تا: تاڵ، هەودا. هێنایە چەرخ: هەڵی سووڕاندو خەتی ئیستیوا: پشتێنی فەرزی کە عەرزی بە دوو نیوەی باکوور و باشوور کردووە. زەنەب: ئەستێرەی کلكدار. ماسیوا: جیهان، دونیای مادی.

که هاته چەرخ و بازی تـەشی بـە ڕانـی لووسـی
دەکـــەوتە پـــایبووسی دوو زولفـــی ئـــابنووسی
زەنـــەب لە مـــانگەشەودا دەهـــاتە چـــاپلووسی
لەسەر بەیازی گەردەن بە خەتتی خۆشی نووسی
مـــەهتابە پـــایبووسی، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(٦)

* * *

یەخەی کراسی لاچوو پشکووت بە هەردوو لێوان
گوڵ و شەکەر دەباری لە کووچەی باغی سـێوان
زولفی پەخشان بوو کوڵمی وەدەرئەکەوت لە نێوان
شەمس و قەمەر هەڵاتن دوێنێکـە نـوێژی شـێوان
وەفایی کـەوتە کـێوان، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(٧)

* * *

کەکەوتە چەرخ وگەردش تەشی بە دەستی ڕەنگین
هەودای لە لێو و دەم دا خورشیدی سینە نەسرین
سەمای بە زووزەنەب دا «کفّ الخضیب»ی شیرین
گرتی خەتی مەداران شەفەق بە عـیقدی پـەروین
سیحرێکە بۆ دڵ و دین، شیرین تـەشی دەڕێسـێ(٨)

---

(٦) بازی: یاری، کایە. پابوس: پێ‌ماچ کردن. چاپلووسی: چـامە لووسکـێ، مـاستاوکردن. بەیازی گەردن: سپەتی گەردن. مەهتابە پایبووسی: مانگەشەو لاقماچکەری یارە.
(٧) کووچە باغی سێوان: یەخە و سنگی یار. شەمس و قەمەر: مانگ و ڕۆژ، ئیستیعارە لە ڕوو و سنگی یارە. هەڵاتن: تلووعیان کرد. نوێژی شێوان: لای ئێوارە. کەوتە کێوان: شێت بوو. بریا شیعرەکە لێردا تەواو بایە!
(٨) واتە: کاتێ تەشی هەڵسووڕان تاڵی تەشییەکەی لە لێو و دەمی دا یارێ کە دەڵەی هەتاوە و سینگی وەك گوڵی نەسیرنە. «کف الخضیب» دەسـتی خـەناوی شـیرین ئـەستێرەی هـێنـایە هەڵپەڕین. زووزەنەب: ئەستێرەی کلکدار. شەفەق: بناری ئاسمان. عیقدی پەروین: ئەستێرەی کۆ و تەرازوو. خەتی مەداران جێگەی هاتوچۆی ئەستێرەکان.

دوو زولفی چین بە چین کرد، کە نافەیی خـەتایە
دوو مەمکی خستە سەر لۆق هەناری دڵ گـوشایە
بە خەندە چەرخێکی دا کە شەوق و نـەشئە وایـە
بە نوکتە پـێی نـیشان دام سـەما لەسـەر هـەوایـە
هـەموو ئـیشارە وایـە، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(٩)

* * *

بـــە عـــیشوە زولفـی لادا لەسـەر عـیزار و زاری
دوگمەی کراسی ترازا، بـزووت هـەوای بـەهاری
کە شـەو بـەیانی بـەردا گـوڵ و وەنـەوشە بـاری
ســـەڵای بـە عـاشقان دا بـاغی گـوڵ و هـەناری
دونـیایەك ئـینتیزاری، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(١٠)

* * *

کە زولفی کەوتە سەر ڕوو هەموو خەتای بە چین دا
خـــەرامـی تـاووسانەی بـە سـەروی نـازەنین دا
ســـــفیدەیی بـــەیانی بـــە بـــاغی یـــاسەمین دا
فـــەنایی پـــڕ بـــەقا بـــوو دەمـی لە پـێکـەنین دا
سەد ئافەتی لە دین دا، شیرین تـەشی دەڕێسـێ(١١)

---

(٩) چین بە چین کرد: دەقی دا. نافە: مادەی بۆنخۆشە. خستە سەر لۆق: دەری پەڕانـد وەك هەنار دەرچوو. چەرخێکی دا: هەڵسووڕا. سەما: ئاسمان، یان ڕەقـس ئیهامی تێدایـە. لەسـەر هەوایە: خەیاڵی هەیە.

(١٠) عیزار: ڕوخسار. زار: دەم. بزووت هەوای بەهاری: بەهار هات. سەڵای بە عاشقان دا: ئاشقانی بە هاوار خست. باغی گوڵ و هەناری: ئیستیعارە لە سینەی یارە.

(١١) خەتای بە چین دا: ئیهامە یانی تاوانی خستە سەر چینی زولفەکە. خەرامی تـاووسانە: وەك تاووس بەڕێدا چوو. سەروی نازەنین: بەژن و باڵای یار. سـپێدەی بـەیانی دا بـە بـاغی یاسەمینی سینەی یار. کاتێ پێکەنی فەنای دەمی بچووکی پڕ بوو لە بەقا، واتە: دەرکەوت سەد ئافەت و زەرەری هەبوو بۆ دین.

سـمی غـەزاڵەیـی چـین لە نـافەدا عـەیانە
دەڵەی لە نـیوەشەودا سـفیدەیی بـەیانە
قەدی گوڵ و دەمی گوڵ ئەمەی کە قـووتی جـانە
لە بـاغی یـاسەمیندا شکـۆفـەیی گـوڵانـە
بەهاری بـێخـەزانـە، شـیرین تـەشی دەڕێسێ(١٢)

* * *

شکـۆفـە وا هـەڵستا لە زێڕ و زیـو حـوبابێ
لە کـەوسەری بـەهەشتێ دەروونـی پـڕ کـرابێ
خـڕ و لەتـیف و نـازك بـلووری خـود نـومابێ
بـە تـەرزی درزی دەرزی لە خـۆوە درزی دابێ
دیارە سەروی وابێ، شـیرین تـەشی دەڕێسێ(١٣)

* * *

شـەوێ لە پـیرەخەودا جـەماڵی ویـم بـە دڵ دی
دوو چاوی مەست و کاڵم وەکوو غەزاڵی سڵ دی
ئەگەر چی نەوبەهارم بە ڕەنگـی بـاغی گـوڵ دی
هەناری نـەوڕەسـیدەم شکـاو و خـاو و بـڵ دی
گوڵم لە خاك و گڵ دی، شیرین تەشی دەڕێسێ(١٤)

---

(١٢) سمی غەزاڵەی چین لە نافەدا عەیانە: یانی: ئاسکی چینی بە زولفیداگەڕاوە وا بۆنخۆش بووە. قووتی جان: خۆراکی ڕۆح.

(١٣) حوباب: تۆقلە، بڵق. واتە: دەتگوت ناوکی یار لەکەو سەر پڕ کراوە خڕ و ناسك و بلوورە بۆ خۆی دیارە. بە تەرزی: وەکوو. درز: قەڵەش. دەرزی: کەرەسەی دورووومان. لە خـۆوە: لە خۆڕایی. درزی دابێ: قەڵەشابێ. جیناس و تکرار و واجئارایی لەم میسرەعەدا هەیە.

(١٤) پیرەخەو: خەوی خۆش. چاوی لە چاوی ئاسك دەچوو. هەنارەکەی شکابوو بڵ ببوو واتە زۆر گەیی‌بوو، واتە شیرین لە خەونمدا ئەندامەکانی پیر ببوو. لێرەوە ئەدەبیاتی هەزەلی وەفایی دەست پێدەکا.

وتم: چبوو نەمامم! بـە خـاڵ و خـەت نـەماوی؟
وەکوو بـەیاری سـونبول بـڵاو و تـێك شکـاوی؟
وتی: گڵاوی سەگ بوو شکـۆفـە گـوڵ، گـوڵاوی
بـــە کــەرتەشی ســـماوە ســتارەیی ســـەماوی
بەسەر چوو چاو و ڕاوی، شیرین تەشی دەڕێسێ(١٥)

* * *

مەنعی مـەکـەن «وەفـایی» کـە خـاوێ دڵ بـڵاوە
ســـەرێکـە مـەستی نـازی، دڵێکـە بـۆی نـەماوە
بـــە داو و دڵ دڵی خـــۆی بـە داوی زولفـی داوە
دڵم حـــەقی بـــە دەســـتە فـــتوایـی سـەری داوە
کە ئەم غەزاڵە چـاوە، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(١٦)

* * *

قـــــــوتووی لوئـــــالیيانە لە زیـــــوی دارڕژاوە
لەبـــالەبە لە حـــیکمەت لە شـەهدی هـەڵکـراوە
لەبـــــەر نــــــەزاکــەتی ڕۆژ ڕەوواقـــی دادڕاوە
بـــە تـەرزی درزی دەرزی لە خـۆوە درزی داوە
بە مەی عەیان کـراوە، شـیرین تـەشی دەڕێسـێ(١٧)

---

(١٥) واتە: گوتم ئەی یاری باڵا نەمام بۆچی وەك جاران نەماوی. بەیار: جاڕ، زەوی نەکێڵدراو. گڵاو: نەجیس، پیس. گوتی: شکۆفە گوڵم گوڵاوە کە سەگ گڵاوی کرد یانی مێردەکەمم بە دڵ نییە. لە نێوان گڵاو و گوڵاودا جیناس هەیە. کەرتەشی: گیایەکی خڕی دڕکـاوییە. کـەرتەشی ئیستیعارە لە ئەندامی نێرینەی مێردەکەیەتی. سماوە: کونکراوە. چـاو ڕاو: خـۆهـەڵکـێشـان، خۆنواندن.

(١٦) واتە: مەنعی وەفایی مەکەن هۆشیار نییە سەری مەستی نازی یارە و فتوای قەتڵی دراوە.

(١٧) قوتوو: سندووق، جەعبە. لوئالییان: جەواهیرات، ئیستیعارە لە ئەندامی یارە. لە زیـوی دارڕژاوە: بە زیو دروستکراوە، واتـە زۆر سـپییە. لەبـالەب: پـڕ. حـیکمەت: زانست و هـونەر. ☜

شیفای جەراحەتی دڵ تەشی نەبوو، کە ڕستی
شەش پەڕی کاکی خۆیە پڕاوپڕە بە دەستی
هەتیوێ کەللەشەق بوو بە داوی حیلە بەستی
لە ناوی هاتوچۆدا بە لێوی غونچە گەستی
بە ڕۆح و دڵ بە قەستی، شیرین تەشی دەڕێسێ(١٨)

* * *

بە دڵ بە دیدە سووژن لە غونچەگوڵ یەرەق بوو
شەشپەڕەکەی «وەفایی» کوڵوفت و تیژ و ڕەق بوو
لە هاتوچۆی سەماوی گوڵ هەم وەرەق وەرەق بوو
شەقایقێکە شەق بوو شەقایقێ کە شەق بوو
بەڵێ چ موستەحەق بوو، شیرین تەشی دەڕێسێ(١٩)

* * *

---

☞

شەهد: هەنگوێن. ڕەواق: شیلەی هەنگوێن. نەزاکەت: ناسکی. وەك کونی دەرزی لە خۆڕا قەڵەشاوە.

(١٨) جەراحەتی دڵ: برینی دڵ. شیفای برینی دڵ ئەو تەشیە بوو کە دەی ڕست. شەشپەڕی کاکی خۆی: ئیستیعارە لە ئەندامی نێرینەی وەفایە کە بە جێی تەشی پڕ بە دەستی شیرینە. شەشپەڕەکە هەتیوێکی سەر بزێو بوو لە ناو غونچەی یاردا دەستی کرد بە هاتوچۆ. بە قەستی: بە شۆخی.

(١٩) سووژن: دەرزی زەلام، ئیستیعارە لە هینەکەی وەفاییە. یەرەق: هەستانی ئالەتی حەیوان و ئینسان. شەشپەڕەکەی وەفایی: ئەندامی نێرینەی وەفایی قەوی و تیژە و ڕەق بوو لە هاتوچۆی ئەودا شەقایقی یار پەڕپەڕ بوو تۆش بڵێ زۆر جێگەی خۆی بوو ئەوکارە.

## پێنج‌خشتەکی ژمارە [٩][١]

ئـــەو دڵبـــەرە وا بـــادە بـــە چـــاوان دەفـرۆشـێ
هەردەم بە تەبەسسوم لەبـی خـەندان دەفـرۆشـێ
بۆ شەهد و شەکەر حوققەیی مەرجان دەفـرۆشـێ
ئەو غـەمزە کـە چـاوی بـە شـەهیدان دەفـرۆشـێ
چی زاهیدە ئەو زوو دڵ و ئیمان دەفرۆشـێ[٢]

* * *

یـــاقووتی لەبـــی لەعـــلی کـــەوا قـووتی ڕەوانـە
ڕوو باغی گوڵ و دەم گوڵ و قەد سـەروی ڕەوانـە
مـــوژگانی کـــەچی قـــاتیلی ســـەد قـــافڵە جـانە
تـــا پـــێنـــەکـــەنی زولفـی نـەدا بـەردەمی شـانە
نەمزانی کەگوڵ شەککەر و ڕەیحان دەفرۆشێ[٣]

* * *

---

[٩]

(١) کێشی شیعر: «مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن» بەحری هەزەجی ئەخرەبی مـەکفووفی مەحزووف.

(٢) بادە: شەراب. واتە: ئەو یارە بە چاوی شەراب دەفـرۆشـێ. حـوققەیی مـەرجـان: دەم و زاری کە پڕە لە ددان بە غەمزەی چاوی موسوڵمان لە سەر دین لادەبا.

(٣) یاقووت: بەردی سووری قیمەتی شوبهاوە بە لێو یان لێوی پێ شوبهاوە. قـووتی ڕەوان: غەزای ڕۆح. تا یار پێنەکەنی و زولفی شانە نەکرد نەمزانی بە لێو شەکر و بـە زولف ڕێحـان دەفرۆشێ. لەف و نەشر و تەشبیهی تێدایە.

قەترەی عــەرەقی نــافە لەســەر لەعـلی درەخشــان
یا میشکە لە گۆشەی وەرەقی گوڵ بـووە ئـەفشان؟
داغـــی دڵە یـــاخۆ، بـــەسەری زولفـە پـەرێشـان
خاڵی دەمی تـۆ زەنگـییە کـەوتۆتـە بـەدەخشان؟
یاخۆ خزرە چەشمەیی حەیوان دەفـرۆشـێ[٤]

* * *

تــاتا کــە بـە داو زولفـی وەکـوو سـونبولی بـادا
گوڵدەستەیی شـەوبۆ بـوو بـە بـەرگی گـوڵیـدا دا
شــەوبۆیـــی گـــوڵ و نــافە لە دەم بـادی سـەبا دا
شێخم بـە هـەوای زولف و دڵ و دیـنی بـە بـا دا
وەجهی چییە بەو کوفرەکە ئیمان دەفرۆشێ[٥]

* * *

گـەر تـالیبی مـاچێکـی ئـەتۆ لەو دەمـە قـەندەی
بەو زولفە دەبێ هەروەکوو من خۆت لە ڕەسەن دەی
شاهەنشەهی میسر و حەبەشە کـێ بـووە بـەندەی
چـــاوێکـــی بـە گـریانی دەوێ تـالیبی خـەندەی
مەعلوومە کە گوڵ خەندە بە باران دەفرۆشێ[٦]

---

(٤) واتە: ئەرێ ئەوە دڵۆپی عارەقە لەسـەر ڕوخسـاری یـار، یـا مـوشکە لەسـەر گـوڵ بـڵاو بووەتەوە؟. زەنگی: ڕەش پێست. بەدەخشان: شارێکی وڵاتی ئەفغانستانە لەعلی مەشهوورە. خزر: پێغەمبەری زیندوو. چەشمەی حەیوان: ئاوی حەیات.

(٥) واتە: کاتێ زولفی بە بادا شێخ ئیمانی بۆ دەفرۆشێ.

(٦) ئەگەر ویستت ماچێ لەو دەمە، دەبێ بـەو زولفـە خـۆت هـەڵواسـی. ڕەسـەن: تـەناف. شەهەنشای میسر و حەبەش غوڵامی ئەو یارەیە. گوڵ پێکەنینی بە باران دەفـرۆشـێ دەبـێ بگری بۆ پێکەنینی یار.

جیلوەی مەیی ئەو ساغیرە نەشئێکی نەدامێ
ساقی وەرە لەو لێوە، بە چاوت، بدە جامێ
کوشتەم بە خەت و خاڵ و ڕوخی تازە نەمامێ
من تالیبم ئەی بادی سەبا بێنە پەیامێ
لەو لێوە کە ماچی بە دڵ و جان دەفرۆشێ(٧)

* * *

تا دوێنێ ئەمن وەسڵی ڕوخ و زولف و دەمم بوو
باغی ئیرەم و عومری خزر، جامی جەمم بوو
ئەمرۆکە جودایيم لە غەزاڵەی حەرەمم بوو
بەو سەعیە لەسەر قیبلە سەفا عەینی غەمم بوو
چاوم بە دوو جێ زەمزەمی گریان دەفرۆشێ(٨)

* * *

مەهرِوو بە خەتا نافەیی چین میشکی خەتایی
دیم هاتە سەفی گوڵ بە هەوای عەترنومایی
تەفزیلی گوڵم دا هەموو یەعنی بە ڕیایی
بۆ ماچی دەمی شاهیدی دڵبەر بوو «وەفایی»
شێخم کە بە هیچ و نەبوو ئیمان دەفرۆشێ(٩)

---

(٧) واتە: ساغری مەیی یار نەشەی نەکردم ساقی لە لێوی یار جامێکم بدەرێ، بای سەبا پەیامێ لەلای یار بێنە.

(٨) بۆیە دەڵێن ئەم شیعرە بۆ مردنی خێزانی گوتراوە کە دەڵێ: ئەورۆکە جودایيم لە غەزاڵەی حەرەمم بوو: غەزاڵەی حەرەم واتە ئاسکی وڵاتی عەرەبستان، دەکرێ ئیستیعارە لە شێخ عوبەیدیللا یان شەخسێکی موقەددەس بێ. لە نێوان سەعی و سەفا و زەمزەم و قیبلەدا موراعاتی نەزیر هەیە کە وەفایی زۆر جوان کەڵکی لێ وەرگرتووە.

(٩) مەهرِوو: ڕوو وەك مانگ. واتە: ڕوخساری وەك مانگ وەکوو ئاسکی خەتا هاتە مەیدانی جوانی بۆ عەتر نومایی و بۆنخۆشی خۆی، من بە ڕیایی گوڵم بە سەر یاردا تەفزیل دا، یانی یار لەگوڵ جوانترە بەڵام من ڕیام کرد، وەفایی شاهیدەکە شێخم لەسەر دەمی یار کە هیچ نییە واتە بچووکە ئیمانی خۆی دەفرۆشێ.

ئـــەمان مـوتریب بـێ ساقی وابـێ | ئەگەر مـەی نـابێ بـۆ خـۆی بـابێ
کـــەسی بـــێهـــۆشـــی تـەجەللابێ | خـەیاڵی نـەشئەی بـادەیی نـابێ(١)

❋ ❋ ❋

هـەتا نـــەبیە خـــاکـــی مـــەیخانە | مـــەڵێ ســـاقی بـــێنـــە پـــەیمانە
مـــەحاڵە بگـــاتە شـــەم پـــەروانـــە | مەگەر سەر تـا پـێ ئـەو سـووتابێ

❋ ❋ ❋

لە تـــاتا زولفـــانی ڕووی تـابانە | دەڵێ شـــەو شـــەوقی گـوڵە بـاغانە
وەك دەڵێن ئـەمشەو خـۆ چـراغـانە | بـــەڵکـــوو شـای گـوڵزاران واڕابـێ

❋ ❋ ❋

نـــەخۆشـــم کـــەوتووم بـێزوبـانم | دەنــــــاڵم لەبـــەر دەردی گـــرانـــم
بـەبێ ئـەو شـۆخـە خـۆم دەیـزانـم | دەوای من نایێ سـەد مـەسیحا بـێ

❋ ❋ ❋

نــــەخۆشـــم کـــەوتووم دەردەدارم | وەك زولفـــی دولبـــەر بـــێقـــەرارم
ڕۆح لەســـەر لێوم چـاوەڕێی یـارم | یـــار دەڵێن: وادێ، تـۆ بـڵێی وابـێ

❋ ❋ ❋

تۆ و غەمزەی چـاوی زوبـان زانت | تـــۆ و ســـەری زولفـی پـەرێشـانت
مـــــەیێڵە بـــــمرم لە هـــــیجرانت | بڵا مەجنوون بـێ بـە لەیـلێ شـابێ

❋ ❋ ❋

گەر دەگرم زولفت، دەڵێی کافر بووی | دەست بۆ دێنم، دەڵێی چاتر بـووی
بە هەر حاڵ بـۆ مـن تـۆ ئـاوربووی | فـــیدای مـــردن بـــێ ژیـانێ وابـێ

❋ ❋ ❋

---

[١]

(١) ئەم شیعرانە هەرچەند لە سەبکی وەفایی دەچن و بۆ «تصنیف» واتە بۆ گۆرانی دانراون، لەبەر شێواوی کێشی وەزنەکانی، بە شیعری وەفاییم نەزانین بۆیە ئیشم لەسەر نەکردن، بەڵام چونکە لە چاپە پێشووەکەدا هاتبوون منیش هێنامن.

یاخودا بەناڵەی دڵی ئێشـان کـەی! یارەب بە یاهووی دەروێشان کـەی!
غەمی جەرگی من پـەرێشـان کـەی! ڕووت لە نێو زولفت بۆ بڵاو نابێ؟!

❋ ❋ ❋

دەمێکی وابێ ئـەی مـایەی سـەبرم بـــە دڵ دامـــانی زولفت بگـــرم
هەتاکەی ئاخر هـەر بـۆت بـمرم؟! تـاوێك نـا تـاوێك سـەلام لێ ڕابـێ

❋ ❋ ❋

ئەگەر یار بـێتـە گـۆشـەی قـەسرێ دڵێکـــی دەم بـەدەم ئـاور نـەگـرێ
بـە دیـدارێکـی سـەد جـار نـەمرێ دڵی وام نـــاوێ تـووری سـینا بـێ

❋ ❋ ❋

نـە زولفـی تـۆم، بـۆچ بـێقـەرارم؟ نـــە چـاوی تـۆم، بـۆچ وا بـیمارم؟
عـــەجەب شـــێواوە ســـەر و کـارم دیـــــارە دەردێ بـــــێدەوابـــــێ

❋ ❋ ❋

دەمێکی ڕووت بگـرم زولفت لادەم بە خۆشی هـەردوك دونـیات نـادەم
کە تۆم بێ چم لە ڕەوزەیی ئـادەم؟ بەهەشت وا خۆشـە تـۆی تـێدابـێ

❋ ❋ ❋

چەند خۆشە ئەمن و تۆ هەتا مـردن وەك زولفی تۆ بین: دەست و گەردن
لە تۆ گوڵ گـوڵغـونچەت وا کـردن لە من قـوربان بـوون تـا ڕۆح مـابێ

❋ ❋ ❋

مەگـەر تـۆ بـووی و هـاتیە خـەندە کـــەوا دونـــیا پـــڕ لە کـــەلە قـەندە
بە مەرگی من بڵێ نـرخـی چـەندە؟ دەڵێی دڵ؟ هانێ! دەڵێی ڕۆح؟ تا بێ!

❋ ❋ ❋

دەڵێ: گـــوڵزارم، گـــەردەن ئـاسکم وەنـــەوشەبسکم، زیـــوین بـــاسکم
بـڵا بـزانـێ چـەند نـەرم و نـاسکم ئەگەر ڕۆح دێنـێ «وەفـایی» بـابێ!

❋ ❋ ❋

## چوار خشتەکی

دڵم پڕ خوێن و خوێنبارە بە غەمزەی نازی چاومەستان
هەتا نەمرم ڕەها نابم لە مەکر و سیحری چاو بەستان
ئەتۆ سەروێکی نازداری ئەتۆ شۆخێکی گوڵزاری
بە دڵ واچاکە بدگێڕم لەسەر چاوان لەسەر دەستان

بە عینایەتی خودا شەوی ١١ی ڕەمەزانی ١٤٢٩ی مانگی ڕێکەوتی ٢٢ی خەرمانانی ١٣٨٧ی هەتاوی بەرانبەری ١٢ی سپتامبری ٢٠٠٨ی زایینی پاش ساڵ و نیوێ شەرحی وەفاییم تەواو کرد، بەو هیوایەی بە پاك و پوختی بچێتە بەر دەستی خوێنەران و هۆگرانی ئەدەبی کورد.

بۆکان موحەممەد سەعیدی نەجاڕی (ئاسۆ).

## پاشبەند

خوێنەری ئازیز! ئا ئەوە بوو سەرجەمی شیعرەکانی وەفایی کە لە دیوانی وەفایی کۆڕی زانیاری بە هەوڵ و تێکۆشانی بەڕێز و دڵسۆزی گەورەی کورد ماموستا موحەممەد عەلی قەرەداغی چاپ کرابوو. ناڵێم لە سەتا سەتی ئەم ڕاو بۆچوونەی منیش دروستە، بەڵام بە پێی بیر و هزری خۆم ئاوای لێ تێگەیشتووم و بە قەولی سەعدی:

قبا گر حریر است و گر پرنیان        به ناچار حشوش بود در میان

من لە ساغکردنەوەی شیعرەکاندا چەند ڕچەم هەبوون:

١. کێشی شیعر؛

٢. مۆسیقای وشەکان؛

٣. پەیوەندی وشەکانی نێو میسرەع؛

۴. نوسخە بەدەلەکان کە بە هەوڵ و تێکۆشانی ماموستای قەرەداغی لە پەراوێزدا هاتبوون؛

۵. ناڕێکی و کەمی مانای بەیتەکان؛

۶. ئاشناییەکی تەواو بەسەر ڕێنووسی کۆنی کوردی کە وەکوو شێوە نووسینی فارسی نووسراوە؛

٧. ئاگاداری بەسەر شێوەزاری سابڵاغی کە شێوەزاری مەرحووم وەفاییە؛ و....

هێشتا پێموایە کارەکەی منیش تەواو ئەو شتە نییە ڕۆحی وەفایی پێ ڕازی بێ، بەڵام دڵم دەڵێ تا ئێستە لەم دیوانە ساغکراوەی منە ڕازییە. جا ئەگەر دڵسۆزێ دیکەش هات و هەڵە و پەڵەی منی هەڵگرتەوە و خەتی خواری ڕاست کردەوە مەمنوونی دەبم، نەك خوانەخواستە بۆ سووك کردنی من، بەڵکە بۆ گەورە کردنەوەی وەفایی؛ چونکا من پاش ساغکردنەوەی «دیوانی میسباح» ئەمە دووەم کارمە لەو بەستێنەدا. خودا یاربێ ئەگەر ئەو ڕەزای لێ بێ و کۆمەکم بێ و تەمەن یاریدە بدا «نالی» و «شێخ ڕەزا» و «کوردی»ش پێوەم ئاوا ساغکەمەوە.

من بۆ خۆم شاعیرم و هیچ خۆم لە شاعیران بە کەم نازانم و نامەوێ بەوانەوە خۆم هەڵواسم بۆ چەپڵەو بارەقەڵڵا و دینار و دولاریش ئەم ئیشانە ناکەم، تەنیا خۆشەویستی گەل و نیشتمانەکەم پاڵی پێوە ناوم تا ئەدەبی پڕ لە شانازی کلاسیك و پڕ لە گەوهەری نایابی ـکە بە ڕاستی بۆ پشکنین دەبێ و غەدریشی لێ کراوە ـ بە وەچەی دوای خۆمان بناسێنم.

ئەدەبی کوردی لە پاش زمانی عەرەبی و فارسی لە ڕۆژهەڵاتدا ئەدەبێکی غەنی و خۆشە بەڵام چون ئەم زمانە هەمیشە قاچاخ بووە و بە شێوەی ئاکادیمی و زانیاری و زانستی نەخوێندراوە، هەر کەس بە زەوقی خۆی و بە ڕەبەی خۆی پێواویە، هەندێ کەم و کووڕی تێدایە کە هیوادارم بەرەی دوای ئێمە هەستی پێ بکەن و خالیس و ناخالیسەکان لێك جیاکەنەوە و ئەو دەم دەزانرێ ئەو بڕە کەمەی کە هەمانبووە لە بەرانبەر فارس و عەرەبدا لە بارەی چۆنایەتیەوە کەمی ناهێنێ.

دیسانیش بە پێویستی دەزانم سپاس و ئەمەکناسی خۆم پێشکەش مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی بکەم کە هەوڵ و تێکۆشان و کۆکردنەوەی نوسخە جۆراو جۆرەکانی وەفایی و دیوانە گەورەکەی چاپی ئەو بووە ڕێنوێنی و چرای بەر چاوم. خودا دڵسۆزی وا بۆ گەلی کورد هەر بە زیاد کا.

پێموایە ئیدی هیچم پێ نەماوە بیڵێم جگە لەوە مافی چاپکردنی ئەم دیوانەی وەفاییم دا بە بڵاوکردنەوەی کوردستان لە شاری سنە خوا یارمەتی ئەوانیش بدا بۆ

هەوڵ و تێکۆشانیان لە پێناوی کەلەپووری دەوڵەمەندی کلاسیکی کورد و میراتی شاعیرانی نەماومان.

لە بیرم نەچێ پڕ بە دڵ سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی لاوی خوێنگەرم کاك فوئادی مەحموودی دەکەم کە زۆرجار هەڵەو پەڵەیان بۆ هەڵگرتوومەوە و برای دڵسۆزم کاك موهەندیس موستەفا قزڵباش کە ڕێگەی سنەی بۆ چاپی ئەم بەرهەمە بۆ هەموار کردم.

سەرکەوتنی هەموو لایەکتان ئاواتمە.

موحەممەد سەعیدی نەجاڕی (ئاسۆ)

بۆکان. ١٣٨٧ی هەتاوی.

# مقدمه

کسی که با تو نشیند عجب که جز تو گـزیند
چنین که شهد و شکر خیزد از زبان و کلامت

هنگامی که در تبریز دوره‌ی کـارشناسی ارشـد را مـی‌گذرانـدم بـرای پـایان‌نامه بسـیار موضوعات را زیر و زبر کردم و بسیار موضوعات به من پیشنهاد شد؛ اما سرانجام دلم روی «کردان پارسی‌گوی» نشست. و شعرِ فارسیِ هفت تن از شاعران طراز اول کُرد را نوشته و نمره‌ی عالی پایان نامه تمام شد.
همیشه در این فکر بودم که چرا شاعرانی چون «نالی»، «وفایی»، «محوی» و «ملا مارف» را ننوشتم. هنگامی که اسم وفایی به ذهنم خطور می‌کرد می‌گفتم شعر فارسی کم دارد بهتر که ننوشتم.
دیوان وفایی‌ای که در اختیار داشتم چاپ انتشارات "صلاح‌الدین ایوبی" بود که در زمان زنده یاد «هێمن» چاپ شده بود، آن‌هم افستی از نسخه‌ی چاپ شده‌ی محقّق و تلاشگر کُرد «محمد علی قره‌داغی» ـ خدا حفظش کند ـ بود؛ اما با تغییر و دخل و تصرف فراوان از طرف استاد «هێمن» که نمی‌دانم به چه علتی تمام اشعار فارسی وفایی را حذف کـرده و حـتی مسمط کردی مشهوری هم که از وفایی بر سر زبان همه‌ی کردهای جهان است، در آن چاپ، نیاورده بود؛ شاید علتش را هم بدانم اما نمی‌خواهم صراحتاً ابراز کنم و با این خاطره بسنده می‌کنم:

سال ۱۳۶۳ شمسی در دوران معلمی‌ام گاه گاهی در میان اشعار کردی شعر فارسی هم می‌سرودم، در شب شعری که در شهر بوکان برگزار شده بود، نخستین بار به خدمت استاد هێمن رسیدم که آرزوی بسیار دیرینه‌ام بود، در آن‌جا بسیاری از شاعران بزرگ آذربایجان و کردستان حضور داشتند بنده یک غزل فارسی ـ مذهبی هم بود ـ پس از یک غزل ملی کردی خواندم، استاد هێمن با لحنی سرزنشانه به من گفت: «چرا شعر فارسی می‌نویسی؟! آن‌ها سعدی و حافظ و... دارند احتیاجی به تو ندارند، برای ملت خود بنویس که به تو و امثال تو محتاجند».

این کلام صریح استاد مرا منقلب کرد، احساس کردم که دوباره ساخته و کسی دیگر شدم، هرچه هستم و خواهم بود ماحصل آن حرف و آن شب است؛ اما حالا دیگر از پنجاه سال هم گذشته‌ام تقریباً هم سن زمانی که خود استاد هێمن نخستین کتابش را در بغداد چاپ کرد. با حفظ آن نظر محترم، عقیده‌ام عوض شده است؛ چون هر گلی بویی دارد و هرکسی به تعداد زبان‌هایی که می‌داند شخصیت و دنیا دارد. شاعران کرد و ترک پارسی‌گوی و باید گفت هند یا پاکستانی پارسی‌گوی در میان فارس‌ها از حرمت شاعران درجه دو خودشان جایگاهشان پایین‌تر است و این بدان دلیل نیست که تمام اشعار این عزیزان به باد فراموشی سپرده شود. من این اشعار را که کردها سروده‌اند ثروت و سرمایه‌ی فارس به حساب نمی‌آورم بلکه برعکسِ نظرِ استادم، افتخار می‌کنم که شاعران کرد در زبان غیر مادریشان تا این حد توانمند و استاد هستند.

وفایی در عهد ناصرالدین شاه زیسته است که دوره‌ی بازگشت بوده است، اشعارش کمتر از ترکان پارسی نیست، پس چرا باید اشعار فارسیش به باد فراموشی سپرده شود.

خواست درونی من این بود که دیوان وفایی در دو جلد جداگانه، یعنی اشعار کردی و اشعار فارسی جدا به چاپ برسد، و این نقطه نظر هم وقتی شدت گرفت که در حال تصحیح و شرح دیوان وفایی از روی نسخه‌ی استاد سترگ و عالی جناب محمد علی قره‌داغی بودم. تمام اشعار وفایی را یافتم، دیدم استاد هێمن چه ستم بزرگی در حق وفایی نموده است!. از طرفی هم استاد قره‌داغی به علت عدم آشنایی به زبان فارسی، نتوانسته است حق مطلب را ادا کند، همان‌گونه که ما عربی را به اندازه‌ی کردهای عراق نمی‌دانیم، به همین خاطر اشتباهات

چاپی، ناخوانایی، درست نفهمی و... زیادی در آن وجود دارد و من در حد توان شروع به اصلاح و بازسازی این دیوان نمودم و شاید بتوانم بگویم که این دیوان نود در صدش تصحیح شده است، همچنین معنی واژه‌ها و شرح ابیات را هم به آن اضافه کردم.

در فکر بودم که چه نامی برازنده‌ی این قسمت از اشعار وفایی است، که دیدم در آخرین قطعه شعری که استاد قره‌داغی آورده است نوشته شده: «هذا کتاب "شهد و شکر"» وفایی رحمه‌الله در سفر حجاز نزدیک روضه‌ی منوّره ـ زادها اللّٰه شرفاً ـ به تاریخ ۱۳۰۷ هجری قمری سروده است، پس برایم معلوم شد که وفایی خود اشعار فارسیش را «شهد و شکر» نام نهاده است.

وفایی پس از سفر حجاز هیچ‌گاه به کردستان بازنگشته و او هم جزو گمشده‌های بقیع است. روحش شاد و آمرزیده باد در کنار مقدسان آن مبارک تربت.

به هر حال بر خواسته‌ی درونی خود مبنی بر جدا کردن اشعار وفایی مُصِرّ بودم تا این‌که تکلّف و پافشاری دوستان نظرم را عوض کرد و هردو بخش (اشعار کردی و فارسی) را جهت چاپی عالی و در شأن این شاعر بزرگ کُرد، به انتشارات کردستان محوّل نمودم تا ان‌شاءاللّٰه چنین باشد.

حال کتاب شهد و شکر را تقدیم می‌کنم به تمام کسانی که بی‌تعصب از اشعار فارسی و کردی و ترکی و... هر زبانی که بلد باشند لذّت می‌برند و تکرار می‌کنم این کتاب را به عنوان هدیه‌ای از شاعری گران‌سنگ به همه‌ی هم‌میهنان پارسی زبان و پارسی دان ایرانی و غیر ایرانی تقدیم می‌کنم، نه به این خاطر که ادب پارسی محتاج این اشعار است، افتخار بر وفایی و ملت رشید و دانشمندِ وی که در سخت‌ترین شرایط با چنین طبعی حدیث نفس خود را به زبان پارسی سروده‌اند.

**محمد سعید نجاری (ئاسۆ)**

**بوکان، ۱۳۸۸**

[۱][۱]

ای صفابخش جان نسیم صبا | حرکات تو جمله روح‌افزا[۲]
بگذری چون به شهر بی‌خبران | به وفایی رسان سلام مرا[۳]
کای تبه‌کار دامن آلوده | کای سیه نامه‌ی هزار خطا[٤]
چند با زلف و روی مغبچگان | چند مخمور و مست صبح و مسا[٥]
چند از کار خویش غافل و مست | با خدا باش یك‌زمان به‌خود آ[٦]
شد جوانی، گذشت وقتِ طرب | پیر گشتی به کنج میکده‌ها[۷]
خرقه‌ی زهد و سبحه‌ی تقویٰ | دام مکرند از پیِ دنیا[۸]
حقّه‌بازی به‌کار ما ناید | خرقه بازی است پیشه‌ی زُهدا[۹]

---

**[۱]**

(۱) وزن شعر: فاعلاتن مفاعلن فعلن. ردیف ندارد. واژه‌ی قافیه: صبا افزا، مرا و... حرف اصلی "ا" الحاقی ندارد.

(۲) صبا: باد ملایمی است که از شمال شرق می‌وزد. تو: مرجع ضمیرش باد صباست. روح افزا: آن‌چه به روح و روان شادی می‌بخشد.

(۳) شهر بی‌خبران: ناکجاآباد. وفایی: خود شاعر.

یعنی: شاعر انسانی بی‌خبر است او را آگاهی ده.

(٤) سیه نامه، تبه‌کار، دامن آلوده، هزار خطا: همه صفت و به معنی گناه‌کار است و منادی وفایی است.

(٥) مغ‌بچه: زیبا رو، بچه‌ی آتش پرست، مراد سالك مجذوب است. مخمور: مست. مسا: تنگ غروب.

یعنی: تاکی در فکر عیاشی و خوشگذرانی هستی؟.

(٦) به خودآ: به هوش آی. یعنی: تاکی غافلی کمی به خدا فکر کن.

(۷) شد: رفت. میکده: میخانه. یعنی: جوانی‌ات در گوشه‌ی میخانه‌ها سپری شد.

(۸) خرقه: لباس درویشان. سبحه: تسبیح. یعنی: آبزار سالك مانند دامی هستند که برای مکر و دنیاطلبی هستند.

(۹) خرقه‌بازی: به ظاهر سالك بودن. زهدا: جمع زاهد: عابدان ریایی.

زاهدان حقه‌باز و مکارند و این کار به درد ما نمی‌خورد.

نـتوان شـد بـه خـرقه، "خـرقانی" پـاك آیـینه شـو ز زنگ هـوا(۱۰)
کفر محض است در طریقت عشـق بـر بـیاض خـیال حـرف ایـا(۱۱)
بـا دل دردنـاك و دیـدهی تـر بـا لب خشك و رنگ زرد درآ(۱۲)
چشم خود را بکن تو چشمهی خون رستخیزی بههم رسـان ز دعـا(۱۳)
یارب یارب به سوزِ سینهی پـاك یارب یارب به صدق اهل صفا(۱٤)
یـارب یـارب بـه آهِ شبخـیزان یارب یارب به گریهی صـلحا(۱۵)
بـه مـه و بـرج و قـابقوسینت بـه شـهنشاهِ افسـر لولا(۱٦)
«قـلمِ عـفو بـر گـناهم کش» عاصیم زرد روی و روی سـیا(۱۷)
یـارب یـارب سگـم خـطاکـار زار، شرمندهام، به جـرم، خـطا(۱۸)

---

(۱۰) با خرقه پوشیدن نمیتوان به ابوالحسن خرقانی و امثال او رسید، پس مثل آیینه بیرنگ باش و خودرا از چرک تمایلات نفسانی دور بدار.

(۱۱) بیاض: صفحهی سفید کاغذ، پاکنویس. ایا: حرف ندا برای دور.

یعنی: در راه عشق گفتن ایا کافری است، زیرا خدا در خیال مؤمنان حاضر است باید گفت «ای» که برای ندای نزدیک است.

(۱۲) در آ: وارد شو. یعنی: به محضر خدا با دیدهی نمناك و دل پاک وارد شو.

(۱۳) رستخیز: قیامت: یعنی: دلت را منبع خون کن و با دعاکردن قیامتی برپاکن.

(۱٤) یعنی: خدایا به صافی درون انسانهای پاك قَسَمت میدهم.

(۱۵) یعنی: به آه شب بیداران و گریهی انسانهای صالح قَسَمت میدهم.

(۱٦) مه و برج و قاب قوسین و شهنشاه افسر لولا: همه منظور حضرت محمد است. تلمیح است به حدیث «لولاك لما خلقت الأفلاك» و آیهی «فکان قاب قوسین أو أدنی» در واقعهی اسراء و معراج.

(۱۷) عاصی: گناهکار. زرد رو: شرمنده. قلم کشیدن: محو کردن، یعنی گناهانم را ببخش.

مصراع اول از شیخ اجل (سعدی) است که در گلستان چنین آمده است:

**بـر درِ کـعبه سـائلی دیـدم که همیگفت و میگریست خوش:**
**مـن نگـویم کـه طاعتم بـپذیر قـلم عـفو بـر گـناهم کش**

(۱۸) یعنی: خداوندا من سگ خطاکارم و پر جرم و تقصیرم.

یـــارب یـــارب افـــتاده از راهـــم دســـتگیرم ز لطـــف و راه‌نـما[۱۹]
یکـدل از هـم گسـل عـلایق روح یکسر از دل فکن غـم دو سـرا[۲۰]
در خـــربات شـــو بـــه آب مـغان لوح دل پـــاك کـــن ز مـــاسوا[۲۱]
دست در گـــردن صـــراحـــی زن روی بر خـاك پـای جـام بسـا[۲۲]
جـــرعه‌ای بـــر دل (وفـایی) ریـز گـــره از کـار بسـته‌اش بگشـا[۲۳]
بـــاز شـــهباز بـاش سـدره نشـین بگسل این رشـته و عـلایق را[۲٤]
جـــنبشی آر تـــا ریـــاض بـهشت باز شو نکته سنج و نـغمه سـرا[۲۵]
عشق جو عشق بـاز عشـق طـلب عشـق ورزنـد عـاشقان خـدا[۲٦]

---

(۱۹) دستگیرم: فعل امر یعنی دستم بگیر. راه نما: فعل امر: یعنی راه را به من نشان بده.
(۲۰) گُسَلْ: پاره کن. دو سرا: جهان و آخرت. یعنی: علایق روح را پاره کن و غم دو جهان را فراموشم نما.
(۲۱) شو: بشور، پاک کن. مغان: آتش پرستان. ماسوا: آن‌چه غیر از خداست، کائنات. لوح دل: اضافه‌ی تشبیهی است، دل به تخته تشبیه شده.
یعنی: خدایا دلم را با آب معرفتت پاک کن، و از علایق مادیم بگسلان.
(۲۲) گردن صراحی: اضافه‌ی استعاری است یعنی شیشه‌ی شراب. بسا: فعل امـر است از ساییدن.
یعنی: در بزم باده‌خواری و جرعه‌نوشی عارفان جایم بده و همنشینی با آن‌ها را نصیبم کن.
(۲۳) جرعه: کمی نوشیدنی. گره گشودن: حل کردن مشکل. یعنی: جرعه‌ای به وفایی ده و مشکلش را حل کن.
(۲٤) باز شهباز: پرنده‌ی تیز پر. سدره نشین: آسمان نشین.
یعنی: این دلبستگی‌های زمینی را رها کن و فرشته‌ی آسمانی باش!.
(۲۵) ریاض: باغچه‌ی بهشت. یعنی: حرکتی از خود نشان بده، و از عالم ناسوت فاصله بگیر و مانند مَلَك وارد بهشت شو تا باز دوباره نکته سنج و خوش کلام شوی.
(۲٦) یعنی: عشق را بخواه زیرا طالبان خدا عاشق هستند.
در پایان این قصیده دو بیت دیگر آمده که شاید خواسته باشد به ترجیع بندش تبدیل کند، اما نتوانسته یا ناقص مانده، معلوم است در این شعر وفایی به ترجیع بند هاتف اصفهانی بی‌توجه

[۲] [1]

بـــتم بـــر طـلعت خـود شـانه زد زلف چـلیپا را
پـــریشان بـر صـباح عـید دارد شـام یـلدا را [2]
هـــلاکـــم کـــرده بـی‌پروا فـرنگی‌زاده تـرسایی
که گر دستش رسد یکباره خون ریزد مسیحا را [3]
من از رخسار و گیسوی تـو حـیرانـم نـمی‌دانـم
که دخلش چیست این کافر یدِ بیضای موسی را [4]

---

☞

نبوده است. آن دو بیت را این‌جا می‌آوریم:

**ســاقی ای مـظهر تـجلی و نـور** — **ای همه جلوه‌ی تو عیش و سرور**
**مســـتم و رنـــد و دامـــن آلوده** — **شست‌وشویم بکن به آب طهور**

[۲]

(۱) وزن شعر: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن، بحر هزج مثمن محذوف. ردیف: را. واژه‌ی قافیه: چلیپا، صبا و... .

(۲) چلیپا: صلیب. شام یلدا: طولانی‌ترین شب سال، استعاره از زلف است. صباح عید: صبح عید، استعاره از رخسار یار است.

یعنی: یار وقتی زلف را شانه کرد زلف دراز و سیاهش را روی رخسار مانند صبح عید روشنش انداخت.

(۳) هلاک: کشتن. فرنگی‌زاده: بی‌دین، بی‌وفا. ترسا: مسیحی.

یعنی: بدون هیچ ترس و پروا آن ترسای بی‌دین و وفا مرا کشت، او به حدی خونریز است اگر بخواهد خون عیسی پیامبر خودش را هم می‌ریزد.

(٤) دخلش چیست: چه ربطی دارد، چه نسبتی دارد. کافر سیاهی، استعاره از زلف یار است. ید بیضا: دست سفید، استعاره از رخسار یار و تلمیح به معجزه‌ی موسی است.

یعنی: من از باهم بودن زلف و رخسارت در کنار یکدیگر در عجبم و نمی‌دانم سیاهی با سفیدی چه نسبتی دارند.

اگـــر مـــحراب ابـــروی تـو را از گـریه مـی‌بیند
به فرق خـویشتن ویـران کـند راهب کـلیسا را[۵]

خـــیال قـــد جـــانان در دل سـوزان و حـیرانـم
که ترسم آتش دوزخ بسـوزد نـخل طـوبی را[٦]

بـــهار آمـــد بـــیا سـاقی بـه‌رغم چـرخ مـینایی
وبـــال گـــردن زاهـــد بـــریزان خـون مـینا را[۷]

به يك خنده دل و دین (وفـایی) بـرده، حـیرانـم
مگـــر بـــرق یـمان زد خـرمن جـان تـمنا را[۸]

(۵) یعنی: هرکس محراب ابروی تو را در حال گریه ببیند، راهب هم باشد کلیسا را روی سر خود خراب می‌کند.
بین محراب و کلیسا تضاد هست و ابرو به محراب تشبیه شده است.
(٦) نخل طوبی: درخت بهشتی. یعنی: می‌ترسم خیال آتشین عشق روز قیامت درخت طوبای بهشت را بسوزاند. اغراق در این بیت دیده می‌شود. تشبیه قد یار به طوبی و دل خودش به دوزخ.
(۷) به‌رغم: برخلاف میل. چرخ مینایی: آسمان. وبال: گناه. خون مینا: شراب. مینا: ساغر می.
یعنی: ساقی بهار آمد بیا بر خلاف میل چرخ دوران، پیاله‌ی شراب را به گناه گردن عابدان دروغین پر کنیم.
(۸) یعنی: تعجب می‌کنم یار با یک خنده دل و دین ما را برده است، انگار برق یمنی خرمن خواسته‌های مرا آتش زد است.
یمان: به نوعی شمشیر نیز گفته می‌شود. در این بیت تجاهل العارف وجود دارد.

[۳][۱]

ای تُرك خطا، ماهِ خُتن، سرو خودآرا | بر سوختهی خویش ببخشای خدارا[۲]
ما تشنه لبانیم تو هم آب بقایی | بر تشنه یکی جرعه ببخش آب بقا را[۳]
در هر شکن افتاده هزاران چو دل ما | مشکن دل ما، شانه مزن زلف دوتا را[٤]
آرایش روی تو صلا زد به قیامت | یارا دگر این روی دلارای میارا[٥]
گویند (وفایی) ز فلانی تو بکش دست | با پادشهان کی سر و کار است گدا را[٦]
در مکتب ما حرف جفا خوانده نمیشد | چشم تو اگر درس به من داد وفا را[۷]
از ناکسیِ من، همه ملت گله دارند | در صومعه و دیر مسلمان و نصارا[۸]

---

[۳]

(۱) وزن شعر: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن، بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف. ردیف: را. واژهی قافیه: خودآرا، خدارا، و... .

(۲) خودآرا: آرایش دهندهی خود. ترك: زیبا رو. خطا: سرزمین چین. یعنی: ای یار زیبای ختایی! بر عاشقان سوخته دل خود به خاطر خدا رحم کن. میان خودآرا و خدارا جناس تام وجود دارد.

(۳) آب بقا: آب حیوان، آب زندگانی. جرعه: کمی آب.
یعنی: ما عاشقان تو تشنه لب هستیم لب تو مثل آب بقاست، بیا محض رضای خدا از آب لبت کمی به عاشقان تشنهات بچشان. حسن تعلیل در این بیت هست.

(٤) شکن: چین گیسو. یعنی: در هر چین گیسویت هزاران دل عاشق زندانی است، به خاطر خدا زلف را شانه مزن تا دلها آواره نشوند. در «شکن» و «مشکن» جناس تام و افزایشی وجود دارد.

(٥) صلا زدن: فریاد زدن، جاردادن. یعنی: وقتی که تو روی خود را آرایش میکنی انگار جار میزنند که قیامت برپا شده، ای یار این روی زیبا و دلگیر را آرایش مکن، تا قیامت برپا نشود.

(٦) دست کشیدن: دست برداشتن. یعنی: چنین میگویند وفایی از یارت دست بردار او شاه است و تو گدا، پادشاه و گدا هیچوقت باهم آمیزشی ندارند.

(۷) یعنی: اگر چشم تو وفادار میبود و به من درس وفا میداد، دیگر در مذهب و مدرسهی ما واژهی جفا دیده نمیشد.

(۸) ناکسی: بدبختی. به بیگانه تعبیر میشود. نصارا: مسیحی. یعنی: تمام مردم اعم از مسیحی و یهود و مسلمان از بدبختی من گله دارند.

لطفی کن و بر حال (وفایی) نظری کـن ای خواجه‌ی احرارِ من ای شاه بخارا(۹)

[۴](۱)

تـــاریك مکـــن روز مـــرا بـــاز، نگـــارا بر چهره مـزن شـانه دگـر زلف دوتـا را(۲)

دیوانـه شـدم در غـم بـالای تـو از جـان هرچند به جـان دوست نـدارنـد بـلا را(۳)

داد از ســـتم چشـم تـو، ای پـادشه نـاز! ز اندازه به‌در می‌برد ایـن تـرك جـفا را(٤)

بزمی خوش و می بی‌غش و دلدار کریم است ساقی تو بزن ساغر و مطرب تو سه‌تا را(۵)

نـــومید ز عـــفو و کـرم حـق نشـود کس جایی که فرو شُست سیه نـامه‌ی مـا را(٦)

---

(۹) خواجه‌ی احرار: شاه عبید اللّٰه سمرقند، اشاره به پیر و مرشد خود شیخ عبید اللّٰه شمزینی هم دارد. شاه بخارا: شیخ بهاءالدین نقشبند.

یعنی: ای شیخ من که هم‌چون خواجه‌ی احرار و شاه بخارا هستی لطفی کن و برحال وفایی نظری بیفکن.

[۴]

(۱) وزن شعر: مفعولُ مفاعیل مفاعیل فعولن، بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف.

(۲) یعنی: ای یار من با شانه زدن به زلف دوتایت روز مرا تاریک مکن، چون وقتی به زلفت شانه می‌زنی زلف سیاهت جلو نور خورشید رخسارت را می‌گیرد و روز من تاریک می‌شود.

(۳) بالا: قد و قیافه. یعنی: از غم قد و بالای تو دیوانه شدم، هرچند مردم بلارا دوست ندارند، اما من بلارا بخاطر تشابه به بالای تو دوست دارم. یا بالای تو بلای جان‌هاست.

(٤) ترک: زیبا رو، استعاره از چشم یار است. یعنی: فریاد از دست چشمان تو که پادشاه ناز هستی و چشمت از اندازه بیرون ستم می‌کند.

(۵) می بی‌غش: شراب صافی. دلدار: یار. سه‌تا: نوعی آلت موسیقی.

یعنی: در مجلسی که می صافی و یار مهربان وجود دارد، ساقی تو ساغر بنوش و مطرب تو نیز سه‌تا را بنواز.

(٦) سیه نامه: نامه‌ی اعمال گناه آلود. یعنی: هیچ‌گاه نباید از رحمت خدا ناامید شد، دور نیست که نامه‌ی عمل سیاه مرا نیز پاک کند.

